ناوی کتێب: ٧٠ وێستگەی مێژوویی
نووسین و ئامادەکردنی: تەیموور مستەفایی
پێداچوونەوەی: سەلام ئیسماعیلپوور
گرافیک و دیزاین: هۆزان
وێنەی بەرگ: سەلاح نادری
نۆرەی چاپ: یەکەم ٢٠١٥
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
چاپخانە:
نرخ: دینار

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی (٥٠٠)ی
ساڵی ٢٠١٥ی دراوەتێ

پێشەکشە بە هەموو رێبوارانی رێگای
ئازادی و دیموکراسی

# پێڕست

# پێشەکی نووسەر

٢٥ی گەلاوێژی ئەمسال (١٣٩٤ی هەتاوی) حەفتا ساڵ لە دامەزراندنی حیزبی دێموکرات تێدەپەڕێ. تێکۆشانی ئەم حیزبە هەوراز و نشێوی زۆری لــە دامەزرانی کۆماری کوردســتان تــا رووخانی کۆمار و لە دەســتپێکردنەوەی تێکۆشــانی نهێنی تا راپەڕینــی چەکدارانەی ٤٧ ـ ٤٦ و رووخانی رێژیمی پاشــایەتی و رزگاربوونی بەشــێکی زۆر لە کوردســتان و بەرگریــی قارەمانانەی هێزی پێشــمەرگە لە بەرانبەر فەرمانــی جیهادی خومەینی دژی گەلی کورد، تیرۆرکردنی رێبەرانی و دەیــان تێکۆشــەری دیکەی ئەم حیزبە و شــەهید بوونی هەزاران رۆڵەی بەوەج لە ریزی پێشــمەرگایەتیدا لە کاتــی بەرەنگاربوونەوە لەگــەڵ هێــزی داگیرکەر و زیندانیکردنی بە هــەزاران رۆڵەی بەوەج و ئەشــکەنجە و ئــازار یــان کوشــتوبڕ و قەڵاچــۆی دەیــان گوندی

کوردســـتان و .. تێپەڕاندووە، بەڵام نە ســـەرکەوتنەکان لە خۆ بایبان کردووە و نە تێکشکانەکان نائومێدیان کردووە.

قۆناغــی یەکەمــی خەباتــی ئــەم حیزبە بــە دامەزرانــی کۆماری کوردســـتان و رووخانــی کۆمــار و ئیعدامی قازییەکان دەســـت پێ دەکا کــە کاریگەرییەکانــی ئەو قۆناغــە و بیرەوەرییەکانی لە هەموو بەشــەکانی کوردســـتاندا شــوێندانەریی هەبــووە و هەیــە. قۆناغی دووهەمی خەباتی حیزب لە ســاڵی ١٣٢٦ی هەتاوی دەست پێ دەکا کە لەم قۆناغەدا تا ســاڵی ١٣٤٦ واتە بۆ ماوەی ٢٠ ســاڵ ئەگەرچی تێکۆشان بەردەوام بووە، بەڵام رەنگدانەوەی کەمتر لە قۆناغی یەکەم بووە و تەنانەت لە چەند ساڵێکیشدا ئەم حیزبە لە رێبازی دروست و ئوســوولیی خۆی دوور دەکەوێتەوە کە دیارە خەباتی ساڵەکانی ٤٧ ـ ٤٦ لاپەرەیەکــی زێڕین لە ئازایەتی و بەگژداچوونەوەی داگیرکەرە. قۆناغی ســێهەمی خەباتی ئەم حیزبە لە ســاڵی ١٣٤٩ی هەتاوییەوە دەست پێ دەکا کە لەم قۆناغەدا دوکتور قاسملوو بناغەیەکی پتەو و بەڕۆژ بۆ سیاســـەتی ئەم حیزبە دادەنێ کە دەتوانم بڵێم ئەم چەشنە لە دیاریکردنی سیاســـەت، حیزبی دێموکــرات دەباتە قۆناغێکی نوێ کە ئەم سیاســـەتە لە داهاتووی تێکۆشــانی حیزبــدا رەنگ دەداتەوە و توانایـــی زیاتــر بە بەهێزبوون و بەرەوپێشـــچوون و دێموکراتیزە کردنی ئەم حیزبە دەدات.

لە چوارچێوەی ئە م سیاسەتەدا:

حیزب بۆ بەرەوپێشـــبردنی سیاســـەتەکانی هیچکات لە کەرەستەی نـــاڕەوا کەڵکی وەرنەگرتـــووە. هەرچەند رێژیمی کۆماری ئیســـلامی هەوڵــی داوە حیزب بکێشـــێتە ئــەم رێگایە، رێژیم لە کوردســـتان بە شـــێوەیەکی دڕندانە بە تۆپ و هێلیکوپتەر و فڕۆکە دەســـتی داوەتە بۆردمـــان، تۆپبـــاران و تەنانەت بۆردمانی شـــیمیایی و کوشـــتوبڕی خەڵکی بێ دیفاع، ئیعدامی زیندانیانی سیاســـی و ئەشکەنجەی خەڵک

کە زۆربەیان کاری سیاسییان نەکردووە. ڕێژیم ئەوپەڕی جینایەتی لەم وڵاتەدا خولقاندووە، بەڵام حیزبی دێموکرات هیچ کات لە بازنەی عەقڵ نەچووەتە دەرەوە و لە پێوەرە ئینسانییەکان دەرنەچووە و هیچ کات نەکەوتووەتە فیکری ئەوەی کە کردەوە دژە مرۆییەکانی کۆماری ئیسلامی بە کردەوەی هاوچەشن وەڵام بداتەوە. هەمیشە پەلاماری دوژمنی راستەقینەی خۆی یانی هێزەکانی کۆماری ئیسلامیی داوە و لە نێوان خەڵکی بێدیفاع و ناوەندە نیزامییەکان و هێزە سەرکوتکەرەکان جیاوازیی داناوە. لادان لەم ئوسوولەی بە لادان لە ڕێبازی ئەسڵیی حیزب داناوە و هەر کەس لەم بارەوە خەتایەکی کردبێ، چاوپۆشیی لێ نەکراوە و سزا دراوە کە دیارە لەم سیاسەتەیدا قەت زەرەری نەکردووە و هێزەکانی ڕێژیم کاتێک کە زانیویانە ئەگەر دیلی هێزی پێشمەرگە بن ناکوژرێن و ئازاد دەکرێن، لە کاتی شەڕەکاندا کە گوشاریان کەوتووەتە سەر، لوولەی تفەنگەکانیان کردووەتە خوارەوە و تەسلیم بوون، ئەم کردەوەیە بووەتە هۆی ئەوەی کە خەباتی ئێمە لە دنیادا بە خەباتێکی ڕەوا و ئینسانی بناسرێت، خەباتی ئێمە پشتگیریی کۆڕ و کۆمەڵە بەشەردۆستەکان و وڵاتانی جیهانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە و تەواوی هەواڵنێر و فیلمهەڵگرەکان کە هاتوونەتە کوردستان ئەم ڕاستییەیان ڕاگەیاندوە و سەریان سووڕ ماوە لەوەی کە لە حاڵەتی شەڕدا حیزب چۆن توانیویەتی ئەم ئوسوولە ئینسانییە ڕەچاو بکا.

لایەنێکی دیکەی سیاسەتی ئەم حیزبە ئەوە بووە کە عامیلی ئەسڵیی شۆڕشی بە هێزی گەل زانیوە و پشتئەستوور بە هێزی میلیونیی گەلەکەی خەباتەکەی بردووەتە پێش و پشتیوانی دەرەکیی وەک عامیلی یارمەتیدەر زانیوە و کەس نەیتوانیوە دار و لەلەی بۆ بتاشێ و ڕێبازی بۆ دیاری بکا و ڕێبازی ئەم حیزبە لە چوارچێوەی قازانج و بەرژەوەندییەکانی گەلی کورددا دیاری کراوە.

سیاسەتی ڕێبەریی بە کۆمەڵی وەک بناغەی ڕێبەریکردنی خەبات دیاری کردووە و دووریی کردووە لە تاکپەرەستی و بڕیاردانی تاکەکەسی کە ئەم سیاسەتە گەرەنتیی بەردەوامیی بووە لە خەبات.

لەگەڵ ئەوەی بڕوایەکی تەواوی بە مافی دیاریکردنی چارەنووس بۆ گەلەکەمان هەبووە و لە ماوەی تەمەنی خۆیدا هەوڵی بۆ داوە، هەر لەو کاتەشدا دیاریکردنی شێوەی خەبات و دیاریکردنی ئامانجی دواڕۆژی هەرکام لە بەشەکانی کوردستانی بە مافی ئەو ڕێکخراو و حیزبانە زانیوە کە لەو بەشەی کوردستاندا خەبات دەکەن و لەمەڕ پێوەندی کردن بە حکوومەتەکانی ئەو وڵاتانەوە کە کوردیان تێدا دەژی، بە مەرجێک ئەو پیوەندییەی بە ڕەوا زانیوە کە زیانی بۆ ئەو بەشەی کوردستان کە لە ژێر دەسەڵاتی ئەو وڵاتانەدایە نەگەیەنێت.

بۆ ئەوەی پێشەکییەکە زۆر درێژ نەکرێتەوە، زیاتر لەوە لە سەر چوارچێوەی سیاسەتەکانی حیزبی دێموکرات ناڕۆم کە بواری جۆراوجۆر دەگرێتەوە و دەکرێ بۆ خۆی لە توێی کتێبێکدا چاپ و بڵاو بکرێتەوە.

مەبەست لە نووسینی کتێبی « ٧٠ وێستگەی مێژوویی» خستنە ڕووی کۆمەڵێک ڕووداو و هەڵویستی ئەم حیزبەیە کە لە درێژەی ئەو خەباتەدا هاتوونەتە ئاراوە کە بێگومان بەشێک لەم ڕووداوانە تێکۆشەرانی دیکەی حیزب لە چوارچێوەی بیرەوەری و نووسینی جۆراوجۆردا باسیان لە سەر کردووە کە لەم ڕووداوانەشدا هاتوون، بەڵام کۆمەڵێک هەڵوێست و بڕیاریش لەم کتێبەدا دەکەوێتە بەر دەستی خوێنەر کە پێشتر باسیان لێ نەکراوە، یان بە کەم و کوڕی باسیان کراوە کە نووسەران یان زانیاریی تەواویان لە ڕووداوەکە نەبووە، یان بە گرینگیان نەزانیوە کە من لێرەدا باسم لێوە کردوون.

لەم کتێبەدا بەشێک لە ڕووداوەکان بە دووروودرێژی و بەشێک بە کورتی ئاماژەیان پێ کراوە کە دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆ:

- رادەی زانیاری و بەڵگەی لەدەستدابوو.
- هەڵگرتنی ئەو رادە باسە کە لە سەری کراوە.

لە نووسـینەکانی ئەم رووداوانەدا تا سـاڵی ١٣٦٨ی هەتاوی زۆر جار لە نووسراوە و وتارەکانی دوکتور قاسملوو کەڵکم وەرگرتووە، لە بەر ئەوەی بە سەرچاوەی باوەڕپێکراو و بە ناوەڕۆکترم زانیون. پـاش ئـەو ماوەیەش لە بەشـێکی زۆری ئەو رووداوانـەدا بۆ خۆم بەشـدار بووم و لەگەڵ ئەوەی کەڵکم لە رۆژنامەی «کوردستان» و نامیلکەکانی دیکەی حیزب وەرگرتووە بەڵام لێکدانەوە و بۆچوونەکانی خۆمم بە بنەما گرتووە کە لەوانەیە تێکۆشـەرانی دیکەی ئەم حیزبە یان لەگەڵی موافیق بن یا نەبن و تێبینی‌یان هەبێ کە بە مافی ئەوانی دەزانـم. هەرچی بێ لە نووسـین و لێکدانەوەکانـی ئەم کتێبەدا خۆم بەرپرسـیارم و یـەک و دوو بابەتێـک کـە لە کەسـانی شـارەزا لە رووداوەکـەم وەرگرتـوون لە خوارەوەی وتارەکەیانـدا ئاماژەم پێ کردووە.

لێرەدا بە پێویسـتی دەزانم سپاسی بێ پایانی ئەم هاوڕێیانە بکەم کە لە ئامادەکردنی ئەم بەرهەمەدا یارمەتیی زۆریان داوم:

- سـەلام ئیسـماعیل‌پوور کە ئەرکی پێداچوونەوەی کتێبەکەی وە ئەستۆ گرتووە و زۆر تێبینیی وردیشی پێ داوم.
- سـەلاح دەشتی، وەزیر یووسفی و سامان وەیسیانی کە بەشێکی بەرچـاوی ئەم نووسـینەیان بۆ تایـپ کـردووم و هەروەها جەبار درروودی کە ئەویش لە بەشێک لەو نووسینەدا هاوکاریی کردووم.

تەیموور مستەفایی

پووشپەڕی ١٣٩٤ی هەتاوی

# ٧٠ وێستگەی مێژوویی

■ ١: دامەزرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان (١٣٢٤)

ڕۆژی ٣ی خەرمانانی ١٣٢٠(٢٥ی ئوتی ١٩٤١ی زایینی) لەشکری سوور لە باکوورەوە و لەشکری ئەمریکا و ئینگلیس لە باشوورەوە ئێرانیان داگیر کرد، ڕێژیمی دیکتاتۆریی ڕەزاشا بێجگە لە بەیاننامەیەکی بێناوەڕۆک کە باسی لە بەهێزی و ورەی ئەرتەشی ئێران دەکرد، نەیتوانی هیچ دژکردەوەیەک لە خۆی نیشان بدات و دەرکەوت کە ئەم جۆرە ئەرتەشانە بێجگە لە سەرکوتی خەڵک نەبێ هیچ توانایەکیان بۆ بەرگری لە وڵات نییە و هەر بۆیە ڕێژیمی دیکتاتۆریی ڕەزاشا تێک ڕووخا. هێزەکانی ئەمریکا و ئینگلیس لە باشووری ئێران نیشتەجێ بوون و لەشکری سۆڤێتیش لە باکووری ئێران. بە تێکچوونی دیکتاتۆریی ڕەزاخان هێندێک ئازادی لە وڵات

پەیدا بوو و رێکخراوە سیاسییەکان بووژانەوە. لە نێوان ئەم دوو هێزەدا مەهاباد وەک ناوچەیەک بوو کە هیچکام لەو هێزانەی تێدا نیشتەجێ نەبوون، بۆیە وەزعێکی تایبەت لەم ناوچانەدا پێک هات سەرەتا خەڵک چەکدار بوون و بە هۆی ئازادییەک کە لەم ناوچەیەدا پێک هاتبوو، کۆمەڵەی ژ.کاف لە ڕۆژی ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢١(١٦ی ئۆتی١٩٤٢ز) لە مەهاباد دامەزرا. لە دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ.کاف تا دامەزراندنی حیزبی دێموکرات ٣ ساڵ مەودا بوو کە لەو سێ ساڵەدا کۆمەڵەی ژ کاف بە دەرکردنی گۆڤاری نیشتمان و دامەزراندنی رێکخراوێکی پتەو بەڵام بە بیروباوەڕی ناسیۆنالیستیی تۆخ بیری نەتەوەیی پەرە پێ دا. بەڵام کۆمەڵە بەو هۆیەوە کە رێکخراوێکی داخراو بوو و هەلومەرجی ئەو کاتیش پێویستی بە رێکخراوێکی کراوەتر و بەربڵاوتر هەبوو، وەڵامدەری ئەو بارودۆخە نەبوو. بۆیە بەڕێوەبەرایەتیی کۆمەڵە و لە سەرەوەی هەموویان پێشەوا قازی محەممەد بەو ئاکامە گەیشتن کە هەر لە سەر ئەساسی کۆمەڵەی ژ.کاف رێکخراوێکی دیکە دابمەزرێنن کە گونجاویی لەگەڵ هەلومەرجی تازە پێکهاتوو هەبێت. بە پێی ئەو زەروورەتە حیزبی دێموکراتی کوردستان لە رۆژی ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٢٤ی هەتاوی بەرانبەر بە (١٦ی ئووتی١٩٤٥) لە شاری مەهاباد دامەزرا و بەرنامەی خۆی راگەیاند.

دامەزراندنی حیزبی دێموکراتی کوردستان نوختە گۆڕانێک لە مێژووی خەباتی لەمێژینەی گەلی کورددا و سەرەتایەک بۆ پێکهاتنی حیزبێکی سیاسیی پێشکەوتوو و مۆدێڕن بوو کە بەرنامەیەکی روونی پێشکەش کردبوو. لەو کاتەدا حیزبی دێموکراتی کوردستان ٣ ئەرکی بنەڕەتیی لە پێش بوو:

١. رێکخستنی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان و کۆکردنەوەیان لە ژێر ئاڵای خۆی.

٢. گرێدانی خەباتی گەلی کورد لەگەڵ خەباتی سەرانسەریی ئێران بۆ دێموکراسی و دژی فاشیزم.
٣. راکێشانی پشتیوانیی هێزە پێشکەوتووەکان بۆ مافی ڕەوای گەلی کورد.

یەکەم بەرنامەی حیزبی دێموکرات لە ٨ خاڵدا پێشکەش کرا کە ناوەڕۆکی ئەو ٨ خاڵە بریتی بوو لە خەبات بۆ ڕزگاریی نەتەوەیی، بەدیهێنانی دێموکراسی و دابەزاندنی عەداڵەتی کۆمەڵایەتی کە خاڵەکان بریتی بوون لە:

١. نەتەوەی کورد لە نێوخۆی ئێران بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری مەحەلیی خۆی سەربەخۆ و ئازاد بێ و لە سنووری دەوڵەتی ئێراندا خودمۆختاریی خۆی بە دەست بێنێ.
٢. مافی خوێندن بە زمانی زگماکیی خۆی هەبێ و تەواوی کاروباری ئیدارەکان بە زمانی کوردی بە ڕێوە بچن.
٣. لە سەر بناغەی قانوونی ئەساسی، ئەنجومەنی ویلایەتیی کوردستان بە زوویی هەڵبژێردرێ، بە هەموو کاروباری کۆمەڵایەتی و دەوڵەتی ڕابگا و چاوەدێریی بە سەردا بکا.
٤. کاربەدەستانی دەوڵەت دەبێ بە بێ قسە لەگەل خەڵکی ناوچەکە بن.
٥. دەبێ لە سەر ئەساسی قانوونێکی گشتی لە نێوان لادێیی و خاوەن ملکدا ڕێککەوتنێک بێ کە دواڕۆژی هەر دوو لا دابین بکرێ.
٦. حیزبی دێموکراتی کوردستان تێدەکۆشێ کە لە خەباتدا بە تایبەتی لەگەڵ نەتەوەی ئازەربایجان و کەمایەتییەکانیتر وەک ئاسوورییەکان، ئەرمەنییەکان و هی دیکە یەکیەتی و برایەتیی تەواو پێک بهێنێ.
٧. حیزبی دێموکرات بە ئامانجی بەرەوپێشبردنی کشتوکاڵ و

بازرگانی و پەرەپێدانی لەشساغی و باشترکردنی ژیانی ئابووری و مەعنەویی گەلی کورد دەست دەکا بە سوود وەرگرتن لە سامانە سرووشتییەکانی کانگاکانی کوردستان و لەم ڕێگادا تێدەکۆشێ.
٨. ئێمە دەمانهەوێ تەواوی گەلانی ئێران هەلی تێکۆشان بە ئازادییان بدرێتێ بۆ بەختەوەری و پێشخستنی نیشتمانیی خۆیان.

## ■ ٢: ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان (١٣٢٤)

لە دامەزراندنی حیزبی دێموکرات تا ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان ١٦٠ ڕۆژی کێشا و لە سەرەتای خەرمانانی ١٣٢٤ پێشەوا قازی محەممەد بە سەرۆکایەتیی وەفدێک لە جێژنی پێکهاتنی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان بەشداریی کرد و پاش ئەم جێژنە بۆ باکۆ بانگهێشت کرا کە سەفەرەکەی بە هۆی ئەوەی کە سەرۆکی حیزبی دێموکرات بوو، سەفەرێکی بە تەواوی سیاسی بوو و لەم سەفەرەدا بەڵێنیی هێندێک هاوکاریی وەک پێدانی چەک و وەرگرتنی قوتابی بۆ پەروەردە و هاوکاریی ماڵیی پێ درابوو.

جموجۆڵی دیکەی وەک دامەزراندنی ڕێکخراوەکانی حیزب لە شارەکانی دەوروبەری مەهاباد و چەککردنی شارەبانیی مەهاباد وەک دوایین ئاسەواری ڕێژیم لەو شارە و هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە زۆربەی ناوچەکاندا هەلومەرجەکەی بەرەو ڕاگەیاندنی کۆماری کوردستان پاڵ پێوە نا، تا لە ئاکامدا لە ڕۆژی ٢ی ڕێبەندانی ١٣٢٤ی هەتاوی (٢٢ی ژانوویەی ١٩٤٦) لە مەیدانی چوارچرای مەهاباد، دامەزرانی کۆماری کوردستان لە کۆبوونەوەیەکی پان و بەریندا کە نوێنەرانی بەشێک لە ناوچەکانیتری کوردستانی تێدا بەشدار بوون، ڕاگەیەندرا و قازی محەممەد ڕێبەری حیزبی دێموکراتی کوردستان بوو بە سەرۆک کۆماری کوردستان لەو کۆبوونەوەیەدا قازی محەممەد بەرنامەی دوارۆژی کار و تێکۆشانی کۆماری

کوردســـتانی ڕاگەیاند کە لە بنەڕەتدا هەمــوو ئەو بەرنامەیە بوو کە حیزبی دێموکرات دایدانابوو.

کابینەی کۆمار بە سەرۆکایەتیی حاجی بابە شێخ لە ١٣ کەس پێک هاتبــوو کــە ڕۆژی ٢٢ی ڕێبەندان نــاوی وەزیرەکانی لە ڕۆژنامەی «کوردستان» بڵاو کرایەوە.

لەم مەراســـیمەدا کوردی هەموو پارچەکانی کوردســـتان بەشـــدار بوون و بارزانییەکان بە سەرۆکایەتیی مەلا مستەفا بارزانی نەقشێکی پڕڕەنگتریان لەو بەشـــدارییەدا هەبوو کە لە پاراســـتنی کۆماریشـــدا دەورێکی بەرچاویان گێڕا.

لە کۆماری کوردســـتاندا بۆ یەکەمجار ئاڵای کوردستان کە لە سێ ڕەنگی سوور و سپی و کەسک و ناوەڕاستەکەشی لە ئارمی حیزبی دێموکراتـــی کوردســـتان پێـــک هاتبـــوو، هەڵکرا و ســـروودی «ئەی ڕەقیب» بوو بە سروودی ڕەسمیی کۆمار.

■ کار و کردەوەکانی کۆماری کوردستان

کۆمـــاری کوردســـتان ١١مانگ ژیـــا و لە ماوەی ئـــەو ١١ مانگەدا گەلێک کردەوەی گرینگی جێبەجێ کردن کە ئاواتی لەمێژینەی خەڵکی کوردستان بوون.

زمانی کوردی بوو بە زمانی ڕەســـمی، ڕۆژنامە و گۆڤارێکی زۆر بـــە زمانی کـــوردی بڵاو کرانەوە کـــە لەوانە ڕۆژنامەی کوردســـتان زمانحاڵـــی حیزبـــی دێموکراتـــی کوردســـتان، هەڵاڵە کـــە گۆڤارێکی ئەدەبی بوو، گڕوگاڵی منداڵان، هاواری کورد، هاواری نیشـــتمان کە لە پێشخستنی زمانی کوردیدا دەورێکی بەرچاویان گێڕا.

شانۆی کوردی نەخشێکی زۆری گێڕا، چوونکە خەڵکی نەخوێندەوار کـــە تا ئەوکات زیاتر لـــە ٩٠٪ی خەڵک نەخوێندەوار بوون زۆر باش لە شانۆ حاڵی دەبوون.

دامەزراندنی یەکیەتییەکانی ژنان و لاوان کە بە تایبەتی ژنی کورد

بۆ یەکەمجار بە ڕەسمی و بە ئاشکرا هاتنە مەیدانی خەبات کە لە ڕۆژی ٢٤ی ڕەشەمەی ١٣٢٤ (١٤ی مارسی ١٩٤٦) یەکیەتیی ژنانی دێموکراتی کوردستان دامەزرا.

پێکهێنانی سوپای میللی کە بە هێزی پێشمەرگە ناو نرا، بەشێک لە بەرنامەی حیزب بوو کە بۆ پاراستنی کۆماری کوردستان نەخشی بەرچاو بگێڕێ و بەشداریی چالاکانەی ئەفسەرە کوردەکانی لەشکری عێراقیش دەوری تایبەتیی خۆی هەبوو.

بازرگانیی ڕاستەوخۆ لەگەڵ یەکیەتیی سۆڤییەت بۆ فرۆشتنی توتن و کڕینی زۆر کەرەستەی پێویست، گەشەیەکی تایبەتی بە بازرگانی دا.

دابینکردنی ئەمنییەت و ئاسایش: لە کاتێکدا کە بە هەزاران کەس چەکدار بوون، لە ماوەی ئەو ١١ مانگەدا یەک کەس کوژرا، دزی نەبوو، بەرتیل خواردنیش بە تاوانێکی گەورە دەژمێردرا.

دەسکەوتی هەرە گرینگی ئەم کۆمارە ئەوە بوو کە بۆ یەکەمجار گەلی کورد چارەنووسی خۆی بە دەستەوە گرت و تامی ئازادیی چێشت. نە زەبروزەنگی پۆلیسی بە سەرەوە مابوو نە لە کەس فەرمانی دەبرد، بەڵکوو ئەوە کورد خۆی بوو کە خۆی بە ڕێوە دەبرد و لە وڵاتی خۆیدا خاوەن دەسەڵات بوو.

### ■ ٣: پەیمانی دۆستایەتیی کوردستان و ئازەربایجان (١٣٢٥)

لە ڕۆژی ٣ی بانەمەڕی ١٣٢٥ی هەتاوی (٢٣ی ئاوریلی١٩٤٦) لە شاری تەورێز لە لایەن دوو هەیئەتی ڕەسمیی کۆماری کوردستان و حکوومەتی میللیی ئازەربایجان بە سەرۆکایەتیی پێشەوا قازی محەممەد و جەعفەر پیشەوەری پەیمانێکی دۆستایەتی و هاوکاری لە نێوانیاندا ئیمزا کرا کە دەقی پەیماننامەکە بەم جۆرەیە:

١. لەو جێگایانەی کە بە پێویست دەزانرێت، هەر دوو حکوومەت

نوێنەری ڕەسمیی خۆیان لە خاکی یەکتر دیاری دەکەن.

٢. لە ئازەربایجان لەو جێگایانە کە زۆربەی دانیشتوانی کوردن، کاروباری دەوڵەت بە دەستی کوردەکانەوە دەبێ، هەروەها لە کوردستان لەو جێگایانەی کە زۆربەی دانیشتوانی ئازەربایجانین، کاروباری دەوڵەت بە دەستی مەئموورانی حکوومەتی میللیی ئازەربایجانەوە دەبێ.

٣. هەر دوو حکوومەت کۆمیسیۆنی هاوبەش بۆ چارەسەر کردنی گیروگرفتە ئابوورییەکان پێک دێنن، بڕیارەکانی ئەم کۆمیسیۆنە بە چاوەدێریی سەرۆکی هەر دوو حکوومەت جێبەجێ دەبێ.

٤. لە کاتی پێویستدا لە نێوان حکوومەتی میللیی ئازەربایجان و کوردستاندا هاوکاریی نیزامی ساز دەبێ و هەرچی پێویست بێ، یارمەتیی یەکتر دەدەن.

٥. ئەگەر پێویست بێ، لەگەڵ حکوومەتی تاران وتووێژ بکرێ، دەبێ بە پەسەندی هەر دوو حکوومەتی میللیی ئازەربایجان و کوردستان بێت.

٦. حکوومەتی میللیی ئازەربایجان بۆ پێشخستنی زمان و فەرهەنگی نەتەوەیی ئەو کوردانە کە لە خاکی ئازەربایجاندا دەژین و کۆماری کوردستانیش بۆ پێشخستنی زمان و فەرهەنگی نەتەوەیی ئەو ئازەربایجانییانەی کە لە خاکی کوردستاندا دەژین، بە پێی توانا هەوڵ دەدەن.

٧. هەر کەسێک کە بۆ تێکدانی دۆستایەتیی مێژوویی و نەتەوەیی ئازەربایجان و نەتەوەی کورد و لەنێوبردنی یەکیەتیی دێموکراتیکی میللی یا ئاڵۆزکردنی ئەم یەکیەتییە تێ بکۆشێ، یەکدەست لە لایەن هەر دوو لاوە سزا دەدرێ.

### ▪ ٤: لە سێدارە درانی پێشەوا و هاوڕێکانی (١٣٢٦)

دوای ئـەوەی لـە ٢٦ی سـەرماوەزی ١٣٢٥ی هەتـاوی (١٧ی دیسامبری١٩٤٦) ڕاست ساڵێک پاش چەککردنی شارەبانیی مەهاباد، ئەرتەشـی شا مەهابادی داگیر کرد و کۆماری کوردستان تێک شکا و کۆتایی بە تەمەنی هات تا ڕۆژی ٣٠ی سـەرماوەزی ١٣٢٥(٢١ی دیسامبری١٩٤٦) مەهاباد ئارام بوو. لەو ڕۆژەدا سەرتیپ هۆمایوونی بەڕێوەبەرانـی حیزبی دێموکراتی لەو شـارەدا کۆ کردەوە و داوای تفەنگەکانی لێ کردن کە لە یەکیەتیی سـۆڤییەت وەرگیرابوون، بەڵام پێی گوترا کە ئەو تفەنگانە دابەش کراون و لە پێش گەیشتنی لەشکر سـووتێنراون وکـەس نازانێ تفەنگەکان لە دەسـتی کێدان. پێشـەوا قـازی محەممەد بەرپرسـایەتیی ئـەو کارەی وە ئەسـتۆ گرت و لە ئاکامـدا هەر ئەو ڕۆژە ٢٨ کەس لە بەڕێوەبەرانی حیزبی دێموکرات و کۆماری کوردستان بە قازی محەممەدیشەوە گیران.

لە مانگی بەفرانباری ١٣٢٥(٣٠ی دێسـامبری ١٩٤٦دادگایی کردنی پێشەوا و هاوڕێیانی محەممەد حسێن خانی سەیفی قازی و سەدری قازی بە بێ ئەوەی ڕێگا بدرێ پارێزەر بۆ خۆیان بگرن، دەستی پێ کـرد و لە ئاکامدا ڕۆژی ٣ی ڕێبەندانـی ١٣٢٥(٢٣ی ژانویەی١٩٤٧) بــە ئێعدام مەحکووم کـران. جێبەجێکردنی حوکمی ئێعدام بۆ ماوەی ٦٦ ڕۆژ دوا خـرا و لــە ئاکامـدا ڕۆژی١٠ی خاکەلێوەی ١٣٢٦(٣٠ی مارسـی ١٩٤٧) لە سێدارە دران. دواخرانی حوکمی ئێعدامی پێشەوا و هاوڕێکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خۆشەویسـتییەی کە پێشەوا قازی لە نێو خەڵکی کوردستان و بە تایبەتی شاری مەهاباد هەیبوو. ڕێژیم لە دژکردەوەی خەڵک دەترسـا، هەر بۆیە لە ڕۆژی لە سـێدارەدانی پێشـەوا و هاوڕێکانیـدا کـە لە مەیدانـی چوارچرا (ئـەو جێگایە کە کۆماری کوردسـتانی لێ دامەزرا) لە سێدارە دران، کەشوهەوایەکی نیزامیی بەرقەرار کرابوو.

پێشـــەوا قازی لە تەواوی دەورانی موحاکماتی لە دادگای نیزامیی شـــادا کە بە هۆی «ســـەرهەنگ فیرووزی»یەوە بەڕێوە دەچوو، بە تایبەتـــی لـــە رۆژی ١٩ی بەفرانبـــاری ١٣٢٥ (٩ی ژانویە ی١٩٤٧)دا کـــە ١٤ کاتژمێـــری خایانـــد، ئازایانە دیفاعی لە کۆماری کوردســـتان و ئامانجەکانـــی گەلـــی کـــورد کرد و لە ڕاســـتیدا ئەوە پێشـــەوا بوو کـــە دادگای نیزامـــی و ڕێژیمـــی پاشـــایەتیی موحاکمە دەکـــرد و لە دیفاعییاتەکەیـــدا دەیگـــوت ئەمڕۆ قازی محەممەدێـــک ئێعدام دەکەن، سبەی هەموو مرۆڤێکی کورد دەبێتە قازی محەممەدێک.

لە درێژەی ڕەوتی خەباتی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورد بۆ گەیشتن بـــە ئازادیدا زۆر لاوی بەوەج ڕێچکە و ڕێبازی پێشـــەوایان بەر نەدا و لە پێناو ئەو ئامانجانەدا بە هەزاران ڕۆڵەی بەوەجی دیکە شـــەهید بوون و ئەم ڕێگایە هەر بەردەوامە و ئێســـتا ڕۆژی ١٠ی خاکەلێوە کراوەتە ڕۆژی شـــەهیدان و هەموو ساڵێک ڕێبوارانی ڕێگای پێشەوا لەم ڕۆژانەدا لە یادی شەهیدە سەربەرزەکانیاندا کڕنۆشیان بۆ دەبەن و بەڵێنیی درێژەدان بە ڕێبازەکەیان نوێ دەکەنەوە.

### ■ ٥: هۆیەکانی تێکچوونی کۆماری کوردستان

لە ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندیدا بۆ کۆنگرەی ســـێهەم: «دیارە هۆی ئەســـڵیی تێکچوونـــی کۆماری کوردســـتان و شـــکانی جووڵانەوەی ڕزگاریخـــوازی گەلـــی کـــورد لـــە ســـاڵەکانی ١٣٢٤ـ ١٣٢٥دا کزیـــی ناوخۆیـــی حیـــزب و بەڕێوەبەرانی جووڵانـــەوەی حکوومەتی میللی بـــوو». ئەو کزبوونە لە هەموو بارەکانی ژیانی حیزب و حکوومەتدا خـــۆی دەنواند. لە حیزبدا کزیی سیاســـیی بەڕێوەبەری بەرچاو بوو. نووســـراوەکانی ئەو وەختە لە ڕۆژنامەی کوردســـتانەوە بگرە هەتا نووســـراو و گۆڕانکاریی دیکە لەگەڵ ئەوەی کە بڵاوکردنەوەیان بۆ خۆی ســـەرکەوتنێکی گـــەورەی کورد بوو، بەڵام پایـــەی هێندێک لە

وتــارە سیاســیەکانیان کە دەبوا ڕێنیشــاندەری کۆمەڵانی خەڵک بن، نزم بوو.

پەرەئەســتاندنی تونــدی جووڵانەوە و ســەرکەوتنی بــە خێرایی، تەرکیبێکــی نالەبــاری لــە بەڕێوەبەریــدا پێــک هێنابــوو. زۆربــەی بەڕێوەبەران بۆ یەکەم جار لە ژیانیاندا دەســتیان بە کاری سیاســی کردبوو، تاقیکردنەوەیان کەم بوو.

لە خەرمانانی ١٣٢٠دا هەتا ١٣٢٤ کە حیزبی دێموکراتی کوردستان پێــک هات، تەنیا چوار ســاڵ مــاوە هەبوو. لەم مــاوە کورتەدا تەنیا تاقیکردنەوەی سیاسیی یەک دوو ساڵی کۆمەڵەی ژکاف بە دەستەوە بــوو. ناچــار بەڕێوەبەرییــەک پێک هاتبــوو کە پایەی تێگەیشــتن و تاقیکردنەوەی سیاســیی لە رادەی ئەو مەســئوولیەتەی کە هاتبووە ئەســتۆی، نزمتــر بوو. هەر وەک لە ڕاپۆرتــی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی سێهەم گوتراوە:

«بێ ئەزموونی کاربەدەســتانی کۆماری کوردستان لەوەڕا دەردەکەوێ کە پاش ئەو هەموو تاقیکردنەوە تاڵە مێژووییەی گەلــی کورد بە درێژایــی خەباتی خۆی دەســتی کەوتبوو، تا ڕادەیەکــی زۆر فریــوی قســە و وادە و بەڵێنیــی حکوومەتی کۆنەپەرەستی تارانیان خوارد».

بــە ڕاســتیش ژیری و خــاوەن تەجرەبەیی لە سیاســەتدا لە کاتی بەرەنگاربــوون لەگــەڵ دوژمنــی فێڵزانــدا دەردەکەوێ. بــە داخەوە ســەرۆکایەتیی کۆماری کورســتان لــە مەهاباد لــەو ئەزموونەدا بە سەرکەوتوویی دەرنەچوو و تووشی هەڵەیەکی مێژوویی ئەوتۆ هات کە بۆ گەلی کورد یەکجار زۆر گران تەواو بوو.

گەلــی کورد بە درێژایی مێژووی خۆی لە تەشــکیلات و ڕێکخراو خــۆی دوور ڕاگرتــووە، تەنانەت لێشــیان بێزار بووە، هۆیەکەشــی دیارە، تەشــکیلات و ڕێکخراو ســەمبوڵی فەرمانڕەوایی حکوومەتی

مەرکەزی بووە و زۆری لێ کردووە، جا لە بەر ئەوە کزبوونی حیزب لــە باری ڕێکخراوەوە لە ســەردەمی کۆماری کوردســتاندا شــتێکی زۆر مەنتیقــی بــوو. بە داخەوە ئــەو کزبوونە لە هەمــوو کاروباری حیزبدا دیار بوو. ســەلماندنی ئوســوولی تەشــکیلاتی لە ناو حیزبدا تێکۆشــانێکی زۆری دەویســت، بە داخەوە دامەزراندنی ئوســوولی تەشکیلاتی لە بارێکیتریشەوە دژوار بوو. نەک هەر ئەم ئوسووڵە لە لای گەلی کورد خۆشەویســت نەبوو، بەڵکوو بەڕێوەبەرایەتی خۆی لە ئوســوولی تەشکیلاتی شارەزا نەبوو، لە پاش تێکچوونی کۆماری کوردستان بە چاکی دەرکەوت کە کزیی کاری تەشکیلاتیی سەردەمی کۆماری کوردســتان تا چ ڕادەیەک بوو. بێجگە لەوە، حیزب لە باری ئیدئۆلۆژیشەوە کز بوو. مەبەست ئەوە نیە کە دەبوایە تیئۆریی زانستی بە سەر حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئەو سەردەمەدا زاڵ بێ، تەنیا ئینسانی خەیاڵی دەتوانێ بەم جۆرە فیکر بکاتەوە، حیزبی دێموکراتی کوردســتان لە کۆمەڵی کوردەواریی ئەو وەختە هەڵقووڵابوو و هەر چەند پێشڕەوی کۆمەڵ بوو، بەڵام نەیدەتوانی حیزبێک بێ کە بە پێی تیئۆریی زانستیی پەرەســتاندنی کۆمەڵ بجووڵێتەوە. مەبەست تەنیا ئەوەیــە کە تەنانــەت یەکێتیی فیکریش لە ســەر بەرنامەیەکی ڕوون بــە تەواوی پێک نەهاتبــوو. جووڵانەوە تازە دەســتی پێ کردبوو و بەهێزبوونــی هەســتی نەتەوایەتــی لە کوردســتاندا وای لێ کردبوو کــە تەنیــا لایەنگری لە مافــی نەتەوایەتی کورد بۆ بەشــداربوون لە جووڵانــەوە و تەنانەت بۆ گەیشــتن بــە بەڕێوەبەریش بەس بوو، لە ســەر گیروگرفتەکانی کۆمەڵی کوردەواری، لە سەر گیروگرفتەکانی گشــتیی ئێــران و نیونەتەوەییش یەکێتیی فیکریی تــەواو تەنانەت لە ناو بەڕێوەبەریشدا پێک نەهاتبوو، لە کاتی پەلاماری حکوومەتی شا بۆ کوردســتان و پاش تێکچونی کۆماری کوردســتان بوو کە کزیی ئیدئۆلوژی و یەکێتیی فیکری لە ناو حیزب و بەڕێوەبەرایەتیی حیزبدا

بە تەواوی دەرکەوت.

کزبوونی حیزب لە باری سیاسی و تەشکیلاتی و ئیدئۆلوژییەووە لە کەمبوون و یا نەبوونی بە یەکجاریی کادری تێگەیشتوو و پێگەیشتوو لە ریزەکانی حیزبدا دیار بوو، بەڕاستی نوختەی کزی جوولانەوەی ساڵەکانی ١٣٢٤ـ ١٣٢٥ نەبوونی کادر بوو. لەبەر ئەوەی تەمەنی کۆماری کوردستان زۆر کورت بوو، نەیتوانی کادری پێویستی خۆی بۆ خۆی پەروەردە بکا. کادری باش، ئەو کادرەی کە بە کاری تێکۆشانی حیزبی دێ و بڕبڕەی پشتی حیزبە، تەنیا لە مەیدانی خەباتدا پەروەردە دەکرێ. راستە کە دەبێ فێری تئیۆریی زانستی بێ، پایەی زانستیی خۆی بەرێتە سەر، بەڵام دەبێ لە ناو گەلدا ژیابێ و لە ناو گەلیشدا پەروەردە کرابێ، فێر بووبێ و لە ژیان و خەبات دەرسی وەرگرتبێ.

بە داخەوە کادری ئەوتۆ لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا هەر یەکجار کەم بوون و دەتوانین بڵێین کە یەکێک لە هۆیەکانی هەرە ئەساسیی تێکچوونی کۆماری کوردستان نەبوونی کادری لێزان و شارەزا بوو، کزبوونی بەڕێوەبەرایەتیی حیزب لە ناو کاروباری حکوومەتی کۆماریشدا خۆی دەنواند.

لە راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆنگرەی سێهەمدا گوتراوە:

«کزبوونی سەرۆکایەتی و نەبوونی کادری پێگەیشتوو بوو بە هۆی ئەوە کە وەزعی سیاسی لە ژوورەوە پتەو نەکرا، دەزگای حکوومەت چەسپاو نەبوو، هێزی میللی سەر و سامانێکی رێکوپێکی پەیدا نەکرد».

بەم جۆرە راپۆرت ئیشارەی بە سێ مەسەلەی ئەساسی کردووە:

یەکەم: پتەوکردنی وەزعی سیاسیی ناوخۆ، کە بەر لە هەموو شتێک راکێشانی پشتیوانی و خۆشەویستیی کۆمەڵانی خەڵک بۆ لای کۆماری کوردستان بوو، لەم بارەوە کۆماری کوردستان سەرکەوتوو

بــوو و زۆربەی میللەتــی کورد بە دڵەوە پشــتیوانیی لێ کرد، بەڵام پێویست بوو کۆمەڵانی بەرینی خەڵک لە باری سیاسییەوە پەروەردە بکرێــن، حاڵی بکرێن کــە حیزبی دێموکراتی کوردســتان بە تەواوی چی دەوێ و هێزی بێ پایانیان بۆ پاراســتنی کۆماری کوردستان و دەســکەوتەکانی هان بدرێ. هەروەها مانای بێ هێزکردن و تەنانەت لــە باری سیاســییەوە لــە ناوبردنی هەمــوو ئەو دەســتە و توێژانە بــوو کــە دژی کۆمار بــوون. بە تایبەتی خاشــەبڕ کردنــی نفووزی هێندێک دەرەبەگی گەورە و ســەرۆک عەشــیرەت بوو کە بە ئاشکرا دوژمنایەتیی خۆیان بەرانبەر بە کۆمار نیشان دا، لە پاش تێکچوونی کۆمــاری کوردســتان، ئەو وەختە کە دەســتە و توێژی دژی کۆمار رۆڵــی خائینانەی خۆیان دیاری کرد، ژیانی سیاســیی نەرمی کۆمار بەرانبــەر بە دوژمنانی جووڵانــەوە بە تەواوی دەرکەوت. هێندێک لە کاربەدەســتانی کۆماریش کە بۆ قازانجــی فەردیی خۆیان هاتبوونە ناو دەزگای کۆماری کوردستان، زۆر زوو خەیانەتیان کرد و خۆیان دە باوەشی دوژمن هاوێشت.

یەکێک لە ئەرکەکانی بنەڕەتیی شۆڕشێک، تەنانەت هەموو گۆڕانێکی قووڵی کۆمەڵایەتیش تێکدانی دەزگای دەوڵەتیی کۆن و دانانی دەزگای نوێیــە کە بە ئامانجەکانی شــۆڕش وەفادار بێ و خزمەتی کۆمەڵانی خەڵک بکا و دژی دوژمنانی جووڵانەوە تا سەر رابوەستێ. بەداخەوە سەرۆکایەتیی کۆماری کوردستان نە ئەو دەرفەتەی هەبوو، چوونکە ئەو ماوەیەی بە دەســتیەوە بوو کەمتر لە ســاڵێک بوو و نە ئیمکانی ئــەوەی هەبوو. لێرەشــدا دیســان بــێ کادری وە بەرچــاو دەکەوت و پاککردنــەوەی دەزگای حکوومەتــی لە ئینســانی بــێ کەڵک و بێ بیروباوەڕ هاسان نەبوو، چونکە کەس نەبوو لە جێگایان دابنێ. بەڵام با ئەو راستیەش بڵێین کە ئەم مەسەلە بۆ سەرۆکایەتیی ئەو وەختە گرینــگ نەبوو و لەوانەیە فیکریشــی لەوە نەکردبێ کە پاککردنەوەی

دەزگای حکوومەتی ئەرکێکی زۆر پێویستە. بێگومان پێکهێنانی هێزی میللیی کوردستان، لەشکری شۆڕشگێڕی گەلی کورد، سەرکەوتنێکی گەوەی کۆماری کوردستان بوو. پێشمەرگەکان کە زۆربەیان زەحمەتکێش بوون، بە دڵەوە بۆ دیفاع لە کۆماری کوردستان ئامادە بوون. بەڵام هێزی میللی سەروسامانێکی رێکوپێکی نەبوو و ئەمە لە دوو مەسەلەدا ئاشکرا بوو. یەکەم هێزی پێشمەرگە نە لە باری سیاسی نە لە باری عەسکەرییەوە پەروەردە نەکران، زۆرجار هەر ئەوەندە بەس بوو کە کەسێک کورد بێ و بتوانێ تەقە بکا بۆ ئەوەی بێتە ناو جەرگەی پێشمەرگە، دیسیپلین و مەشقی نیزامی جاریێ بە تەواوی لە ناو هێزی میللیدا سەر نەکەوتبوو. بە کورتی پێوەندیی عەشیرەتگەری لیرەشدا نفووزی خۆی پاراستبوو و زۆر زیانی بە هێزی میللی گەیاند.

دووهەم: راستە کە هێزی میللی چەند سەرکردەی لێوەشاوە و خۆشەویستی گەلی پەروەردە کردبوو کە پایەی تێگەیشتنی سیاسی و تەنانەت نیزامیشیان بەرز بوو، بەڵام زۆربەی ئەفسەرانی هێز لەو دوو سفەتە ئەساسییە بێبەش بوون کە بۆ هەموو سەرکردەیەکی لەشکری شۆڕشگێڕ پێویستە، بە کورتی سەرکردایەتیی هێزی میللی کز بوو و لە وزەیدا نەبوو ئەرکی قورسی پاراستنی کۆماری کوردستان بە جێ بگەیەنێ.

ئەو هۆیانە باسمان کردن هۆی بیری یان سۆبژکتیڤن، بەرپرسی ئەو هۆیانە سەرۆکایەتیی کۆماری کوردستان واتە حیزبی دێموکراتی کوردستان بوو. هەرچی هەڵەش کراوە دیسان هەر حیزبی دێموکراتی کوردستان و بە تایبەتی بەڕێوەبەرایەتیی ئەو حیزبە بەرپرسە، بەڵام هۆیەکانی تێکچوونی کۆماری کوردستان هەر ئەوانە نەبوون، هێندێک هۆی ناوخۆیی‌تریش هەبوون کە بە هۆی بەرچاو یا ئۆبژێکتیڤیان دادەنێن، واتە ئەو هۆیانە کە دەسەڵاتی حیزبی دێموکراتی کوردستان

و بەڕێوەبەرایەتییان بە سەردا نەبوو و نەیاندەتوانی لە هەلومەرجی ئەو وەختەدا تەئسیرێکی زۆریان بکەنە سەر.

یەکەم: قوولتر نەبوونی جوولانەوەی ساڵەکانی ١٣٢٤ـ ١٣٢٥ بوو. بەو مانایە کە هیچ گۆڕانێکی قووڵی کۆمەڵایەتیی پێک نەهێنا و زیاتر لە چوارچێوەی جوولانەوەیەکی نەتەوایەتیدا مایەوە، هەلومەرجی ئەو سەردەمی کوردستان و تەرکیبی حیزب و بەڕێوەبەرایەتییەکەی ڕێگای ئەو گۆڕانە قووڵەی نەدەدا. ئەو گۆرانە بە تایبەتی لە لادێدا پێویست بوو، لەناوبردن و یا هەر نەبێ کەمترکردنی دەسەڵاتی دەرەبەگەکان و هەنگاو هەڵهێنان بە قازانجی جووتیاران دەیتوانی جووتیارانی کوردستان، واتە زۆربەی گەلی کورد بکا بە پشتیوانی جیددیی کۆماری کوردستان. لەم بارەوە کۆماری کوردستان لە حکوومەتی میللیی ئازەربایجان لە دواتر بوو، لە کاتێکدا کە لە ئازەربایجان ئیسلاحی زەوی دەکرا، زەویی دەرەبەگەکان لە ناو جووتیاراندا دابەش دەکرا، لە کوردستان پاشکەوتووتر بوونی کۆمەڵی کوردەواری و بەهێزبوونی باری نەتەوایەتیی جوولانەوە ڕێگای گۆڕانێکی کۆمەڵایەتیی ئەوتۆی نەدەدا.

دووهەم: تەنیا یەک لە سێی خاکی کوردستانی ئێران رزگار کرابوو، لە نەتیجەدا ناوچەی کرماشان و سنە، واتە بەشی خوارووی کوردستان کرا بە بنکەیەک دژی کۆماری کوردستان لە مەهاباد. لە باتی ئەوەی کە ئەم دوو ناوچەیە وەک بەشێک لە خاکی کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی میللیی کوردستاندا بن، بوون بە زەخیرەی سیاسی و ئابووریی حکوومەتی مەرکەزی و بۆ رووخاندنی کۆماری کوردستان کەڵکیان لێ وەرگیرا. ئەو پرسیارە دیتە پیش کە بۆچی سەرۆکایەتیی حیزب بڕیاری رزگارکردنی ناوچەی کرماشان و سنەی نەدا کە لەو سەردەمەدا کارێکی گران نەبوو؟ لە ڕاستیدا سەرۆکایەتی و بە تایبەتی سەرکردەکانی هێزی میللی چەند جار

هاتنە سەر ئەو باوەڕە کە بۆ رزگاریی بەشی خوارووی کوردستان لــە جبهــەی ســەقزەوە پەلامــار بدەنە ســەر لەشــکری حکوومەتی مەرکــەزی، بــەڵام پارســەنگی هێزەکانــی نێونەتەوایەتــی رێگــەی ئەوەیان نەدەدا. ئەو وەختە ســوپای ئینگلیز کوردســتانی خوارووی داگیــر کردبوو و دەرکەوت کــە هەر پەلامارێک بۆ رزگارکردنی ئەم ناوچەیــە بەرەنگاربوون لەگەڵ هێزی ئینگلیز بــوو. لە لایەکی‌ترەوە ئینگلیــز و ئەمریکا و یەکێتیی ســۆڤیتی لە بــەرەی یەکگرتووی دژی فاشیســتیدا بوون و ســەرۆکایەتیی کۆماری کوردستان نەیدەتوانی ئــەو هەلومەرجە نەخاتــە بەرچاو، ناچار رزگارکردنی کوردســتانی خــواروو بۆ دواڕۆژ مایەوە، دواڕۆژێک کــە هەر نەهات تا کۆماری کوردستان خۆی تێک چوو.

ســێهەم: هەر وەها کە لە راپۆرتدا هاتــووە، « نەبوونی یەکگرتنی پتــەو و یەکێتیــی بە کردەوە لــە ناو هێــزە دێموکراتیکەکانی ئێراندا، یەکێــک لە هۆیەکانی هەرە گرینگی تێکشــکانی کۆماری کوردســتان و هەروەهــا جووڵانەوەی سەرانســەریی ئێران لە ســاڵەکانی ١٣٢٤-١٣٢٥دا و بەشێک لە جووڵانەوەی دێموکراتیک و دژە ئیمپریالیستیی سەرانسەری ئێران بوو.

هەرچەنــد بەرەیەک لــە ناو شــەش حیزبی ئێرانــدا وەک، حیزبی ئێران، حیزبی توودەی ئێران، حیزبی دێموکراتی کوردستان، فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان، حیزبی سۆسیالیست و حیزبی جەنگەڵ پێک هاتبوو و ئەو بەرەیە لە باری فیکرییەوە تەئسیرێکی زۆری کردبووە ســەر وەزعی سیاســیی ئێــران و کۆمەڵانــی خەڵکی سەرانســەری ئێرانی لە باری سیاســییەوە وریا کردبــوو، بەڵام بەداخەوە رۆژێک کە پێویست بوو ئەم بەرەیە بە هەموو هێزیەوە بێتە مەیدانی خەبات، بێدەنگ وەســتا و بوو بە تەماشــاچیی رووداوەکان. ســەرۆکایەتیی ســێ حیزبی ئەساسیی ئەم بەرەیە، حیزبی توودەی ئێران و فیرقەی

دیموکراتـــی ئازەربایجان و حیزبی دیموکراتی کوردســـتان، هەریەک بە جیـا کەوتنە ڕێگا دۆزینەوە بۆ چارەســەرکردنی گیروگرفتەکانی خۆیان. کاتێک لەشـکری کۆنەپەرەسـتی ئێران بۆ لای ئازەربایجان و کوردسـتان وەڕێ کـەوت، حیزبـی تـوودە بێدەنـگ مایـەوە. کە جوولانــەوە لــە ئازەربایجان و کوردســتان تێک شـکا، ئـەو وەختە لێدانــی جوولانەوە لە ناوچەکانیتری ئێران بۆ کۆنەپەرسـتیی ئێران هاسانتر بوو. سەیرتر ئەوە بوو کە هەر چەند لە ناو حکوومەتەکانی ئازەربایجان و کوردسـتاندا پەیمانی دووقۆڵی هەبوو کە بە پێی ئەو پەیمانــە دەبوایە پێکـەوە دژی حکوومەتی مەرکـەزی بەربەرەکانێ بکەن، بەڵام بەداخەوە کاتێک لەشـکری شـا پەلاماری ئازەربایجانی دا، سـەرۆکایەتیی فیرقــە بــە بــێ ئــاگاداری و راوێژکــردن لەگەڵ سـەرۆکایەتیی حیزبی دیموکراتی کوردستان پاشەکشەی کرد. هەر بەم جۆرە کە لەشکری ئێران ڕووی لە کوردستان کرد، سەرۆکایەتیی حیزبی دیموکراتی کوردستان نە هاوبەرەی هەبوو، نە هاوپەیمان.

دیــارە هۆی دەرەوەش بە هۆی بەرچــاو دادەنرێن، هۆیەک کە لە دەسەڵاتی حیزبی دیموکراتی کوردستان بەدەر بوو. پشتیوانی ئەسڵی کۆماری کوردســتان لە دەرەوە، یەکێتیی سۆڤیەتی بوو. ئیمپریالیزمی ئینگلیز کە نفووزێکی زۆری لە دەزگای حکوومەتیی ئێراندا هەبوو و هەروەها ئیمپریالیزمی ئەمریکا کە تازە بە شـێوەیەکی شێلگێر ڕۆڵی خۆی لە سیاســەتی ئێراندا دیاری دەکرد، کۆماری کوردســتانیان بە درکی چاوی خۆیان دادەنا.

ئینگلیزییــەکان بــە تایبەتــی لەوە دەترســان کە چەســپاو بوونی کۆمــاری کوردســتان لــە ئیران تەئسـیر بکاتە سـەر کوردسـتانی عێراقیش کە سـەرچاوەی نەوت بوو و نەوتەکەش زیاتر بە دەسـت شـیرکەتەکانی ئینگلیزەوە بوو. ئەمریکاییەکانیش هەم بە گشتی دژی ئەسـتاندنی رزگاریخوازی بوون و هەم بوونی بنکەیەکی دیموکراتی

وەک کۆمـاری کوردسـتانیان لە ئێران بە زیانـی نفووزی خۆیان لە ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت دەزانی. بێجگە لەوە، شـیرکەتەکانی نەوتی ئەمریکایش لە نەوتی کوردسـتانی عێراقدا بەشـدار بوون. بۆیە ئەم دوو وڵاتە ئیمپریالیستییە بە هەموو هێزیانەوە ڕێژیمی کۆنەپەرەستی ئێرانیـان بـۆ لەناوبردنی کۆماری کوردسـتان هـان دا و لە هەموو بارێکـەوە، دراو، چەک و موستەشـار یارمەتییان پـێ کردن، دیارە ڕاسـتەوخۆ دەسـتی خۆیان بۆ ئێـران درێژ کرد، لەشـکری خۆیان بۆ ئێران نەنارد، بەڵام نیشـانیان دا کە بۆ ئەمەش ئامادەن. تەنانەت ئیمپریالیزمـی ئەمریکا کە ئەو کاتە تاقە وڵات بوو کە بۆمبی ئەتۆمی بە دەستەوە بوو، پشت ئەستووریی خۆی بەو بومبانە نەدەشاردەوە. لە شـەڕی دووهەمیشدا سـەرکەوتوو بوو، دەوڵەمەندتر و بەهێزتر دەرچووبوو و وڵاتەکەشی وێران نەببوو.

هۆیەکی دیکەش سیاسەتی یەکێتیی سۆڤیەتی سەردەمی ستالین بوو کە بە گشتی لێپرسراوەکانی هەم لە ناوەوە و هەم لە دەرەوە تووشی زۆر هەڵـەی گـەورە ببوون. ئێرانیش لەم هەڵـە و چەوتیانە تەرخان نەکرا، لێکدانەوەی بەرپرسـانی سیاسـیی دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەتی لە وەزعی سیاسیی ئێران، لێکدانەوەیەکی چەوت بوو. کاربەدەستانی ئـەو وەختەی ئێران بە مانوڕکردن و دانـی بەڵێنی کە پەلامار نابەنە سەر حکوومەتەکانی ئازەربایجان و کوردستان و گیروگرفتی نەوتی شـومالیش کـە پەیمانی دەرهێنانی هاوبەش لە نـاو ئێران و یەکێتیی سۆڤیەتیدا ئیمزا کرابوو، بە قازانجی یەکێتیی سۆڤیەتی چارەسەر دەکەن، توانیان پیاوە سیاسـییەکانی ئەو وەختەی یەکیەتیی سۆڤیەتی بە فریو بـەرن. جەعفەر باقرۆف کە کاربەدەسـتی سـەرەکیی ئازەربایجانی سۆڤیەتی بوو و لە دانانی سیاسەتی سۆڤیەتی لە ئێراندا دەستێکی باڵای هەبوو و لە پاشـانیش لە یەکێتیی سۆڤیەتی موحاکمە و ئیعدام کرا، لە هەموو ماوەی پەرەئەستاندن و تێکچوونی جووڵانەوەی ئازادیخوازی

لـــە ئێراندا زۆر نالەباری کرد و زۆر بڕیـــاری فەردیی ئەوتۆی دا کە بە قازانجی سیاســەتی دەرەوەی سۆڤیێتی و جووڵانەوەی دێموکراتی لە ئێران نەبوو. ئەوە بو وەختێک لەشــکری حکوومەتی مەرکەزی بە بیانووی ڕێکخســتنی هەڵبژاردنی مەجلیــس ڕووی لە ئازەربایجان و کوردستان کرد، سۆڤیێتییەکان لەو بڕوایەدا بوون کە پێویستە فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان بەربەرەکانێی ئەم لەشکرە نەکا.

بیجگە لەوە، ســۆڤیێت تازە لە شــەڕی دووهەمی جیهانی ڕزگاری ببوو. نیوەی وڵاتەکەی وێران ببوو، پێویستی بە ئاشتی و ئاسایش و ئاوەدانکردنەوە هەبوو. وەختێک کە دەرکەوت لەشــکری ئێران نەک وەک لەشــکرێک کە دەیەوێ هەڵبژاردنی مەجلیس ڕێک بخا، بەڵکوو وەک لەشکرێکی داگیرکەر کەوتە ئازەربایجان و ڕۆژی ٢١ی ئازەری ١٣٢٥ گەیشتە تەوریز و هیچ کە بەربەرەکانێش نەکرا، بەڵکوو هێزی کۆنەپەرەست لە ئازەربایجان بۆ کوشتنی دێموکراتەکان دەستیان دایە چەک، ئەو وەختە ئیتر یەکێتیی سۆڤیێتی بیشیویستبا لە ئازەربایجان و هەروەها لە کوردستانیش دیفاع بکا، هیچی پێ نەدەکرا.

ڕاســتییەکیتریش دەبــێ لێرەدا بگوتــرێ. یەکێتیی ســۆڤیێتی چۆن لــە کۆماری کوردســـتان دیفاعی کردبا؟ ئەگەر کوماری کوردســـتان خۆی بەربەرەکانێی لەشــکری کۆنەپەرەســتی ئێرانــی کردبا و ئەو بەربەرەکانێیـــە ماوەیەکیــش درێــژەی هەبا، ئەو وەختــە لەوانە بوو یەکێتیی ســۆڤیێتی یارمەتیی کۆماری کوردســـتان بدا. بەڵام کۆماری کوردســـتان بەربەرەکانێی نەکرد و دیفاعیشـــی لە خۆی نەکرد، لەو حاڵەتەدا یەکێتیی سۆڤیێتی بۆ دیفاع لە کۆماری کوردستان تەنها یەک ڕێگای هەبوو، ئەویش ناردنی لەشــکری ســۆڤیێتی بۆ ئێران بوو. بۆ ئــەوەی نەک یارمەتی بە گەلی کورد بدا، بەڵکوو لە باتی گەلی کورد شـــەڕ بکا. دیارە ئەوەش مومکین نەبوو، هەرچەند مێژوو ئەوەیە کە بووە نەک ئەوە کە دەبوایە ببێ، بەڵام ئایا کۆماری کوردستان دیفاعی

لە خۆی کردبا و ماوەیەکیش خۆی ڕاگرتبا، وەزع نەدەگۆڕا؟

ئەمە چەند دەرسێکە لە مێژووی خەباتی گەلی کورد و بە تایبەتی لە تێکۆشـــانی کۆماری کوردســـتان لە مەهاباد. لێکۆڵینەوەی زیاتری هەموو بارەکانی پێکهاتن و پەرەئەســـتاندن و تێکچوونی ئەو کۆمارە دەبێ هەر درێژەی هەبێ.

## ■ ٦: ڕاپەڕینی جووتیارانی موکریان (١٣٢٩-١٣٣٢)

لە ٢٦ی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٥ هەتاویدا هێزی داگیرکەری ڕێژیمی پەهلەوی بە بیانووی دابینکردنی «ئەمنیەت» بۆ هەڵبژاردنی «مجلس شـــورای ملی» کۆماری کوردســـتان و شـــاری مەهابـــادی پێتەختی کۆمـــاری داگیر کرد، ســـەرۆک کۆمار و گەلێک لـــە ڕێبەرانی حیزب و کۆمار شـــەهید کران، بەڵام بە شەهیدکردنی پێشەوا و هاوڕێکانی و زیندانیکردن و ئازاری تێکۆشـــەرانی حیزبی دێموکراتیش ڕێژیمی شـــا نەیتوانـــی ئیرادەی گەلی کـــورد بۆ خەبات لە پێنـــاو وەدیهێنانی ئامانجەکانیـــدا تێک بشـــکێنێ و حیزبی دێمۆکـــرات پاش ئەو غەدر و زەبرە گەورەیەش زۆر زوو کەوتەوە خۆ و ڕێکخراوەکانی سازمان دایـــەوە، جەماوەری ڕێک خســـتەوە و خەباتێکی شـــکۆداری وە ڕێ خست.

جارێکی دیکەش لە ١٥ی ڕێبەندانی١٣٢٧ی هەتاویدا ڕێژیمی شـــا هێرشـــێکی بەربڵاوی کردەوە سەر تێکۆشەرانی حیزبی دێموکرات و ژمارەیەکی زۆریانی خســـتە زیندان و ئەشکەنجەگاکانیانەوە، کەچی ورەی شۆڕشـــگێڕانی دێموکـــرات تـــا دەهـــات بەرزتر دەبـــووەوە و شێلگیرتر و لێبڕاوانەتر لە تێکۆشان هەڵدەچوونەوە.

یەکێـــک لـــە ڕووداوە مێژووییەکانی ئەو ســـەردەمە ڕێفراندۆم بۆ «یاســـای ٢٠٪» بـــوو کـــە حکوومەتی موســـەدیق هێنایە ئـــاراوە و لایەنگرانـــی شـــا دژایەتییان دەکرد. هەڵویســـتی حیزبی دێمۆکرات لە

هەمبەر ئەو ڕێفراندۆمە دەنگدان بۆ پەسندکردنی یاساکە بوو کە لە بەرژەوەندیی جووتیارانی زەحمەتکێشدا بوو. لە ئاکامی ئەو هەڵوێستەدا لە هەموو ئەو ناوچانەی کومیتەکانی حیزبی دێموکرات چالاک ببوونەوە، لە بانەوە هەتا شنۆ و سندووس (نەغەدە) دژبەرانی یاساکە و لایەنگرانی حەمەڕەزاشای بکوژی پێشەوا لە بانە ٢ دەنگ و لە مەهابادیش هەر ٢ دەنگیان هێنایەوە. ئەوە بە ڕوونی دەری دەخست کە خەڵکی کوردوستان چەندە لە شا بێزار و چەندە بە ڕێبازی دێمۆکرات وەفادارن. هەروەها لە سەرەتای هاوینی ساڵی١٣٣١ی هەتاویدا کاندیدای حیزبی دێموکرات بۆ دەوری ١٧ی «مجلس شورای ملی» ٨٧٪ی دەنگەکانی خەڵکی ناوچەکەی دەستەبەر کرد کە ئەو هەڵوێستەی کۆمەلانی خەڵکیش ئاماژەیەکیتر بۆ پشتیوانیی بەربلاوی خەڵکی کوردستان لە خەباتی جەماوەریی حیزبی دێموکرات بوو.

لە بەستێنی ڕەخساو بۆ خەباتی جەماوەری لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، لە نێوان ساڵەکانی ١٣٢٩ی هەتاوی تا کۆتایی مانگی گەلاوێژی١٣٣٢ی هەتاوی حیزبی دێمۆکرات لە موکریان بزووتنەوەیەکی شکۆداری جەماوەریی وەڕێ خست کە جووتیار و زەحمەتکێشانی ناوچەکەی لە دژی ڕێژیم و سیستمی زاڵمانەی دەرەبەگایەتی لێک کۆ کردەوە. ئەو بزووتنەوەیە تا ئەو سەردەمە لە کوردستان، ئێران و دەوروبەریدا بێ وێنە بوو. ناوەندی بزووتنەوەکە شاری بۆکان بوو کە بە خێرایی ناوچەکانی گەورکی سەقز، توورجان، دەوروبەری بۆکان، شامات و سندووسی گرتەوە. لووتکەی ئەو بزووتنەوەیە کۆبوونەوەی دەهەزار کەسیی جووتیاران لە ئاوایی «ئالبلاغ»ی بۆکان بوو کە لەوێ بڕیار درا شاری بۆکان لە چنگی ژاندارم و نوێنەرانی دەسەلاتی شا کە ببوونە پاڵپشتی دەرەبەگەکان، دەربێنن. ئەو بزووتنەوەیە تا «کوودەتا» نگریسەکەی شا لە ٢٨ی

گەلاوێژی١٣٣٢ی هەتاوی بەردەوام بوو.
سڵاو لەو رۆڵە تێکۆشەرانە و ئەو شەهیدە قارەمانانەی حیزبی دێموکرات کە بزووتنەوی جووتیارانی موکریانیان ڕێبەری کرد.
* ئەم بابەتە لە لایەن بەڕێز کاک عومەر غولامعەلی، ئەندامی کومیتەی ناوەندیی حیزبەوە ئامادە کراوە.

## ■ ٧: کومیتەی کوردستان و ئازەربایجان (کاک)

پاش رووخانی کۆماری کوردستان ڕێبوارانی ڕێگای پێشەوا قازی محەممەد ڕێکخراوەکانی حیزبی دێموکراتیان لە ناوچەی باکووری کوردستانی ئێران، موکریان و تەنانەت سنەش بە یارمەتیی حیزبی توودە بووژاندەوە. لە مەهاباد کومیتەیەکی ٦کەسی بە ناوی «کومیتەی مەهاباد» پێک دێت کە ئەندامەکانی بریتی دەبن لە عەزیز یووسفی، ڕەحیم سوڵتانیان، کەریم ئووەیسی، غەنی بلووریان، عەبدوڵڵا ئیسحاقی و بەرپرسی ئەم کومیتەیەش لە بانەمەڕی ١٣٣٢ەوە عەبدولڕەحمان قاسملوو بووە. ئەم کومیتەیە بە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی حیزبی دێموکرات، خەڵکی بەرەو خەبات هان دەدا.

لەو کاتەدا ڕێکخراوەکانی حیزبی دێموکرات لە کوردستان کە پێوەندیی تەشکیلاتییان لەگەڵ حیزبی توودە هەبوو، لە تەنیشت حیزبی توودە کە رۆڵی دەفتەری سیاسیی هەبوو لە تاران، لە لایەن کومیتەیەکی تایبەتییەوە بە ناوی «کاک» کە سێ ئەندامی هەبوو و کورتکراوەی «کومیتەی ئازەربایجان و کوردستان» بوو بە ڕێوە دەچوون. لەو کومیتە سێ کەسییەدا ئەندامێکی دەفتەری سیاسیی حیزبی توودە، نوێنەرێکی ئازەربایجان و نوێنەرێکی کوردستان بەشدار بوون کە نوێنەری کوردستان لە دەوری یەکەمدا سارمەدین سادق وەزیری و لە پاش ئەویش دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو

بووە.

تەشـــکیلاتی حیزب لەم دەورەیەدا بە بەشێک لە تەشکیلاتی حیزبی توودە دەهاتە ئەژمار، بە جۆرێک کە کاتێک ئەندامێکی تارانی حیزبی تـــوودە دەهاتـــە کوردســـتان، ئۆتۆماتیک دەبـــووە ئەندامـــی حیزبی دێموکـــرات و ئەگەریـــش ئەندامێکـــی حیزبی دێموکرات دەڕۆیشـــتە تـــاران، دەبوو بە ئەندامـــی حیزبی توودەی ئێـــران و ئەم تێکەڵاویی تەشـــکیلاتییە تا کۆنفرانســـی یەکەمـــی حیزب کە لە ســـاڵی ١٣٣٤ لە «کەوتەران»ی مەهاباد بە ڕێوە چوو، درێژەی کێشا. لەو کۆنفرانسەدا واتە کۆنفرانسی یەکەم بوو کە بە هۆی «پۆلیسزەدە» بوونی حیزبی توودە کە پاش ٢٨ی گەلاوێژی ١٣٣٢ ژمارەیەکی زۆری لە ئەندامانی حیزبـــی تـــوودە گیران و پۆلیـــس نفووزی کردبووە نێو تەشـــکیلاتی حیزبی توودە، بە پێشنیاری دوکتوور قاسملوو پێوەندیی تەشکیلاتیی حیزبـــی دێموکرات لەگەڵ حیزبی تـــوودە پچڕا و حیزب کومیتەیەکی ســـەربەخۆی بۆ خەبات لە کوردســـتان دیاری کرد کـــە ئەندامەکانی بریتی بوون لە:

عەبدولڕەحمان قاسملوو، عەبدوڵڵا ئیسحاقی، هاشم ئەقەلوتوللاب، عەزیز یووسفی، عەبدوڵڵا عیزەت پوور، ئەسعەد خودایاری.

دوای پێکهێنانـــی ئـــەم کومیتەیـــە بـــوو کـــە حیـــزب ســـەربەخۆیی تەشـــکیلاتیی خـــۆی بە دەســـت هێنایەوە، هـــە رچەنـــد بیروباوەڕی توودەیی تا ساڵانێکی درێژ بەرۆکی حیزبی دێموکراتی بەر نەدا و لە هەر قۆناغێکدا بە جۆرێک کێشەی بۆ ئەم حیزبە خۆش کردووە.

### ■ ٨: پەلاماری پۆلیس بۆ سەر ئەندامانی حیزب (١٣٣٨-١٣٤٣)

لە درێژەی خەباتی تەشکیلاتییاندا، ئەندامانی حیزب پاش رووخانی کۆماری کوردستان لە دوو قۆناغدا کەوتنە بەر هێرشی پۆلیس و بە زیندانی درێژخایەن و تەنانەت ژمارەیەکیشیان وەک عەزیز یووسفی

و غەنــی بلووریــان بە ئێعدام مەحکووم کران کــە دیارە لە بەر دوو هۆکار ئەو حوکمە بە ڕێوە نەچوو و کرا بە زیندانی هەتاهەتایی.

هۆکاری یەکەم دیفاعی نێونەتەوەیی و هۆی دووهەم لە ئارادابوونی شۆڕشــی کوردســتانی عێراق کە بە ڕواڵەت ئێران لە دژی ڕێژیمی عێــراق پشــتگیریی لێ دەکــرد. چوونکە نەدەگونجا لــە لایەک ڕێژیم پشــتیوانی لە کوردی بەشــێکی کوردســـتان بکا و لە لایەکی دیکەوە تێکۆشەرانی کوردی ئێران ئێعدام بکرێن.

لە ساڵی ١٣٣٨دا ژمارەیەک نزیک بە ٢٥٠ کەس و لە دوارۆژەکانی ســاڵی١٣٤٣دا دەیان کەســی دیکــە کەوتنە بەر پەلامــاری پۆلیس و دەستبەســەر کران و ئەمــە زەبرێکی کاریگەر بوو کــە لە پەیکەری تەشــکیلاتی حیزب دەکەوت. دیارە بێجگە لــەو ژمارەیە کە گیران و زیندانــی کــران، ژمارەیەکی بەرچاویش کە ئــاگاداری ئەو گرتنانەی ســاواکی ڕێژیمی شــا بوون، خۆیان گەیاندە کوردســـتانی باشوور تا ڕۆژەکانی ســەرکەوتنی شۆڕشــی گەلانی ئێران لە دژی ڕێژیمی پاشایەتی لەم بەشەی کوردستاندا مانەوە.

هــۆکاری ئاشــکرابوون و گیرانــی ئــەو ژمارە زۆرە لــە ئەندامان دەگەڕێتەوە بۆ سێ خاڵ:

١. سیســتمی کاری تەشــکیلاتی، زەنجیرەیی بوو. بۆیە بە گیرانی کادری رابیــت و ئێعتــراف کردنــی بە پێوەندییەکانیــان لە گەڵ باقی ئەندامانی حیزب لە ژێر ئەشــکەنجەدا، بەشــێکی زۆر لە تەشیکیلاتی حیرب ئاشکرا دەبوو.

٢. نەبوونی پێوەندییەکی خێرا بۆ ئاگادارکردنەوەی ئەو ئەندامانەی کە پێوەندییان بە کەسی دەستگیرکراوەوە هەبوو.

٣. بوونــی ژمارەیەک ســیخوڕ کە هــەم هەڵســوکەوتی ئەندامانی حیزبیان دەخســتە ژێر چاوەدێری و هەم نفووز درابوونە نێو شــانە حیزبییەکانەوە.

## ■ ٩: کۆنگرەی دووەمی حیزب (١٣٤٣)

کۆنگرەی دووەم لە مانگی سەرماوەزی ١٣٤٣ لە گوندی «سونێ» لە کوردستانی عێراق بەسترا و ئەم کۆنگرەیە بە «کۆنگرەی لادان لە ڕێبازی حیزب» ناسراوە، لە بەر ئەوەی لە ساڵی ١٣٣٩ تا ١٣٤٩ حیزبی تووشی وەزعێکی ناڵەبار کردبوو کە بێجگە لە هێندێک لە ڕێکخراوەکانی حیزب کە دژی سیاسەتی ئەو کاتە خەباتیان دەکرد، حیزب کەوتبووە گێژاوێکەوە کە هەر وا بزانە رابردووی خۆی لە بیر بردۆتەوە. زیانی هەڵسووڕانی سەرۆکایەتیی ئەو چەند ساڵەی حیزب بۆ هەموو ڕێکخراوەکان و گشت جووڵانەوەی کورد و کوردستانی ئێران یەکجار زۆر بوو.

سروشتە تایبەتییەکانی ئەم لادانە!

حیزب تووشی ناسیۆنالیزمێکی بەرچاوتەنگ ببوو کە دژی دێمۆکراسی بوو. ئەوەی پێوەندیی بە بیری پێشکەوتنخوازانەوە هەبا دژی بوو، تا ئەو جێگایە کە ئەگەر کەسێک بە دژی سەرۆکایەتیی ئەو کات نەزەرێکی دەربڕیبایە، بە دوژمنی کورد ناو دەبرا.

ئۆرگانی کومیتەی ناوەندی دەرنەدەچوو، ڕۆژنامەی «کوردستان» کە میراتی کۆماری کوردستان بوو، وە لا نرابوو، «پەروەردەی کادر» بوونی نەبوو و لەو ماوەیەدا بۆ نموونە یەک کەلاسی کادریش پێک نەهات، یان نامیلکەیەک بۆ بەرزکردنەوەی پلەی زانیاریی ئەندامانی حیزب بڵاو نەدەکرایەوە.

ئوسوولی حیزبی بە تەواوی لە ژێرپێ نرابوون. سانترالیزمی دێموکراتیک کە پێوەندییەکانی نێوان سەرۆکایەتی و ئەندامانی حیزب دیاری دەکرد، تەنیا سانترالیزمێکی توندوتیژ کە شێوەی تاکڕەوانەشی هەبوو، بەجێ مابوو. هەموو کارەکانی حیزب شێوەی فەردی هەبوو بڕیار بە فەردی دەدرا و بە فەردی جێبەجێ دەکرا. کۆبوونەوەی حیزبی بە مانای ڕاستی خۆی لە گۆڕێدا نەمابوو.

فەزایەکی پۆلیسی زاڵ بوو بە سەر پێوەندییەکانی نێو حیزبدا.
ئەم وەزعە نالەبارە کە حیزب لەو ماوەیەدا تووشی ببوو، زیانێکی زۆری گەیاندە جووڵانەوەی کوردسـتانی ئێران و دوای خست دوو هۆکاری ئەساسیی هەبوو.
١. سـەرۆکایەتی کـە دوور بـوو لـە وڵات، لە بارەی سیاسـی و فیکرییـەوە یەکپارچـە نەبوو، ناکۆکیـی ناو حیزبە نیشـتمانییەکانی کوردسـتانی عێراق شوێنی خراپی لە سـەر بیروباوەڕ و کردەوەی بەڕێوەبـەران و کادرەکانـی حیـزب دانابـوو و دووبەرەکیی لە نێو ئەندامانـی حیزبـدا پێک هێنابوو. بەشـێک مەلایی و بەشـێک ببوون بە جەلالی و زۆر جار هێرشـیان دەکردە سـەر بارەگاکانی یەکتر لە کوردستانی عێراق.
٢. پشتیوانیی سەرۆکایەتیی پارتی دێموکرات لە عەبدوڵڵا ئیسحاقی ببووە هۆی ئەوەی کە ناوبراو دەسەڵاتی تەکرەوانەی خۆی بە سەر ئەنداماندا بسەپێنێ.
کۆنگرەی دووەمی حیزب لە هەلومەرجێکدا پێک هات کە شـێوەی بانگکردنـی ئەندامان هیچکام لـە پێوەرەکانی پێویسـتی تێدا رەچاو نەکرابـوو. نوێنەرانـی کۆنگـرە بـە چەشـنێک هەڵبژێردرابوون کە پەیڕەوی بیروباوەڕی سـەرۆکایەتی بن. زۆرکەس لەوانەی کە مافی بەشـداربوونیان لە کۆنگرەدا هەبوو، لەم مافە بێبەش کران. هێندیک کە پێش لەو ماوەیە بۆ بەشداریی کۆنگرە هاتبوون بە زۆری تفەنگ دەرکران.
بڕیارەکانی کۆنگرە لادان لە ڕێبازی حیزب بوو. ئەو بەرنامەیە کە دانرابوو لە کۆنگرەدا، پایەیەکی سیاسـی نیزامیی هەبوو و زۆرتر لە بەرنامەی حیزبێکی ناسیۆنالیسـتی تۆخ دەچوو کە لەگەڵ رابردووی پێشکەوتنخوازانەی حیزب یەکی نەدەگرتەوە. هێندێک بڕیاری لە سەر چەند دڵسـۆزێکی حیزب لە کۆنگرە دەرکران کە نموونەی زاڵبوونی

ئیدەی پۆلیسی لەم کۆنگرەیەدا بوو. لە نموونەکانی ئەو بڕیارانە دەتوانین بە تۆمەتبارکردنی پێشەوا قازی محەممەد بە خەیانەت، دەرکردنی دوکتور قاسملوو لە حیزب، دیاریکردنی مەلا مستەفا بارزانی، ڕێبەری شۆڕشی کوردستانی باشوور وەکوو سەرۆکی حیزب و مامۆستا هەژاری شاعیر وەکوو ئەندامی ڕێبەری ئاماژە بکەین (کە هەر ئەندامی حیزبیش نەبوون و بۆ خۆیان لە کۆنگرەشدا بەشدار نەبوون و دواتریش ئەو بڕیارەیان رەت کردەوە. مامۆستا هەژار پێی ڕاگەیاندبوون کە ئەو نەک هەر خۆی بە ئەندامی حیزب نازانێ، بەڵکوو لە بنەڕەتدا خۆی بە کوردی ئێرانیش نازانێ).

**■١٠: جووڵانەوەی ٤٦-٤٧ تابۆی لەشکان نەهاتوویی دەشکێنێ**

جووڵانەوەی ساڵەکانی ٤٧.٤٦ یەکێک لە ئازایانەترین جووڵانەوەکان بە دژی ڕێژیمی پاشایەتی بوو. ئەم جووڵانەوە لە هەلومەرجێکدا هاتە ئاراوە کە کوودەتای ٢٨ی گەلاوێژی ساڵی ١٣٣٢ سەرکەوتبوو. ڕێژیمی پاشایەتی لە ناوچەکانی دیکەی وڵات دەسەڵاتی تەواوی هەبوو و لە باری نێونەتەوەییەوە لە وەزعێکی زۆر باشدا بوو. لەگەڵ زۆربەی وڵاتانی شەرق و غەرب پێوەندیی دۆستانەی هەبوو، هەر بۆیە بە ئاسوودەیی هەموو هێز و توانای نیزامیی خۆی ڕوو کردە کوردستان و لەم بارەوە دەکرێ بڵێین، جووڵانەوە لە هەلومەجێکی نامۆناسیبی نێوخۆیی و نێونەتەوەییدا دەستی پێکرد.

جووڵانەوەی ٤٧.٤٦ تا ڕادەیەک لە ڕووی ناچاری و بە پەلە و بە بێ زەمینەسازی دەستی پێ کرد. بەڵام دیسانیش توانی ١٨ مانگ دەوام بێنێ و ڕێژیم لەگەڵ نیگەرانی و خەسارەت بەرەوڕوو بکا. ئەم جووڵانەوە نیشانی دا کە ئیدیعای قەدەر قودرەتیی ڕێژیمی پاشایەتی و دام و دەزگای جەهەننەمیی ساواک کە بە وتەی «دیوار موش دارد، موش هم گوش دارد» خەڵکیان تۆقاندبوو، فڕوفیشاڵ و ئەفسانەیەک

زیاتر نیە. ئەم ئەزموونە نیشانی دا کە ڕێژیمی پاشایەتی ئەوەندە بەهێز و زەربەناپەزیر نیە و لە ئاکامی ئەم جووڵانەوەیەدا بوو کە شانە چریکییەکانی موجاهیدین و فیداییەکان ساز دران و جەریانی «سیاکەل»ی لێ کەوتەوە.

دەرسی دیکەی جووڵانەوەی ٤٦-٤٧ ئەوە بوو کە نیشانی دا خەڵکی کوردستان چ ورەیەکی بەرز و پوتانسیێلێکی شۆڕشگێڕانەیان هەیە و ڕێبەرانی جووڵانەوەش نیشانیان دا کە چەندە شۆڕشگێڕ و خەباتکاری ڕاستەقینەن. ئەوان بە بەربەرەکانی تا دوا هەناسە نیشانیان دا کە چەندە فیداکار و لەخۆبردوون.

شۆڕشگێڕانی ٤٦-٤٧ لە جەریانی دەستپێکی شۆڕش، لە چەند نامەیەکدا پێوەندی بە شەهیدی نەمر دوکتور قاسملوو دەکەن و لێرە وەک نموونە نامەی کاک «ئیسماعیل شەریفزادە» کە ساڵی ١٣٤٧ لە گوندی دارینەی بانە لە گەمارۆی ٥٠٠ کەس لە هێزەکانی ڕێژیمی پاشایەتی، پاش شەش ساعەت بەربەرەکانی لەگەڵ سێ هاوڕێی پێشمەرگەیدا شەهید بوو، دەخەمە بەرچاو:

> «.. ئەوڕۆ تۆفانێکی بە تەوژمی شۆڕشگێڕانە سەرانسەری وڵاتەکەمانی داگرتووە و هەموو لایەک بە هومێدێکی بێپایانەوە دەڕواننە خەباتی نەتەوەکەمان و ئەگەر بێت و بە شێوەیەکی عیلمی و دڵسۆزانە بە ڕێوە ببرێت و تێکۆشەرە دڵسۆزەکان و تێگەیشتوو و پێگەیشتووەکانی سیاسی و ڕووناکبیرە شۆڕشگێڕەکان بێنە کایەوە و جڵەوی کاروبار بە دەستەوە بگرن، ئەودەم داری هومێدی هەموو لایەک بە تەواوی وە بەر دێ و نەتەوەکەمان بە ئامانجی خۆی دەگات».

نامەی شەهید «سولەیمان موعینی» بۆ کاک د.قاسملوو:

«برای بەڕێز و خۆشەویست، کاک دوکتور ڕەحمان!

لە پاش سڵاو هیوادارین ساغ و سلامەت بن. بەو بۆنەوە

باشـــترين ســـڵاومان هەيە بۆ گشــت برايان. ئەحواڵى خاو و خێزانــى ئێمــە پرســيار بكەى لــە ژيانێكــى پڕ لە پەرۆشــى و پــەژارەدا شــەو و رۆژ دەكەينــەوە لــە بــەر ئــەوەى هيچ ئيمكاناتێكمان نيە و مريشكيش دەنووك بە سەرمان دا ئەدا و خەريكن بێكۆڵن. ماڵى قولى دراوسێمان پاڵەپەستۆمان ئەدەن و تەنگيــان پێ هەڵچنيويــن، منداڵە وردەكــەى دنيايان بە دار و لاســتيق تێ بەر داويــن و بە هەمــوو تواناياناەوە خەريكى بنكۆڵ و دەركردنمانن. لەو خانووە كە مافى باب و باپيرمانى پێــوە هەيــە، بــە قەولى خۆمــان ماڵيان لە خانەخــوێ حەرام كــردووە و لەو لايشــەوە زۆريان نۆكەر و دەســتوپێوەنديى مــل ئەســتووريان بۆ گرتوويــن، هەمــوو رۆژێ دەورى ئەو خانووە ئــەدەن، دەرگاو پەنجەرەيان پێوە نەهێشــتووە. ئێمە ئــەوا تەنيــا بە برســێتى و رووتى و نەدارى هەموو شــتمان وەمل گرتووە و رێگاى هاتنەژووريان نادەين. دراوسێكانيش وەک ماڵــى مام شــەريف و ئەوانە بن ئەوانيــش كە بڕياريان دابوو لە راســت ئەو خانووەوەى ئێمە چاو بنووقێنن و داواى بــەش و دەركردنى ئێمــە نەكەن، بەڵام ماڵى قولى ئەو رۆژانە هەندێكيان لە زار گوشيون. ناكرێ بڵێم بەرهەڵستيمان ئەكەن، بەڵام ئەوەى پێشتر گوتوويانە ئەيڵێنەوە.

خــۆ بە ناشــوكرى نەبــێ ئێمــەش فريادڕەســێكمان نيە بە دادمــان بگا، رەحمى خــواى نەبێ. بەڵام بەخوا هەتا كەلاكمان نەكــەوێ، ئــەو خانــووە قوراويە كــە ئيرســى ئەژدادمانە و دڵمان پێوەيەتى، بە گەنجينەى دنياى نافرۆشــين. تا ئێســتاش بەهانەيــان پێگرتوويــن منداڵيــان ناردووينە ســەر بەڵام هەر بۆ خۆيان تێشــكاون. منداڵەكانى ماڵى خۆمان بەرهەڵســتێكى پياوانەيان كردوە».

■ شیکردنەوەیەک بۆ راپەڕینی چەکدارانەی ٤٦ ٤٧
لە راپۆرتی کومیتەی ناوەندیدا بۆ کۆنگرەی سێهەم

راپەڕینە چەکدارانەکەی سالانی ٤٦ ٤٧ لە مێژووی خەباتی حیزبەکەماندا دوای کوودەتای رەشی گەلاوێژی ١٣٣٢ بێ وێنەیە و بە لاپەڕەیەکی پڕ لە شانازیی خەباتی گەلەکەمان و گەلانی ئێران دژی دەسەڵاتی سەرەڕۆی پاشایەتی دادەنرێ.

لەم راپەڕینەدا کە هەژدە مانگی خایاند، زۆر کادری بەنرخی وەک سمایلی شەریفزادە، مەلا ئاوارە، سولەیمان موعینی و عەبدوڵلای موعینی و بە دەیان ئەندامی تێکۆشەری حیزب شەهید کران و سەریان لە رێگای بیروباوەڕیاندا دانا و بە هەزاران کەس گیران و جەزرەبە دران و لە دادگای نیزامیی زەمانی شەڕدا بە مەرگ یان حەبسی دوور و درێژ مەحکووم کران، یان لە کوردستان لە نێو کەس و کاریان هەڵقەندران و بۆ مەڵبەندەکانی دیکەی ئێران دوور خرانەوە.

لە بیرەوەریی ئەو کارەساتە خۆیناوییەدا بە پێویستی دەزانین شیکردنەوەیەکی راپەڕینەکە پێشکەش بە هاونیشتمانانی تێکۆشەر بکەین بۆ ئەوەی لەگەڵ بیرەوەریی فیداکاری و گیانبازیی رۆڵەکانی حیزب و گەلەکەمان، هەڵە و کەموکۆڕییەکانی رابردوومان دەستنیشان کردبێ تا لە قۆناغی ئێستا و داهاتوودا دووپاتە نەبنەوە. ریزی هەرە گەورە لە شەهیدانی رێگای ئازادیی گەلەکەمان بەرز راگرتنی ئاڵای خەبات و کۆڵنەدانە بۆ وەدیهێنانی ئەو ئاواتانەی هاورێیانی حیزبی و رۆڵەکانی گەل گیانی شیرینیان لە پێناویاندا بەخشی، راستکردنەوەی هەڵەکان و نەهێشتنی کەموکۆڕی و ئامادەیی هێرشبردن بۆ سەر دوژمن، دەبنە هۆی ئەوە کە گەلەکەمان لە چوارچێوەی ئێرانیکی دیموکراتیکدا بە خودموختاری بگا و ئاواتی شەهیدانی رێگای ئازادیی کورد و شەهیدانی رێگای ئازادیی ئێران بێتە دی.

■ هەلومەرجی عەینیی سەروبەندی دەستپێکردنی جووڵانەوە

دەستپێکردن بە جووڵانەوەی چەکداری لە سەرەتای ساڵی ٤٦دا، بەرهەمی لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی عەینیی وڵات بە شێوەیەکی گشتی نەبوو، بەڵکوو بەرهەمی لێکدانەوەی بەشێکی کادر و ئەندامانی حیزبی، ئەویش لە کوردستانی عێراق بوو. ئەم هەڤاڵانە لە بەر وەزعێکی کە لە ئەنجامی سیاسەتی راونان و گرتن و تەحویلدانەوەی تێکۆشەرانی کوردی ئێران لە لایەن رابەرایەتیی جووڵانەوەی کوردستانی عێراقەوە تووشی هاتبوون، بڕیاریان دا چەکدارانە بگەڕێنەوە وڵات. راستە گەلی کورد لە کوردستانی ئێران لە ژێر ستەمی نەتەوایەتی و چینایەتیدا دەیناڵاند و وێڕای گەلەکانی غەیرە فارسی ئێران لە هەموو هەقێکی نەتەوایەتی بێبەش بوو، ئازادیيە سەرەکییەکانی بەشەر بە بێشەرمی لە لایەن کاربەدەستانی رێژیمەوە پێشێل دەکران و بە هەزاران رۆڵەی ئازادیخوازی کورد و غەیرە کورد لە سیاچاڵەکانی رێژیمدا بوون، بەڵام تەواوی ئەوانە بە مانای ئامادەبوونی وەزعێکی عەینیی لەبار بۆ راپەڕین نەبوون. لەوکاتەدا ناکۆکیی نێوان دەزگای حاکمە و خەڵک هێندە توندوتیژ نەبوو کە بگاتە سنووری پێکهەڵپڕژان و تەقینەوە. ئەو قەیرانە گشتییەش لە گۆڕێدا نەبوو کە نە چەوساوە و ژێردەستەکان ئامادە بن وەک پێشوو بژین و نە چەوسێنەران بتوانن بە کەیفی خۆیان وەک رابردوو لێخوڕن. کاتێک وەزعی گشتیی عەینی لە ئێرانێکی پان و بەریندا ئاوا بۆ راپەڕین نالەبار بێ، هەڵاواردنی کوردستان و دانی حوکمی ئەوە کە وەزع توندوتیژە و بۆ شۆڕش ئامادەیە، حوکمێکی دوور لە مەنتیق و حەقیقەتە.

بوونی پشتی جبهە و کاناڵ بۆ پێوەندیی دەرەوە و هێنانی یارمەتی، یەکێک لە پێداویستییە سەرەکییەکانی هەر جووڵانەوەیەکە. کوردستانی عێراق بە هۆی سیاسەتی چەوتی رابەرانی جووڵانەوەی

کوردستانی عێراق نەک هەر ئەو پشتی جبهەیە نەبوو کە یارمەتیدەری جوولانــەوەی کوردســتانی ئێران بــێ و ببێ بە رێــگای دابینکردنی پێداویســتییەکانی جوولانەوە، بەڵکوو بە گوێــرەی بڕیاری بارزانی، سەرانســەری ســنوور لە کــوردە راپەڕیوەکانی کوردســتانی ئێران گیرابوو بۆ ئەوەی نەتوانن کەڵک لە کوردستانی عێراق وەک کاناڵێک بۆ پێوەندیی دەرەوە وەربگرن.

لێرەدا پێویستە ئەمەش وە بیر بخەینەوە کە جوولانەوە بە جیددی داوای یارمەتیــی هەمەچەشــنەی لە هێزەکانی ئۆپۆزیســیۆن کرد و تەنانــەت هێندێــک بەڵێنیــی پێ درا، بــەڵام بەداخەوە ئــەو بەڵێنییانە هــەر وا مانەوە و یارمەتییەکی کە کۆمەک بە مانەوە و بەهێزبوونی جوولانەوە بکا، لە گۆڕێدا نەبوو. دەرکردنی بەیاننامە بۆ رای گشتی ســەرنجی بیروڕای جیهانی بۆ لای کارەســاتی کوردستانی ئێران و پێکهێنانــی خۆپیشــاندان دژی رێژیــم لە ولاتانی ئورووپــا و .. تەنیا یارمەتییەک بوون کە بە جوولانەوەی گەلی کوردی ئێران کرا.

■ هەلومەرجی زەینیی ولاتەکەمان لە سەروبەندی جوولانەوەدا

لە ســەروبەندی دەســتپێکردنی جوولانەوەی چەکداریی ٤٦ ٤٧دا پــێ بــە پێ لەگــەڵ لەبــار نەبوونی وەزعــی عەینی بــۆ جوولانەوە، وەزعی زەینیش لەبار نەبوو. هێزە سیاسییەکانی دژی رێژیم تووشی دووبەرەکــی ببــوون و داوێنــی تێکۆشــانی دژی رێژیمیان بە هۆی سیاســەتی راونان و کوشــتوبڕی حکوومەتەوە هەر دەهات تەسکتر دەبــوو. هیچ هاوکارییەکی عەمەلی و نزیکییــەک لە نێوان هێزەکانی سیاســیی دژی رێژیم هەستی پێ نەدەکرا. لە کوردستانیش گرتن و راونانــی ئەندامانی حیزبی لە رەشــەمەی ٤٢ و بەهاری ١٣٤٣ بووە هۆی ئەوە کە ســەدان کەس بگیرێن و بە سەدانیش پەڕیوەی عێراق بن.

کادر و ئەندامانی راکردوو، چ ئەوانەی ١٣٣٨ بەرەو عێراق چووبوون

و چ ئەوانەی لە ١٣٤٢ەوە رۆیشــتن، لــە جیاتی ئەوەی عێراق بکەنە پێگە بۆ ســازکردنەوەی پێوەنــدی و پێکهێنانی رێکخــراوی حیزبی، کەوتنە گێژاوی دووبەرەکی و هێندە سەریان بە گیرەوکێشەی عێراق گــەرم بوو کــە زیندووکردنەوەی رێکخراو لە کوردســتانی ئێرانیان وەک ئەرکی سەرەکی لە بیر چووەوە.

«کوردایەتــی» کردن و دوژمنایەتیی بیروباوەڕی پێشــکەوتووانە بــوو بە بنێشتەخۆشــکەی زۆربەی رێبەرایەتیــی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە گەرمێن. هەر لە ژێر تەئسیری ئەم بۆچوون و لێکدانەوەشدا بوو کە رابەرایەتیی ئەو سەردەمەی حیزب و زۆربەی کادر و ئەندامانــی پەڕیــوە، ئەرکی خەبات لە وڵات و بووژاندنەوەی حیزبیان لە ئێران خســتبووە پشــت گوێ و بۆ کوردســتانی عێراق خەریکــی خەبــات وجبهەوانــی بوون، بــەو هیوایە کــە گۆیا جارێ کوردستانی عێراق دەگەیەنینە پلەیەک و پاشان بە یارمەتیی کوردی عێراق کوردستانی ئێرانیش یەکلا دەکەین.

ئەو رابەر و کادر و ئەندامانە ئەگەر جاروباریش رێگایان کەوتباوە وڵات یــان بــۆ فەعالیــەت هاتبان، زیاتــر مەبەســتیان کۆکردنەوەی یارمەتی و شرەوبرە و بژێوی بۆ راپەڕینی کوردستانی عێراق بوو، نەک کار و باری بنەڕەتی یان واتە پێکهێنانی رێکخراو لە کوردستانی ئێراندا.

بەربەرەکانــێ دژی ئــەم چەشــنە بۆچوونــە بــوو کــە بەرەبەرە جموجۆڵ پێک دەهات، ئەم مەســەلەیە کە کاری بنەڕەتیی ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران، کاری سیاسی و رێکخراوەیی لــە ئێراندایە، هەر دەهات لایەنگــری زیاتر دەکرد. بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشــانی ئــەو کادر و ئەندامانەی کە لایەنگــری ئەم رێبازە بوون، ســازکردنی رێکخراو لە دەوروبەری شــارەکانی سەردەشــت، بانە، مەهاباد و شاپوور (سەلماس) بوو.

راست لەو کاتەدا کە هیوای دواڕۆژێکی گەشەدار لەو چەشنە خەباتە دەکرا، رابەرانی جووڵانەوەی کوردستانی عێراق ڕێگای گرتن، راونان، دوورخستنەوە و تەحویلدانەوەی کوردە تێکۆشەرەکانی ئێرانی گرتەبەر. ئەم هێرشە ناجوامێرانە بوو بەهۆی ئەوەی کە هێندێک لە کادر و ئەندامانی حیزب بە سەرکردایەتیی شەهید سولێمانی موعینی بەرەو وڵات بگەڕێنەوە. گەڕانەوەی سولێمان و هەڤاڵانی بوو بە هۆی ئەوە کە لێپرسراوانی جووڵانەوەی کوردستانی عێراق توند و تیژی بەرانبەر بەو کوردە ئێرانییانە زیاد کەن کە بیری تێکۆشانی دژی ڕێژیمی شایان لێ دەکردنەوە. هەڤاڵ مەلا رەحیم (ویردی)، قوربانیی ئەو سیاسەتەی لێپرسراوانی جووڵانەوەی عێراق دەرهەق بە تێکۆشەرانی کوردی ئێران بوو.

زیادکردنی فشار و گوازتنەوە و خستنە ژێر چاوەدێریی ئەو کادر و ئەندامانەی کە لە عێراق وەک پێگە بۆ کاروباری ئێران کەڵکیان وەردەگرت، بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەم دەستەیەش مەترسیی گرتن و تەحویلدانەوەیان ببوو بە جیددی، لە کاتێکدا کە ڕێکخراوی ساوای حیزبی تەنیا لە بەشێکی چکۆلەی کوردستاندا پێک هێنرابوو، بەرەو ئێران بگەڕێتەوە.

ئاشکرایە ئەم ڕێکخراوە ساوایە، لەگەڵ ئەو کادر و ئەندامانەی کە لە پێشدا گەڕابوونەوە وڵات سەرەڕای هاوکاری و یەکگرتن، دیسان ئەو کەرەستەیە نەبوون کە جووڵانەوە لە سەر شان و شەپیلکیان خۆ راگرێ و ئەو هێزە نەبوون چ لە باری مادی و چ لە باری مەعنەوییەوە کوردستانێکی پان و بەرین داگرنەوە و زەمینەی زەینی لە چوارچێوەی کوردستاندا ئامادە بکەن. بە گرتنە بەرچاوی مەیدانی تێکۆشانی جووڵانەوە و بەراوردی لەگەڵ کوردستان و گرینگتر لەوەش لەگەڵ ئێران، پلەی مەترسیی ئەو کارە و گرینگیی ئەو بارە قورسە کە دەکەوتە سەرشانی جووڵانەوە و رابەرایەتییەکەی، زیاتر

دەردەکەوێ.

زۆر بە جێیە ئەم مەسەلە بنچینەییەش وە بیر خەینەوە کە هەڤالانی بەشـدار لە سەرکردایەتیی راپەڕینەکەدا، هەر چەند ئەندامی حیزبێک بوون، بەلام هاوبیر و هاوکردەوە نەبوون و بە شـێوەیەکی تێکڕایی پێڕەوییان لە تیئۆرییەکی زانستی و شۆڕشگێڕانە نەدەکرد کە بەردی بناغەی هەر کردەوە و راپەڕینێکە و بەرنامەیەکی سیاسی و روونیان نەبـوو کـە لە رێگای رێکخـراوەوە بیگەیەننە کۆمەلانـی خەلک و لە رێگایەوە کار لە مێشک و هەستیاندا بکەن و هێزیکی مادی پڕ توانای لێ پێک بێنن، بەم جۆرە دەردەکەوێ کە ئاسۆی جوولانەوەکە چەند تاریک بوو.

راسـتە هەلسـووڕێنەرانی جوولانەوە لە کۆنفرانسـێکدا کە دوای گەڕانەوە بەسـتیان، ریزە بڕیارێکیان بۆ شـکلی کارکردن و دابەشی کار دەرکـرد، بەلام لە نێوان بڕیاری کوتوپڕ و دیاریکردنی ئەرک و مل راکێشـان بۆ دیسـیپلین و وازهێنان لە نەزەری شەخسیدا فەرق زۆرە. هەڤـالان نەیانتوانیبوو واز لـەو بیروباوەڕ و کردەوانە و لەو هەستان و دانیشتنە بێنن کە لە ماوەی سالەکانی دەربەدەریدا قەدیان پێوە گرتبوو. هەر بۆیەش زوو زوو بایان دەدایەوە سـەر بۆچوون و لێکدانەوەی پێشوویان.

■ هەلەکانی رابەرایەتیی جوولانەوە

١. گرتنە پێشی سیاسەتی دیفاعیی پاسیڤ

مارکس دەلێ: پێویسـتە بەر لە شـۆڕش هەموو پێداویسـتییەکانی شـۆڕش بگریە بەرچاو، پاشان دەست بە شـۆڕش بکەی. ئەگەر بە بێ ئەم کارە دەسـتت بە شـۆڕش کرد، تاقە رێگای بێ ئەملاوئەولا هێرشە. دیفاع مەرگی راپەڕینی چەکدارانەیە.

رابەرانـی جوولانـەوەی ٤٦ ٤٧ لـە سـەر کەمئەزموونـی و کەمدەرەتانی، هەر لە سـەرەتای کارەوە تووشـی ریـزە هەلەیەکی

تاکتیکیی زەق و بەرچاو هاتن کە لە باری ستراتیژییەوە بوو بە هۆی فەوتانیان. کادر و پێشـمەرگەکان کاتێک کوردستانی عێراقیان بەجێ هێشـت یان پێیان بەجێ هێڵرا و گەڕانەوە کوردسـتانی ئێران، تەنیا بـۆ باوباوێن و ئەم دێ و ئەو دێ کـردن نەگەڕانەوە وڵات، بەڵکوو بە مەبەستی دەستپێکردنی خەباتی چەکدارانە گەڕانەوە وڵات. راستە چەکوچۆڵیـان لە بەرانبەر چەکوچۆڵی دوژمندا شـتێک نەبوو، بەڵام ورەی دوژمنیـش ئـەو ورەیە نەبـوو کە دوایە پەیـدای کرد. کاتێک دەسـتەیەکی دژی رێژیـم لـە دەرەوە دەگەڕێتەوە و ئـەولا و ئەملا دەکەن، خۆیان هەر ناوێکی لێ بنێن، دوژمن ئەو کردەوە بە راپەڕینی چەکـداری دژی خۆی دادەنێ و بۆ نەهێشـتنی هەوڵ دەدا. هەڤاڵانی راپەڕیـو لـە جیاتـی ئەوەی هـەر لە سـەرەتادا چوار پێنـج زەبری گورچووبڕی وێنەی شـەڕی سپیسـەنگ، هەر خۆیان لەم لاوئەولا حەشـار دەدا و جاروباریش بە دزی سنووری کوردستانی عێراقیان دەپەڕاند و لە گەرمێن دەحەسانەوە! لە کاتێکدا کە دوژمن دوای ئەو زەبرە، زۆربەی پاسـگا لاوازەکانی خۆی هەڵگرتن و پاشەکشەیەکی کاتی و تاکتیکیی دەست پێ کرد.

خۆبواردن لە شـەڕ و گرتنەپێشی سیاسەتی دیفاعیی پاسیڤ بوو بە خۆرەیەک کە هەم جووڵانەوەکەی دەخوارد و هەم کاری دەکردە سـەر هەسـت و مێشـکی ئەو خەڵکەی کـە بە گوێـرەی توانا نوای راپەڕیوەکانی دەدا.

٢. پـاک نەکردنـەوەی مەڵبەنـدی جووڵانـەوە لە هاودەسـتەکانی رێژیم

رابەرانی جووڵانەوە لە ماوەی هەژدە مانگدا بێجگە لە چەند هەنگاوی سـەرەتایی هەوڵی خاوێنکردنەوەی مەڵبەندی تەسکی جووڵانەوەیان نـەدەدا. سسـتی و خاوی بەرانبەر بەوانەی پیـاوی دوژمن بوون و کردەوەی دژی جووڵانەوەیان شـاراوە نەبوو، دەبوو بە هۆی ئەوە

کــە ڕێژیم زیاتر ئەوانە لە گیانی کادر و لێپرســراوە پێشــمەرگەکان بەردا و بۆ لای خۆیان ڕابکێشــی. سەیر ئەوەیە لە هێندێک مەڵبەندا مەلایەکی جاســووس بە ناوی ئەوەی کە خاوەنی خزم و کەســە و ئاغایەکــی خۆفرۆش بــە ناوی ئەوەی خزم و عەشــیرەتی زۆرە، لە سزادان و لەناوبردن معاف بوون. نەبوونی بڕشت بۆ پاککردنەوەی مەڵبەنــدی تێکۆشــان بوو بــە هۆی ئەوە کە ڕۆڵــەی وەک ئاوارە لە داو بخرێ و هەڵمەت و مەلا ڕەحیم فریوی ئاغا و مەلای خۆفرۆش بخۆن و واز لە ریزی جووڵانەوە بێنن.

٣. نەبوونــی بەرنامــەی روون لــە باری مەســەلەکانی سیاســی، ئابووری و کۆمەڵایەتی

بەرنامەیەکی روونی سیاســی، ئابــووری و کۆمەڵایەتی لە گۆڕێ نەبوو. تەبلیغاتی گشتیی ڕابەرانی جووڵانەوە لە باسی بەشخوراویی گەلەکەمــان و پێویســتیی گەیشــتن بە مافــی نەتەوایەتــی و ئازادی بە شــیوەیەکی موتڵەق تێپەڕ نەدەبوو. جووڵانــەوە بەرنامەیەکی بۆ وەرزێڕان نەبوو کە ٩٠ لەســەدی گرانایی ڕاپەڕینیان لە ســەر شان بــوو. وەرزێڕی مەڵبەندی ڕاپەڕیــن نەیدەزانی ڕاپەڕین چ دیارییەکی بۆ ئەو لە هەگبەدایە و سبەینێ لەگەڵ ئاغا تەکلیفی چییە؟

ڕابەرانی جووڵانەوە لەم مــاوەی درێژەی جووڵانەوەدا گۆڤارێک، ڕۆژنامەیەک، تەنانەت دوو سێ بەیاننامەیان سەبارەت بە ئامانجەکانی جووڵانــەوە لە مەڵبەندی جووڵانەوە و لــە وڵاتدا بڵاو نەکردەوە. بۆ ئەوەی دۆســت و دوژمن بزانن ئەو چەند دەســتە چەکدارەی دێن و دەچن و دەکوژن و لێیان دەکوژرێ، دەڵێن چی و چییان دەوێ؟ (لە ماوەی جووڵانەوەی چەکداریــدا تەنیا بەیاننامەیەکیان بڵاو کردەوە) کەمتەرخەمی لەو مەسەلەشــدا هەر دەگەڕێتەوە ســەر ناشارەزایی ڕابەرانی جووڵانەوە و نەدیتنی نەخشەی ئاگادارکردنەوە و ڕاکێشانی سەرنجی خەڵک بۆ لای داخوازییە ڕەواکانی جووڵانەوە.

٤. بە هێند نەگرتنی دامەزراندنی ڕێکخراو و بەرینتر کردنی مەیدانی تێکۆشان

جووڵانــەوەی ٤٦ ٤٧ بە کردەوە ئەهمیەتی پێویســتی بە ڕێکخرای نهێنی نەدا و بوونی چەکدارەکان لە مەڵبەند بوو بە هۆی ئاشکرابوونی زۆربــەی ئەوانــەی پێوەندییان بە حیزبەوە بوو. بێجگە لەوەی کە بۆ بەرینترکردنی دایرەی تێکۆشــانی حیزبی هەنــگاو هەڵنەبڕا و کاری ڕێکخراوەیی و نیزامی هەر لە ســنووری ئەو مەڵبەندانەدا مایەوە کە بــەر لە گەڕانــەوە کاریان لێ کرابوو، بۆ بەرینترکردنی تەشــکیلاتی حیزبی لە مەڵبەندی تێکۆشانیشــدا کارێک نەکــرا. دیارە تەنگەبەریی ئــەو مەیدانــەش کاری گەمــارۆدان و ســەرکوتکردنی جووڵانەوەی هاســانتر دەکــرد. بۆ تاریــخ دەبێ بگوترێ کە لەگــەڵ هەمووی ئەو کەموکوڕییانــەش، کۆمەڵانی زەحمەتکێشــی گەلی کــورد بە هەموو توانــای خۆیانــەوە داڵــدەی تێکۆشــەرانیان دەدا و پشــتیوانییان لێ دەکردن.بەڵام بە داخــەوە ڕابەرانی جووڵانەوە نەیانتوانی کەڵک لەو یارمەتییە بێ دریغەی زەحمەتکێشانی گەلەکەمان وەربگرن.

■ ئەو دەرســانەی کە دەبێ لە جووڵانەوەی ســاڵەکانی ٤٦ ١٣٤٧ وەریان بگرین:

١. بــۆ ئــەوەی جووڵانەوەیەکی شۆڕشــگێری بەرەو ســەرکەوتن بچێ، پێویســتە ئەو جووڵانەوە لە لایەن حیزبێکەوە بەڕێوە بچێ کە خاوەنی بیروباوەڕی پێشکەوتووانە و شۆڕشگێڕانە بێ. بە بێ حیزبی شۆڕشــگێڕ و بە بێ چەکداربــوون بە بیروباوەڕی پێشــکەوتووانە، جووڵانەوەی شۆڕشگێڕانەش لە ئارادا نیە.

٢. بــۆ ئەوەی شــۆڕش لە وڵاتێکی پــان و بەرین و فرەگەلی وەک ئێرانــدا ســەرکەوێ، وجــوودی بەرەیەکــی یەکگرتــووی هێزەکانی میللی و پێشــکەوتوو پێویســتە، بەرەیەک کە نەک بە قســەو لە سەر کاغەز، بەڵکوو لە مەیدانی کردەوەدا، نەخشــی ڕابەریی جووڵانەوەی

سەرانسەری بگیرێ و کاری ڕێکخستنی هەنگاوەکانی شۆڕشگێڕان لە مەڵبەندە جیاوازەکاندا و ڕێنوێنیی خەبات بەرەو سەرکەوتن بگرێتە ئەستۆ.

٣. بۆ ئەوەی گەلی کورد وەک هێزێک لە شۆڕشی داهاتووی وڵاتدا نەخشی هەبێ و داخوازیەیکانی لە چوارچێوەی ئێرانێکی دێموکراتدا بێنێتە دی، پێویستە ڕێکخراوەکانی حیزبی بە گوێرەی هەلومەرجی نوێ زیندوو بکرێنەوە و ئەندامان بە بیروباوەڕی شۆڕشگێڕی و زانستی تەیار بکرێن.

٤. بوونی بەرنامەیەکی روونی ئابووری و کۆمەڵایەتی، ڕێبازی سیاسیی روون، تاکتیک و ستراتیژی دیار و ئاشکرا ئاسۆی سەرکەوتن تا رادەیەکی زۆر دەردەخەن و دەبنە هۆی ئەوە کە ریزی دۆستەکانی ستراتیژیکی چ لە ناوخۆ چ لە دەرەوە دیاری بێ.

٥. دەستکردن بە شۆڕش هێندە گرینگ نیە، گرنگ درێژەدانە بە شۆڕش. هەر شۆڕشێک هەلومەرجی عەینی و زەینیی بۆ رەچاو نەکرابێ و بە گوترە بە بێ هەڵسەنگاندنی وەزعی خۆ و دوژمن و هەلومەرجی نێونەتەوایەتی دەست پێ کرابێ، سەرکەوتنی نیە و رەنگە تێک بشکێ.

## ■ ١١: گەڕانەوەی دوکتور قاسملوو و بووژاندنەوەی حیزبی دێموکرات (١٣٤٩ ١٩٧٠)

شۆڕشی ١٩٥٨ی زایینی (١٣٣٧ی هەتاوی) لە عێراق بە سەرۆکایەتیی عەبدولکەریم قاسم لە ١٤ی ژووئیەی ئەو ساڵەدا سەرکەوت و مەلا مستەفا بارزانی کە پاش ١٢ ساڵ لە یەکێتیی سۆڤیێتەوە دەگەڕێتەوە بۆ عێراق، لە پراگ دەبێتە میوانی دوکتور قاسملوو و داوای لێ دەکا ئەویش لە گەڵی بگەڕێتەوە و لەم پێوەندییەدا پێداگریی زۆر دەکا، بۆیە پێکەوە دەگەڕێنەوە بۆ عێراق. لە گەڕانەوەی یەکەمی

دوکتور قاســملوودا عەبدوڵلا ئیسحاقی ناســراو بە ئەحمەد تەوفیق وەک نەفەری یەکەمی حیزب دەمێنێتەوە و لەگەڵ دوکتور قاســملوو کــۆ دەبنەوە بــۆ بووژاندنەوەی حیزب، ئەو هەوڵــە بە هۆی فیکر و بیروبــاوەڕی عەشــیرەیی ئەحمەد تەوفیــق و جیاوازیی بۆچوونیان لەگەڵ دوکتور قاســملوو ســەری نەگرت، پاش ســەر نەکەوتنی لەم هەوڵەدا بە دوکتور قاسملوو ڕادەگەیەنن کە لە ماوەیَ ٢٤ کاتژمێردا دەبیَ عێراق بە جیَ بهێڵیَ. بەم چەشــنە دوکتور قاســملوو لە ســاڵی ١٣٣٩ تا ١٣٤٩ لە دەرەوەی وڵات دەمێنێتەوە و ئاگاداری تێکۆشانی حیزب ئەبیَ.

■ دەرچوونی بەیاننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠

ســاڵی ١٩٧٠ جارێکــی دیکــە دوکتــور قاســملوو دەگەڕێتەوە بۆ کوردســتانی عێراق و لەگەڵ چەند کەس کۆنفرانســی ســێهەم پێک دێنن کە پێکهێنانی ئەو کۆنفرانســە چەند گیروگرفتێکی لە پێش بوو، یەکەم ئەوە بوو کــە ڕێبەرایەتی توانای بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی نەبوو، واتە دەبوا هەموو شــتێک لە ســەرەتاوە دەســت پیَ بکرێت، لە لایەکی دیکەشــەوە باڵی حیزبی تــوودە نفووزێکی زوری هەبوو، واتــە ســانترالیزمێکی بۆرۆکراتیــک لە حیزبدا پێــک هاتبوو کە زور دژی دیموکراســی بوو، هەروەها هەستێکی بەستراوەیی بەرانبەر بە یەکێتیی ســۆڤیێتی و وڵاتانی سۆسیالیســتی پێک هێنابوو، لە لایەکی دیکەوە تێکەڵاوی لەگەڵ شۆڕشــی ئەیلوول لە کوردســتانی باشوور ناســیۆنالیزمێکی بەرچاوتەنگــی تێدا پێک هێنابــوون و ماکیاولیزمی کردبووە باو، بەو مانایە کە لەگەڵ هەموو کەس دەکریَ ڕێک بکەوی و کاریگەری لە سەرت دابنیَ. لەوانەش خەراپتر دوو شتی دیکە بوو کــە ئەندامانی حیزب لە هەموو شــتێک پێیان گرینگتر بوو: یەکێکیان ئــەوە بوو کــە چەک و پارە بۆیــان لە هەموو شــتێک گرینگتر بوو، دووهەم ئەوە بوو کە نووســین و تەشــکیلات هیچ مانایەکی نەبوو.

پێش گەڕانەوەی دوکتور قاسملوو کۆنفرانسی دووهەم گیرابوو و باڵی ناسیۆنالیستی بریتی لە ئەمیری قازی، حەسەن رەستگار، عەبدوڵلا حەسەنزادە و مامۆستا هێمن پێک هاتبوو، لە لایەکی دیکەوە محەمەد ئەمین سراجی کە لە ساڵی ١٣٤٧ چووبووە بەغدا و یوسف رێزوانی کە ئەویش لە بەغدا بوو و کاسبیی دەکرد وەک باڵی چەپ و پێشکەوتنخواز بوون.

لە کاتی گەڕانەوەی دوکتور قاسملوودا تەشکیلاتێک لە گۆڕێدا بوو کە بەرنامە و پێڕەوی نێوخۆی نەبوو کە چوارچێوەی کار و تێکوشانیان و سەلاحیەت و دەسەڵاتی ئەندامان روون بکاتەوە. لە رێبەرایەتیی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی دووهەم کەسانێکی ئەوتۆ نەمابوونەوە، ئەحمەد تەوفیق کوردستانی عێراقی بە جێ هێشتبوو و بە کورتی دەبوایە لە سیفرەوە دەست پێ بکرێتەوە، یەکەم پێشنیار کە دوکتور قاسملوو پێشکەش بە ئەندامانی دانیشتووی کوردستانی عێراقی دەکا، دانانی بەرنامەیەک بوو کە لە ژێر سێبەری ئەو بەرنامەیەدا تێکۆشان دەست پێ بکاتەوە، پاش ئەوەش ئەندامانی حیزب کۆ بکرێنەوە و کونفرانسێک بگیرێت تا مەشرووعیەت بدەن بە رێبەرایەتی.

سەرەتا رێبەرایەتییەکی ٧ کەسی دیاری دەکرێن کە بریتی دەبن لە دوکتور قاسملوو، یووسف رێزوانی، محەمەد ئەمین سراجی، ئەمیر قازی، عەبدوڵلا حەسەن زادە، حەسەن رەستگار، کەریم حیسامی.

نووسینی بەرنامە و پێڕەوی نێوخۆ درابوو بە دوکتور قاسملوو و بۆ نوسینی سێ مانگ کاتی پێ درابوو. لەو کاتەدا پێکهێنانی یەکێتییەکی فیکری لە نێو ئەنداماندا پێویست بوو، لە بەر ئەوەی کە لەو کاتەدا سێ تەیفی فیکری لە حیزبدا هەبوو کە بریتی بوون تەیفی فیکریی توودەئیستی بە نوێنەرایەتیی کەریم حیسامی، تەیفی فیکریی مائۆئیستی بە نوێنەرایەتیی محەمەد ئەمین سراجی و تەیفی فیکریی

ناسیونالیستی بە نوێنەرایەتیی ئەمیر قازی.

کارێکی دیکە کە زور گرینگ بوو و پێویست بوو کاری لە سەر بکرێ، سەربەخۆیی سیاسی بوو. لەو کاتەدا حیزب خاوەنی رادیۆیەک دەبێ و حکوومەتی عێراق داوای لێ دەکا کە لە رادیۆکەدا دژی مەلا مستەفا و شۆڕشی ئەیلوول قسە بکرێ. حیزب ناچێتە ژێر باری ئەم داواکارییە، هەر بۆیە حکوومەتی عێراق رادیۆکەی پێ دادەخات.

بۆ بووژاندنەوە و پێکهێنانی تەشکیلاتی نێوخۆیی دوو نەفەر دیاری دەکەن و تەنانەت بو گرینگیدان بە کاری نێوخۆیی دوو کەس لە ئەندامانی نێوخۆ وەک ئەندامی رێبەرایەتی دیاری دەکرێن، بەڵام لەم هەوڵەیاندا سەرناکەون.

### ■ ١٢: «کۆنگرەی سێهەمی حیزب» (١٣٥٢)

کونگرەی سێهەمی حیزب لە مانگی رەزبەری ١٣٥٢ لە بەغدا بە رێوە چوو. لەو کۆنگرەیەدا کۆمەڵێک بڕیار دەرچوون کە بەم شێوەیەی خوارەوە باسیان لێ کرا:

خەبات بۆ وەدیهێنانی ئێرانێکی ئازاد و دێموکرات و وەدەستهێنانی مافی خودموختاری بۆ گەلی کورد. بۆ گەیشتن بەم مافەش دەبێ لە هەموو شێوەکانی خەبات کەڵک وەربگیرێت. دروشمی رووخاندنی رێژیمی پاشایەتیش لە دەستووری کاری بەڕێوەبەریدا بووە و بۆ وەدیهێنانی ئەم مەبەستە هەوڵی پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانیی سەرانسەری، لە هێزە دێموکرات و چەپەکان دراوە. بۆ وێنە لە رۆژنامەی کوردستان، ژمارەی ٣٤، کە لە گەلاوێژ و خەرمانانی ١٣٥٣ دەرچووە، لە سەر پێکهێنانی بەرەی یەکگرتووی نیشتمانی لە بابەتێکدا بە ناوی»پێکهێنانی بەرەی یەکگرتووی نیشتمانی ئەرکی مێژوویی هەموو هێزە نیشتمانییەکانە»، هاتووە:

.. لە کۆمەڵی ئەمڕۆی ئێراندا دوو بەرەی لێکجیا لە بەرامبەر

یەکتر راوەســـتاون و دژی یەکتــر خەبات دەکەن. لە لایەک توێژێکی کەمێک ئەریســـتۆکرات و کۆنەدەرەبەگ و سەرمایەداری کۆمپرادۆر بە ســـەرۆکایەتیی شــا و دەرباری پەهلەوی کە بە زۆری سەرەنێزە و ئیعدام و رەشەکوژی دەسەلاتیان بە دەستەوە گرتووە، لە لایەکی دیکـــەوە کۆمەلانی خەڵک و رێکخراوە نیشـــتمانییەکانن کە لە هەموو تێکۆشــانێکی ئاشــکرا بێبەش کراون. رێژیمی دیکتاتۆریی پاشایەتی بە هۆی ســـازمانی ئەمنیەت و ســـەرەنێزەی لەشکرەوە هێزی خۆی ســـەپاندووە و هەموو ویســـت و داخوازێکی رەوای خەڵک بە گولله وەڵام دەداتەوە.

لە پاش شـــەڕی دووهەمی جیهانی تا ئێســـتا حیــزب و رێکخراوە سیاسییەکانی وڵات دژی دیکتاتۆری و سەرەڕۆیی پاشایەتی خەبات دەکەن و بۆ هێنانەســـەرکاری حکومەتێکی نیشـــتمانی و دێموکراتێک تێدەکۆشن. گەلانی ئێران لە پێناوی وەدیهێنانی ئەم ئامانجەدا زۆریان قوربانی داوە و فیداکارییان کردووە، بەڵام سەر نەکەوتوون. یەکێک لە هۆیەکانی سەرنەکەوتن و تەنانەت تێشکان و پاشەکشە ئەوە بووە کــە لــە نێوان حیزب و رێکخــراوە نیشـــتمانییەکانی ئێراندا یەکیەتیی خەبات و تێکۆشان، بەرنامەی سیاسیی هاوبەش و بەرەی یەکگرتوو نەبووە.

.. مەسەلەی پێکهێنانی بەرەی یەکگرتووی نیشتمانی لە وڵاتی ئێمەدا لەمێژە لە بەرنامەی خەبات و تێکۆشــانی زۆربەی حیزبە نیشـــتمانی و ئازادیخوازەکانــدا جێی کراوەتەوە و هەوڵی بۆ دراوە. زۆر حیزب و رێکخراوی نیشـــتمانی بەهەق لەســـەر ئەو بــاوەڕە بوون کە دژی دوژمنی هاوبەش دەبێ خەباتی هاوبەش بکرێ.

.. چەنــد کۆســـپ و بەرهەڵســـتی بەرچاو هاتوونەتە ســـەر رێگای پێکهێنانی بەرەی یەکگرتووی نیشـــتمانی کە بۆ ئەوە دەبن بە کورتی باسیان بکەین...

دامەزراندنی بەرەی یەکگرتووی نیشتمانی لە هەلومەرجی ئێستای ئێراندا ئەرکی هەموو حیزبو ڕێکخراوێکی سیاسییە کە خۆی بە دژی ڕێژیم و بە دڵسـوزی گەلانی ئێران بزانێ. تێکۆشـانی تێکڕای هێزە ئازادیخوازەکانـی ئێران و دانانـی بەرنامەیەکی یەکگرتووی خەبات، نـەک هـەر دەتوانـێ لـە ژوورەوەی وڵات توانـای هێزەکانی دژی ڕێژیـم و کۆمەلانی گەل کۆ بکاتەوە، بەڵکوو دەرەتانی پڕوپاگەندە و تەبلیغاتی بەدرۆی ڕێژیم ببڕێ و بیروڕای گشـتی لە سـەر وەزعی نالەباری وڵات روون بکاتەوە و ڕێژیم لە مەیدانی نێونەتەوەییدا تاق بخاتەوە.

حیزبـی دێموکراتـی کوردسـتانی ئێـران کـە پێکهێنانـی بـەرەی یەککگرتووی نیشـتمانیی بە یەکێک لە دروشـمەکانی خۆی داناوە، تا ئێستا چەند جار لەو بارەوە بیروڕای خۆی دەربڕیوە. حیزبی ئێمە لە هەلومەرجی ئێستای ئێراندا تێکۆشان بۆ پێکهێنانی بەرەی یەکگرتووی نیشتمانی بە یەکێک لە مەسەلە گرینگەکانی ڕۆژ دەزانێ.

لـە ڕاپۆرتی کۆمیتەی ناوەندیـی حیزبی دێموکراتی کوردسـتاندا بـۆ کۆنگرەی سـێهەم گوتـراوە: حیزبی ئێمە لـەو بڕوایەدایە کە بۆ پێکهێنانی بەرەی یەکگرتووی نیشـتمانیی گەلانی ئێران پێویست نیە هەموو ڕێکخراوە سیاسـییەکانی بەشـدار ئیدئۆلـۆژی و بەرنامەی سیاسـی و ئامانجەکانی سـتراتیژیکیان وەک یەک بێ. هەر حیزب و ڕێکخراوێک دەتوانێ سەربەخۆیی ئیدئۆلۆژیک و ڕێکخراوەیی خۆی بپارێزێ و لە کاروباری تەشـکیلاتی و تەبلیغاتیی خۆیدا سەربەست بـێ. سـەرۆکایەتیی بەرەی یەکگرتووی نیشـتمانی دەبێ لە گشـت بەشداران پێک بێ».

## ■ ١٣: ئالوگۆڕەکانی سەرووبەندی شۆڕشی گەلانی ئێران بەپێی لێکدانەوەی شەهید دوکتور قاسملوو لەو سەردەمەدا

وڵاتی ئێمە لە ساڵی ١٣٥٦دا هێندێک ڕووداوی تازەی بە خۆیەوە دیت، کە لە مێژووی تازەی ئێران، یان بە جۆرێکیتر بڵێین لە چوار یەکی چەرخی دواییدا وێنەیان نەبینراوە. ئەگەر لە ساڵی ١٣٤٩ بەم لاوە ژمارەیەک لە ڕۆڵە تێکۆشەر و پێشەنگەکانی گەلانی ئێران لە دژی دەسەڵاتی دیکتاتوری ڕاپەڕیبوون و بنکە و بنیاتەکانی ڕێژیم و ئاغا ئیمپریالیستەکانی ئەویان پەلامار دەدا، لە ساڵی ڕابردوودا توورەیی و بێزاری دەربڕین لە دەسەڵاتی سەرەڕۆی حکوومەتی شا، ئەو تەنگەبەرەی پەڕاند و خۆی گەیاندە نێو کۆمەڵانی هەراوی خەڵک و چین و توێژە جۆربەجۆرەکانی گەلانی ئێران.

لە ساڵی ڕابردوودا مانگرتن و خۆپیشاندانی خەڵک لە تاران و شارە گەورەکانی وڵاتدا بە ڕادەیەک بەربڵاو بوو کە ڕێژیمی شا ئەو ئیدیعایەی بۆ نەچێتە سەر کە گۆیا دوژمنەکانی تەنیا ژمارەیەکی کەم لە «دین وەرگەڕاو» و «بەکرێگیراوی بێگانە»ن و بە هاندانی بێگانە دەیانەوێ پێشی پێشکەوتنەکانی ئێران بگرن.

لە ئەنجامی ئەم وەزعە تازەیە و لە ژێر تەوژمی بیرەباوەڕی گشتیی جیهانیدا کە ڕۆژبەڕۆژ زیاتر دەنگی بێزاری و توورەیی خۆی دژی کردەوە و ئاکارەکانی ڕێژیم بەرز دەکردەوە، حکوومەتی شا ناچار بوو نەختێک پاشەکشە بکا و ئەگەر تەنیا بۆ ڕواڵەت بازی و فریودانیش بێ، چەند شتێکی وەک سەردانی نوێنەرانی ڕێکخراوی جیهانیی مافی مرۆڤ لە هێندیک لە زیندانەکانی ئێران و دامەزرانی کۆمیتەی بەرگری لە مافی مرۆڤ قبووڵ بکا و ئەگەر هێندێک ڕەخنەی شەرە زێڕینگەرانەشی لێ بگیرێ، نێوچاوان تێک نەنێ و وە سەر خۆی نەیەنێ.

■ ئەم ڕووداوانە چیمان پیشان دەدەن؟

ڕەنگــە هیــچ گومان لەوەدا نەبــێ کە ئەم ڕووداوانە لەســەر یەک نیشــانەی دەســتپێکردنی قۆناخێکی تــازە لــە ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵانــی خەڵکی ئێــران لەگەڵ حکوومەتی دیکتاتور و ســەرەڕۆی پاشــایەتیدان. دیارە ئەمە وەک دیاردەیەکی نوێ لە وەدەنگ هاتن و بێزاری دەربڕینی خەڵک لە کردەوە دژی گەلییەکانی ڕێژیمی شــادا، بۆ هەموو گەلانی ئێران و ڕێکخراوە پێشــڕەوەکانیان جێگای هیوا و دڵخۆشــییە و نیشانەی ئەوەیە کە بەکارهێنانی دەسەڵاتی تاکەکەسی و زوڵــم و زۆری لە ڕادەبــەدەر و ناتەبایی ئابووری و کۆمەڵایەتی، بەرەبەرە هەلومەرجی عەینی بۆ ڕاپەڕین و شۆڕشــی سەرتاسەریی ئێران ئامادە دەکەن.

بــەڵام ئەوەندەی پێوەندیی بە «گۆڕان»ی سیاســەتی حکوومەتی حەمەڕەزا شاوە هەیە، نابێ ئەو نەختە پاشەکشەیەی کە لە سەرەوە باســمان کرد، تێکۆشــەرانی ئێران بخاتە گومانەوە کە گویا ڕێژیمی شــا دەســت لــە سیاســەتی زەبــر و زەنــگ هەڵدەگرێ و چەشــنە دێموکراســییەکی وەک ئەوەی لە وڵاتانی ئورووپاییدا هەیە دەگرێتە پێش. نابێ پێمان وابێ ســبەینێ و دووســبەی ڕێژیمی شــا پێشــی ئازادییە دێموکراتییەکان بەرەڵا بکا و خەڵکی ئێران بتوانێ لە ڕێگای خەباتی پارلمانی و خۆپیشاندانی خەیابانییەوە بە ئاواتە لەمێژینەکانی بگات!

هەموومان دەزانین کە حکوومەتی شــا لە سیاسەتی نێوخۆدا هەر وەک جــاران و بە زیــادەوەش ڕۆژ بەڕۆژ هەوڵ دەدا قودســیەتی!! ڕێژیمــی پاشــایەتی زیاتــر بچەســپێنێ و دەرەتانــی هیچ چەشــنە خۆدەرخســتنێک بــە هێــزە نیشــتمانییەکانی ئێران نــادا و هەتا دێ زیاتــر بۆ کۆکردنەوەی دەســەڵات لە دەســتی بنەماڵەی پاشــایەتی و چڵکاوخۆرەکانی دەربار‌دا هەوڵ دەدا. لە سیاســەتی دەرەوەشــدا

تێدەکۆشێ هەرچی زیاتر بەستراوەیی سیاسی و ئابووری و نیزامیی ئێران بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وڵاتە سەرمایەدارییەکانی ئورووپای رۆژئاوا پتەو بکا. ئەو هەوڵ و تەقەلایەش کە ڕێژیمی شا بۆ زیاتر نزیکبوونەوە لە حکوومەتە کۆنەپەرەستەکانی ناوچە و بۆ بەستنی پەیمانێکی نیزامی لەگەڵ ڕێژیمە سەر بە ئیمپریالیستەکانی خەلیج دەیدا، لە هیچ کەس شاراوە نیە. کەوا بوو، ئەو تۆزە پاشەکشەیەی ڕێژیمی شا و ئەو چاوڕاوەی دەربارەی «دێموکراسی»! لە دەزگا تەبلیغاتییەکانی ئێرانەوە بڵاو دەکرێتەوە، بە هیچ جۆر بەڵگە و نیشانەی گۆرانی ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی ڕێژیمی ئێران نین و لە باشترین حاڵەتدا «دەرپچەی ئیتمینان»ێکن بۆ کەف وکوڵ دامرکاندنەوەی کۆمەڵانی تووڕە و ڕق هەستاوی خەڵکی ئێران. تاقیکردنەوە دەری خستووە کە هەر کاتێک حکوومەتی شا تۆزقاڵێک هەست بە مەترسی بکا، پەنا بۆ زەبروزەنگ و ئاکارە جەهەننەمییەکانی دەبا و چلکاوخۆرەکانی ساواک و ژاندارمری لە گیانی ڕۆڵەکانی خەڵک بەر دەدا. ڕووداوەکانی ئاخری مانگی ڕێبەندانی تەوریز بەڵگەیەکی زیندووی ڕاستی و دروستیی ئەو لێکدانەوەیەن. لە خۆپیشاندانی خەڵکی تەورێزدا پۆلیسی شا هەر کە هەستی بە بەرینی و بەربڵاوبوونی خۆپیشاندانەکە کرد، بێ سێ و دوو لێکردن سینگی ڕۆڵە بێ دیفاعەکانی ئەو شارەی دایە بەر مەودای شەستتیر و شەقام و کۆڵانەکانی تەوریزی بە خوێنی بێتاوانان سوور کرد. هەر چەند بە قسەی تەبلیغاتچییەکانی ڕێژیم ژمارەی قوربانیەکانی ئەو خۆپیشاندانە لە سێزدە کوژراو و ١٢٥ بریندار زیاتر نەبوو، بەڵام هەر بە قسەی رادیۆی دۆستە سەهیونیستەکانی شا ٧٥ کەس کوژرابوون و ژمارەی بریندارانیش لە ٣٠٠ کەس زیاتر بوو. خۆ ئەمەش دەزانین کە ژمارەی ئەو کەسانەی بە تاوانی بەشداربوون لەو خۆپیشاندانەدا گیراون، هەر بە گوێرەی بەیاننامە ڕەسمییەکانی

دەوڵەت، خۆی لە ٨٠٠ کەس داوە و تا ئێستا گرتن و راونان درێژەی هەیە. بێجگە لەوە کە تەورێز تا ئێستا وەک شارێکی داگیرکراو، بە تانک و زرێپۆشەکانی دژی نیشتمانیی شا گەمارۆ دراوە.

گرتن و موحاکمە کردنی خوێندکارانی زانستگاکانی تاران و تەورێز و شیراز و بەشداری خۆپیشاندانەکەی قوم و زۆر نموونەی تری لەو بابەتەمان بە دەستەوەن، بەڵام دەرێژ کردنەوەی ئەو باسە لێرەدا پێویست نیە و با بێینە سەر ئەسڵی مەتڵەب مەبەست:

ئەوە بۆ هەشت ساڵ دەچێ کە جموجۆڵی چەکدارانە لە ئێراندا بە راپەڕینەکەی سیاهکەل دەستی پێ کردوە و لەگەڵ ئەوەی جەللادەکانی رێژیم هەموو توانای خۆیان بۆ خاشەبڕکردنی بە کار هێناوە و پێچەوانەی ئەوەی کە کاربەدەستان زۆر جار رایانگەیاندوە کە ناحەزانی رێژیم بنەبڕ بوون و کەس نەماوە سەر نەفەسی هەڵباوێ، هەر جارە لە شوێنێک سەری هەڵداوەتەوە و لێدانی بنکە و بنیاتەکانی دوژمن تەقریبەن بێ پسانەوە درێژەی هەبووە. ماوەی ساڵێکیشە بەربەرەکانێی خەڵک شێوەیەکی تازەی وەرگرتووە و لە کۆڕوکۆمەڵە ئاشتییەکانەوە بیگرە تا دەگاتە دەستە و رێکخراوە مارکسیستییەکان، لەو بەربەرەکانێیەدا بەشدارن. کەچی لەگەڵ هەمووی ئەوانە، تا ئێستاش حکوومەتی دژی نیشتمانیی شا وەک دوڵبای سەلیمی جەوهەری سواری شان و شەپیلکی گەلەکانی ئێران بووە و هەر وەک جاران پرزەی لە خەڵک بڕیوە.

تۆ بڵێی هەمووی بە نەتیجە نەگەیشتبێ ئەو خەباتە و بەربەرەکانێیە چی بێ؟ بە کەمێک وردبوونەوە بۆمان دەر دەکەوێ کە هەر دوو جۆرەکانی خەباتی ئەم هەشت ساڵانەی دوایی و ئەگەر نەختێک بگەڕێینەوە دواتر، بزووتنەوە چەکدارانەکەی ٤٦ ١٣٤٧ی کوردستانیشی لەگەڵ بێ، چەند شەرتێکی بنەڕەتیی سەرکەوتنیان تێدا نەبووە، وەک هاوکاری و هەنگاو رێکخستنی

هێزە نیشـتمانییەکانی ئێران، راکێشانی کۆمەڵانی هەراوی خەڵک بۆ کۆڕی خەبات و تێکۆشان، سەرکردایەتی کردنی ئەو خەباتە لە لایەن بەرەیەکی یەکگرتووی نیشـتمانییەوە کە خاوەنـی بەرنامە و ئامانج و سـتراتیژییەکی روون بێ و سـەرئەنجام بە گژداچوونی رێژیم لە هەموو شـوێنێک و لە تەواوی جبهەکاندا. بە درێژایی ئەو هەشت نۆ دە سـاڵەی باسمان کرد هەمیشە جووڵانەوە لە ناوچەیەکی بچووکدا تەنگەبەر بۆتەوە کە رێژیم بە ئاسانی توانیویەتی گەلەکۆمەکی بکاتە سـەری و تێکی بشکێنی. لە ساڵی رابردووشـدا سەرەڕای فەرەوان بوونی ئەڵقەی بەرەنگار بوونەوەکە، دیسان خەباتەکە پچڕ پچڕ بووە و لە لایەن هێزێکی سیاسیی شۆڕشگێڕیشەوە رێنوێنی و رابەرایەتی نەکراوە. ئەمە جگە لەوەش کە شـێوەی خەباتەکە شـێوەی خەباتی ئاشـتیخوازانە دژی رێژیمێک بووە کە لە زمانی گوللە بەو لاوە هیچ زمانێک نازانێ. هەر ئەندازە هەلومەرجی عەینی لەباریش بێ، ئەگەر هەلومەرجـی زەینـی ئامادە نەبـێ و رێکخراوەیەکی شۆڕشـگێڕ بە بەرنامەیەکی روونی سیاسـییەوە سـەرۆکایەتیی خەباتی کۆمەڵانی خەڵکـی تێـدا وە ئەسـتۆ نەگـری، ناتوانـێ بەرهەمێکـی باشـی لێ وەربگرێ و دەستی زۆرداران لە سەر زۆرلێکراوان کورت بکرێتەوە. بەڵام هەلومەرجی زەینی، واتە بوونی رێکخراوەیەکی شۆڕشـگێڕ بۆ رابەرایەتی کردنی خەبـات، دەتوانێ ئەوپەڕی کەڵک لە هەلومەرجی لەبـاری عەینی وەربگـرێ. رەنگە یەکێـک هەبێ بڵـێ ناتەباییەکانی کۆمەڵـی ئێران سـەرئەنجام رۆژێک هەر دەتەقێتـەوە و کۆتایی بەم وەزعەی ئێستا دێنن. دیارە ئەوە لە خۆیدا شتێکی راستە و بێگومان مێژوو رێگای خۆی دەبڕێ و رۆژێک لە رۆژان ئەم دەورو دووکانە دەپێچێتەوە. بەڵام نابێ لە بیرمان بچێ کە ئەوە پرۆسەیەکی دوور و درێژە و هیچ پەکی بەوە نەکەوتووە کە ئەو گۆڕانەی ئێمە دەمانەوێ بە سـاڵێک پێک دێ، یان بە هەزاران سـاڵ. شۆڕشگێڕیش هەر بەوە

دەڵێن کە ئەو ڕەوتە مێژووییە خێراتر بکا و ڕێگای دوور و درێژ بە ماوەی کورت ببڕێ. کەوابوو، هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆن بۆ سەرکەوتن بە سەر دوژمندا و بۆ وەدیهێنانی ئاواتە لەمێژینەکانی گەلانی ئێران تەنیا یەک ڕێگایان لە پێشە، ئەویش یەکگرتنە لە بەرەیەکی نیشتمانیدا و لەسەر بەرنامەیەکی ڕوونی سیاسی کە داخوازیە سەرەکییەکانی هەموو گەلانی ئێران و هەموو چین و توێژە نیشتمانییەکانی خەڵکی وڵاتی ئێمەی تێدا گڵاڵە کرابێ.

بەڵام ئەرکی ئێمەی تێکۆشەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستان چییە؟

کەم کەس هەیە نەزانێ کە کوردستانی ئێران شانسی ئەوەی هەیە یەکێک لە سەنگەرە هەرە قایمەکانی شۆڕشی سەرتاسەریی ئێران بێ. کەوابوو هەر بەرەیەکی نیشتمانی کە لە دواڕۆژدا پێک بێ، چار ناچار یەکیک لە لایەنە ئەساسییەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانە. دەبێ ئەوە بزانین کە هەر چەند حیزبی ئێمە لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی ئێراندا کاریگەرتر بێ، لە باری یەکگرتووییە نیشتمانییەکەشدا شوێنێکی گرینگی دەبێ و سەرئەنجام گەلەکەشمان دوای ڕزگاربوونی ئێران بەرووبوویەکی زیاتری لە خەباتی لەمێژ ساڵەی خۆی پێ دەبڕێ.

جا بۆیە ئەوەی حیزب و گەلەکەمان جێگای شیاوی خۆیانە لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیی ئێرانی وەربگرن، ئەرکی تێکۆشەرانی حیزبی ئێمەیە کە زیاتر بچنە نێو کۆمەڵانی گەلی کورد و چین و توێژەکانی کۆمەڵی کوردەواری لە دەوری دروشمەکانی حیزب کۆ بکەنەوە. هەر ئەوەندە بەس نیە کە لە ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانی حیزبدا لە سەر سیاسەتی حیزب قسە بۆ خەڵک بکەن. دەبی بە هەموو توانای خۆمانەوە بچینە نێو خەڵک، لە نزیکەوە لە ڕاز و ویست و داخوازییەکانیان ئاگادار بین و لە سەر سیاسەت و ڕێباز و بەرنامە و ئامانجەکانی حیزب ڕوونیان بکەینەوە.

هێندێک لە هاورێیان پەرەگرتنی رایەڵکە جاسووسییەکانی ساواک بۆ نزیکبوونەوە لە خەڵک و لێکهەڵاواردنی چاک و خراب و دۆست و دوژمن لە نێو ریزەکانی کۆمەڵدا بە کۆسپ دادەنێن. بەڵام نابێ لە بیرتان بچێ کە بۆ لێک جیاکردنەوەی دۆست و دوژمنێش و بۆ بێهێزکردنی رایەڵەکانی ساواکیش، بێجگە لە چوونە نێو خەڵک رێگایەکیترمان نیە.

یا ئەو راستییەشمان لە بەرچاو بێ کە ئەوەی سازمانی ئەمنیەت لە بارەی نفووز و دەسەڵاتی خۆیەوە بڵاوی دەکاتەوە، بە تایبەتی لە کوردستاندا بەشی زۆری فروفیشاڵ و چاوورواوەی ریژیمی شا نە تا ئێستا توانیویەتی و نە قەتیش دەتوانێ پێگەیەکی کۆمەڵایەتی لە نێو رۆڵە زەحمەتکێشەکانی کۆمەڵدا بۆ خۆی پەیدا بکا. گەلی کورد حیزبی دێموکراتی کوردستان بەو هێزە سیاسییە دەناسێ کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی نەتەوەی کورددا لە بەشێکی نیشتمانەکەیدا حکومەتێکی میللیی ئەویش لە شکڵی جومهووریدا بۆ کورد دامەزراندووە. لەو کاتەوە کە حیزبی دێموکراتی کوردستان دامەزراوە، هیچ هێزێکی سیاسیی دیکە نەیتوانیوە لە کوردستاندا ریشە دابکوتێ و پەرە بگرێ. بە هەزاران رۆڵەی گەلەکەمان کە ئێستا ئێمە پێوەندیی رێکخراوەییمان پێیانەوە نیە، رۆژێک لە رێکخراوەکانی حیزبی ئێمەدا تێکۆشاون و تا ئێستا بە حیزبەکەمان وەفادار ماونەوە. ئەوانە نەک هەر لە ریزی گەل دەرنەچوون، تەنانەت رێگای هێزێکی سیاسیی دیکەشیان نەگرتۆتە بەر. هەوڵ و تێکۆشانی جیددی و بێ پسانەوەی ئێمە دەتوانی بە ماوەیەکی نیسبەتەن کورت زۆربەی ئەوانە بێنێتەوە نێو رێزەکانی حیزب و لەشکرێکی گەورە لەو رۆڵە بە ئەمەکانە پێک بێنی. بە تایبەتی کە توندوتیژ بوونی ناتەباییەکانی کۆمەڵی ئێستای ئێرانیش هۆیەکی یارمەتیدەری ئەو مەبەستەیە.

مەسەلەیەک ماوە کە پێویستە ئیشارەی پێ بکرێ. ئەویش ئەوەیە

کــە وەک بۆ خۆمان دەزانین ماوەیەکی زۆرە بەو جۆرەی پێویســتە نەچووینــە نێو خەڵک و ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە کاتێک دەچینە نێویــان و بانگیــان دەکەین بۆ نێــو ریزەکانی حیــزب، بێجگە لەوانە کە بە راســتی تێکۆشەرن و مانای راســتەقینەی خەبات و تێکۆشان دەزانن، لەگەڵ چەند دەستە ئینسانێک بەرەوڕوو دەبین کە هەر چەند پاکن و دڵسۆزی گەل و نیشتمانەکەیانن، چەشنە بیروڕایەکی هەڵە و نادروستیان هەیە. راکێشانی ئەو جۆرە کەسانە بۆ مەیدانی خەباتی بە کردەوە هەوڵ و تێکۆشان و سەبر و سیکەدانێکی نائاسایی پێویستە. بــۆ نموونە هێندێک کەس کە بەداخەوە ژمارەشــیان کەم نیە کاتێک داوای هــاوکاری و تێکۆشــانیان لێ دەکەی، لــە وەڵامدا دەڵێن : «لە هەلومەرجی ئێســتادا کە «هیچ لە گۆڕێدا نیە» ئامادە نیم هاوکاریی رێکخراوەیی لەگەڵ حیزب بکەم، بەڵام با بگاتە رۆژی خۆی، بزانە بە ســەرومالّەوە تێدا دەبم یان نا؟ دیارە مەبەستیان لە رۆژی «خۆی» ئەو کاتەیە کە حیزبی ئێمە ســەنگەری چیاکانی کوردســتان ئاوەدان دەکاتەوە و چەکدارانە بە گژ دوژمنی گەلانی ئێراندا دەچێ. بێ خەبەر لــەوەی کە ئەو «رۆژەی خۆی» نە لە ئاســمان بــەر دەبێتەوە نە لە عــەرز هەڵدەقوڵێ و نە هیچ کەســیش بۆمان بــە دیاری دێنێ. ئەگەر قەرار بێ چاوەڕوانی موعجیزە بین، بەبێ شــک حەوت پشتیشــمان دەبرێتــەوە و ئــەو رۆژە هەر نایە. ئەوە من و تۆ و ئەم و ئەوین کە دەبێ دەست بە دەستی یەکتر بدەین و بە کاری شێلگیر و تێکۆشانی بێ وچان ئەو رۆژە وە دی بێنین.

## ■ ١٤: پێکهێنانی کومیتەی زاگرۆس (١٣٥٧)

پــاش رووداوەکانــی تەورێز لە زســتانی ســاڵی ١٣٥٦ی هەتاوی دوکتور قاســملوو لە ئورووپــا دەگەڕێتەوە عێراق و کۆبوونەوەیەک لە کومیتەی ناوەندی پێک دێنێ و لەو کۆبوونەوەیەدا هەرچی کادری

حیزبی بـووە کۆ کراوەتەوە، دوکتور قاســملوو لەو کۆبوونەوەیەدا دەڵــێ: «بە بڕوای من بارودۆخی ئێران لە گۆڕانێکی زۆر قووڵدایە» و پێشــنیار دەکا بگەڕێنەوە بۆ کوردســتان و دەســت بە تێکۆشانی سیاسی بکەن، بەڵام هەموو ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بەو بیانوویە کــە «جارێ کاتی نەهاتووە» موخالیفــەت دەکەن. لە هاوینی ٥٧یش دیسان دوکتور قاسملوو کۆبوونەوەیەکی دیکەی کومیتەی ناوەندی پێــک دێنی و ســەر لە نوێ پێشــنیاری گەڕانەوە بۆ ئێــران دەکا کە دیسان کومیتەی ناوەندی مۆخالیفەت دەکات.

دوکتور قاســملوو لە هەستیاریی دۆخی ئێران تێ دەگا و ئەمجارە پێشــنیار دەکا ئێستا کە کومیتەی ناوەندی ئامادە نییە بگەڕێتەوە، با کومیتەیەکــی تایبەت پێــک بێنین تا بگەڕێتەوە بــۆ نێوخۆی وڵات و ئەم کومیتەیە ســەلاحییەتی کومیتــەی ناوەندیی پێ بدرێ کە لەگەڵ ئەم پێشــنیارە موافقەت دەکرێ و ناوی کومیتەکە دەبێتە «کومیتەی زاگرۆس». ئەندامانی ئەو کومیتەیە لە ٦ کەس پێک دێن: ١: دوکتور عەبدولڕەحمان قاســملوو ٢: ئەمیر قازی ٣: عەبدوڵڵا حەسەنزادە ٤: هاشــم کەریمی ٥: سەید رەســووڵ دیهقان ٦: حەسەن شێوەسەڵی. نەفــەری ٤ تــا ٦ ئەندامــی رێبەری نەبــوون، ئەمە لــە کاتێکدایە کە کومیتــەی ناوەندیی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی ســێهەم ژمارەیان ١٥ کەس بووە.

ســەلیم بابانزادەش هەرچەند ئەندامی کومیتەی زاگرۆس نەبووە، بــەڵام لەگەڵ ئــەو ٦ کەســە گەڕاوەتــەوە نێوخــۆی وڵات. هەرچی ئیمکاناتێک کە حیزب هەیبووە دەدرێ بەو ٧ کەسە تا بگەڕێنەوە بۆ ئێران و تێکۆشــانیان دەست پێ بکەن. پێش لە گەڕانەوەی کومیتەی زاگــرۆس بــۆ نێوخۆی وڵات لــە یەکەم کۆبوونــەوەدا دوو کەس لە ئەندامانــی زاگرۆس داوا دەکەن ســکرتێری حیــزب پێش لە هەموان بگەڕێتــەوە کە دوکتور قاســملوو ئــەو داوایە قبــووڵ دەکات، بەڵام

رۆژی دواتر داوا دەکەن سکرتێر دوای هەموویان بگەڕێتەوە و دەڵێن ئەگەر سکرتێر پێش هەموویان بگەڕێتەوە، ڕێژیمی عێراق باقییەکەیان دەگرێ بۆیە باشترە سکرتێر ئاخر نەفەر بێ کە دەگەڕێتەوە کە دیسان دوکتور قاسملوو ئەو پێشنیارەش قبوول دەکا. لەو کاتەدا عێراق موخالیف دەبێ کە ئەوان لە ڕێگای عێراقەوە بگەڕێنەوە و داوایان لێ دەکا بچنە تورکیە و لەوێوە بگەڕێنەوە بۆ ئێران.

ئەندامانی زاگرۆس لە کۆتاییەکانی هاوین و سەرەتای پاییزدا دەگەڕێنەوە نێوخۆی وڵات کە کاتەکە زۆر دێر بووە و تا ئەو کات ڕێکخراوی جۆراوجۆر پێک هاتوون و هەرکەس بۆ خۆی لە نێو کۆمەڵگادا یارگیریی کردووە. بەڵام ئەوەی کە حیزبی دێمۆکرات بۆ دێر گەڕایەوە و بوو بەو هێزە گەورەیە، دەگەڕێتەوە بۆ ئێعتباری رابردووی حیزب واتە دامەزرانی کۆماری کوردستان و بەڕێوەبردنی شۆڕشی ٤٦-٤٧ و بوونی ڕێبەرێکی بەوەجی وەک دوکتور قاسملوو کە شوێندانەریی زۆریان هەبوو.

پاش گەڕانەوەی کومیتەی زاگرۆس بۆ نێوخۆی وڵات، محەممەد ئەمین سەراجیش کە دەزانێ مەسەلەکە جیدییە، دەگەڕێتەوە. بەرپرسایەتیی ئەندامانی زاگرۆس بەم چەشنە بووە: حەسەن شێوەسەڵی بۆ ورمێ، عەبدوڵڵا حەسەنزادە بۆ مەهاباد، هاشم کەریمی بۆ سنە، ئەمیر قازی بۆ کرماشان، محەممەدئەمین سەراجی بۆ سەقز، سەلیم بابانزادە بۆ بۆکان، سەید ڕەسووڵ دیهقان بۆ پیرانشار و نەغەدە، دوکتور قاسملوویش بۆ تاران.

ئەم ژمارەیە کە دەگەڕێنەوە نێوخۆی وڵات، ژمارەیان کەم بووە و لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر کەمیش خەڵک پێوەندییان هەبووە، بۆیە زۆر لاواز بوون. پاشان کە وەزعەکە خۆش بوو، باقیی ئەندامانی کومیتەی ناوەندیش کە لە دەرەوە بوون، دەگەڕێنەوە بۆ نێوخۆی وڵات و لە یەکەمین کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندیدا لە نێوخۆی وڵات کومیتەی

زاگـرۆس هەڵدەوەشـێننەوە و بەرپرسـایەتیی ئیداریی کوردسـتان دەکەوێتە دەست کومیتەی ناوەندی. دیارە پاش گەڕانەوەی کومیتەی زاگرۆس، دەرکی زیندانەکان کرانەوە و زیندانییەکان ئازاد کران. لەو نێوانەدا مامە غەنی بلووریان و کاک عەزیز یووسفی کە لە کۆنگرەی سـێهەمدا بە غیابـی هەڵبژێردرابـوون، بوون بە ئەندامـی کومیتەی ناوەندی کە عەزیز یووسفی دوای ماوەیەکی کورت بە داخەوە کۆچی دوایی کرد و لە نێو ئاپۆرای خەڵکی مەهابادا بە خاک ئەسـپێردرا. پێویستە بگوترێ، لەم نێوانەدا ئەمیر قازی و هاشم کەریمی لە کاتی گەڕانـەوەی کومیتەی زاگـرۆس تا ڕووخانی ڕێژیمی پاشـایەتی و تەنانەت دواتریش قەت نەچوونە شوێنی مەئموورییەتەکەیان.

### ■ ١٥: دەستبەسـەرداگرتنی پادگانـی مەهابـاد، هەنگاوێکـی شۆڕشگێڕانەی پێویست (١٣٥٧)

پـاش ئەوەی کە شۆڕشـی گەلانی ئێـران سـەرکەوت، لە هەموو شارەکانی ئێراندا ناوەندەکانی سەرکوت، پادگانەکان و بنکەکانی هێزی چەکدار و ئەمنیەتیی ڕێژیمی پاشایەتی کەوتنە بەر هێرشی خەڵک و گرووپە سیاسییەکانی بەشدار لە شۆڕشدا و چەکوچۆڵی زۆری نێو ئـەو ناوەندانە لە لایەن خەڵکەوە تالان کـران. ئەم هەنگاوەی خەڵک لە لایەن دەسەڵاتدارانی نوێی ئێرانەوە بە کردەوەیەکی شۆڕشگێڕانە پێناسە کرا و وەکوو خزمەت بە شۆڕش دانرا.

هـەر لە درێژەی ئەو ڕەوتـەدا ڕۆژی ٢٣ی ڕێبەندان، واتە ڕۆژێک پاش سـەرکەوتنی شۆڕش، لە شاری مەهابادیش کۆمەڵێک لە خەڵک و لایەنە سیاسییەکان (بە بێ بەشداریی حیزبی دێموکرات) هێرشیان کردە سـەر پـادگان، بەڵام بە هۆی بـێ ئەزموونـی و ناڕێکوپێکیی هێزەکان و نەبوونی پلانی گونجاو، ئەو هێرشە تووشی شکست بوو و زیانـی مرۆیی قورسـی لـێ کەوتەوە. لە ئاکامی ئەو شـەڕەدا ٢٩

کەس لە خەڵکی شار و کەسانی سەر بە لایەنە سیاسییەکان شەهید بوون و ٢٦ کەسیش بریندار بوون. هەروەها هێزەکانی نێو پادگان پاش ئەم هێرشە وشیار بوونەوە و بە قایمکردنی سەنگەرەکانیان و گرتنی بەرزاییەکانی پشتەوەی پادگان، لە رووی سەربازییەوە خۆیان بۆ هێرشی چاوەڕوانکراوی داهاتوو ئامادە کرد.

پاش ئەو رووداوە بوو کە حیزب بڕیاری دا هەر چۆنێک بووە دەبێ ئەو پادگانە کە وەکوو ئاسەواری ڕێژیمی پێشوو و هێمایەکی تۆقینەر بە سەر شاری مەهابادا زاڵ بوو، دەستی بە سەردا بگیرێت، بەڵام نابێ ئەزموونی شکستخواردووی پێشوو تاقی بکرێتەوە. هەر بۆیە بەرپرسانی حیزبی لە مەهاباد بە گرتنی پێوەندی لەگەڵ کۆمەڵێک لە ئەفسەران و دەرەجەدارانی کوردی نێو پادگان هەوڵیان دا پلانێک دابنێن بۆ ئەوەی کە پادگان خۆی بە دەستەوە بدات و شەڕێکی کارەساتباری لێ نەکەوێتەوە. لەو پێوەندییەدا ئەفسەران و دەرەجەدارانی شۆڕشگێڕی وەک شەهید سەروان ئەحمەد جاویدفەڕ (شەهید هەژار)، و هەروەها سەرهەنگ ئیرەج (قەرەنی) قادری، کەریم پوورقوباد و حامید گەوهەری ڕۆڵێکی بەرچاویان گێڕا. ئەو کەسانە بە قسەکردن لەگەڵ سەربازانی نێو پادگان بەو قەناعەتەیان گەیاندبوون کە کۆمەڵێک لە ئەفسەرانی پادگان دەیانهەوێ کوودەتایەک دژ بە شۆڕش بکەن. هەر بۆیەش رۆژی ٢٩ی ڕێبەندان واتە حەوتوویەک پاش سەرکەوتنی شۆڕش، کاتێک کە پادگان گەمارۆ درا، هیچ بەرەنگاربوونەوەیەک لە نێو پادگانەوە رووی نەدا و لە ئاکامدا ئەفسەر و دەرەجەدار و سەربازە شۆڕشگێڕەکانی پادگانی مەهاباد، نیزامییەکانی سەر بە ڕێژیمی پێشوویان چەک و زیندانی کرد. تیمسار پزشکپوور، فەرماندەی پادگان کە دەیهەویست هەڵبێت، بە برینداری دەستگیر کرا و ئەوە تاقە برینداری ئەو حەرکەتە گەورەیە بوو. ئەفسەر و دەرەجەدارە

شۆڕشـــگێڕەکان داوایان لە خەڵک و پێشـمەرگە کرد بۆ پاراسـتنی پادگان یارمەتییان بدەن و شـووڕایەکیان بـو بەڕێوەبردنی پادگانی مەهابـاد دیـاری کـرد و چەکوچۆڵی پادگان کەوتە دەسـتی حیزبی دێموکرات و خەڵک.

گرتنـی پادگان لە گەڵ دژکـردەوەی زور توندی ڕێژیم بەرەوڕوو بـووەوە. ئەوە لە کاتێکدا بوو کە هەموو پادگانەکانی ڕێژیم لە تاران و باقیی شارەکانی دیکەی ئێران دەستیان بە سەردا گیرابوو و نەک هـەر هیچ دژکردەوەیەک بەرانبەر بە گرتنی ئـەو پادگانانە لە ئارادا نەبـوو، بەڵکوو بە کردەوەیەکی شۆڕشـگێڕانەش دادەنرا. ئەوەش لە یەکەم هەنگاوەکانی دامەزرانی ڕێژمی تازە بەدەسـەڵات گەیشتوودا نیازی خراپ و دڵی پڕ لە قینی بەناو ڕێبەرانی شۆڕشی لە نەتەوەی کـورد و بزووتنـەوە ڕەواکـەی وەکوو کۆسـپێک بۆ سـەر ڕێگای وەدیهاتنی خەونی مەزنیخوازانەی ئەوان بە روونی دەری دەخسـت. داهاتووی ڕووداوەکان و هێرشـی ڕێژیم بۆ سەر کوردستان دەری خسـت کە گرتنی ئـەو پادگانەش وەکـوو زۆربەی هەڵوێسـتەکانی دیکەی حیزبی دێموکرات لەو سـەردەمەدا چەندە بۆ بەهێزترکردنی خۆڕاگریی بزووتنەوەی کورد لە بەرانبە ئەو هێرشـانەدا دروست و پێویست بووە.

### ■ ١٦: ڕاگەیاندنی تێکۆشانی ئاشکرای حیزب (١٣٥٧)

حیزبـی دێموکـرات کە پـاش ڕووخانـی کۆماری کوردسـتان بۆ ماوەی ٣٢ساڵ تێکۆشانی نهێنیی هەبوو، سەرئەنجام لە ڕۆژی ١١ی ڕەشـەمەی سـاڵی ٥٧ لە میتینگێکی دەیان هەزار کەسـیدا لە شاری مەهاباد، تێکۆشـانی ئاشـکرای خۆی ڕاگەیاند. خەڵکی سەرتاسەری کوردسـتان بـە هۆگرییەکی زۆرەوە بـۆ ڕۆژی دیاریکـراو خۆیان گەیاندە شاری مەهاباد و لە میتینگی ڕاگەیاندنی تێکۆشانی ئاشکرای

حیزبدا بەشدارییان کرد.

ڕۆژانی پێش لە دەستپێکردنی میتینگەکە، خەڵک دەستە دەستە دەگەیشتنە شاری مەهاباد و پاش پێشوازی لێکردنیان لە لایەن دەستەی دابەشکردنی میوانەکانەوە کە لە کۆشکی لاوانی ئەم شارەدا نیشتەجێ بوون، بە سەر ماڵەکانی شاردا دابەش دەکران. لەم پێوەندییەدا خەڵکی دڵسۆز و تێکۆشەری مەهاباد میوانداریيەکی باشی میوانەکانیان کرد.

بەیانیی ڕۆژی ١١ی ڕەشەمە کۆبوونەوەیەکی دەیان هەزار کەسی لە ئیستادیۆمی ئەم شارەدا کە زۆر ڕۆژنامەوانی نێوخۆیی و بیانییش بەشدار بوون، دەستی پێ کرد. پاش خوێندنەوەی سروودی «ئەی ڕەقیب»و ڕژەی هێزی پێشمەرگە، شەهیدی نەمر دوکتور قاسملوو، سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران چووە پشت تریبۆن و بەرنامە و تێکۆشانی ئاشکرای حیزبی ڕاگەیاند:

پاش سڵاو و ڕێزلێنان بۆ گیانی پاکی شەهیدانی ڕێگای ئازادیی کورد و کوردستان و سەرجەم ئێران، پاش سڵاو ناردن بۆ هەموو خەڵکی کوردستان و بە تایبەتی شۆڕشگێڕان، ڕووناکبیران، ژنان، خوێندکاران، لاوان، کرێکاران، زەحمەتکێشان و هەموو گەلانی ئێرانی ڕایگەیاند:

> «حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران پاش ٣٢ ساڵ خەباتی نهێنی، خەباتی ئاشکرای خۆی دەست پێدەکا.
>
> ئەندام و لایەنگرانی حیزب شەهیدی زۆریان داوە، بەندیخانە و ئازار و ئەشکەنجەی زۆریان چەشتوە. لەگەڵ ئەوەشدا حیزبی ئێمە خاوەن پشتیوانیی بێدرێغی گەل بووە و هەرگیز سەنگەری خەبات ڕەها ناکا و بە پشتیوانی خەڵک و هێزی لەبڕاننەهاتووی جەماوەری گەل و بە سەربەرزییەوە بەرگری دەکەین».

لە بەشێکی دیکەی وتارەکەیدا، دوکتور قاسملوو ئاماژە بە پێشینەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەکا و دەڵێ:

«حیزبی دێموکراتی کوردستان، حیزبی دامەزرێنەری کۆماری کوردستان، یەکەمین دەسەڵاتی نەتەوەیی کورد لە مێژووی هاوچەرخدایە کە هێشتا یادی ئەم کۆمارە پیرۆزە و دەسکەوتەکانی لە بیری هەموو دانیشتوانیدا ماوەتەوە.»

دوکتور قاسملوو پاشان ئاماژە بە سەرکەوتنی شۆڕشی بەشکۆی گەلانی ئێران وەک سەرکەوتنێکی گەورەی مێژووی ئێران دەکا:

«هەنووکە ئیدی ڕێژیمی سەرەڕۆی پاشایەتی ڕووخاوە و شۆڕشی بەربڵاوی خەڵکی لە سەرانسەری ئێران سەرکەوتووە و لە نێو گەلانی ئێراندا بە هێزێکی یەکگرتوو و کەموێنە، شۆڕشێکی ئەفسانەیی بەرپا بوو».

پاشان لە وتەکانیدا هێما بۆ پاراستنی دەسکەوتەکانی شۆڕش دەکا و شێوە دێموکراتیکەکان دەکاتە گەرەنتیی ئەو دەسکەوتانە:

«پاراستنی ئازادییە دێموکراتیکەکان و پتەوکردنی کۆڵەکەکانی ڕێژیمێکی دێموکراتیکی ڕاستەقینە لە سەرانسەری ئێراندا گەرەنتیی سەرەکی پێشکەوتنی شۆڕش و بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکان بۆ هەموو گەلانی ئێرانە. بێگومان بە نەبوونی ڕێژیمێکی دێموکراتیکی ڕاستەقینە، مافە نەتەوەییەکانی کورد دابین ناکرێ و بێ دابینکردنی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد، ڕێژیم بە مانای ڕاستەقینەکەی دێموکراتیک نابێ».

دوکتور قاسملوو لە وتەکانیدا پێداگریی زۆرتر لە سەر مافە نەتەوەییەکانی کورد دەکا و ڕادەگەیەنێ کە:

«مافی نەتەوەیی، وەک ئازادی لە بنەڕەتیترین مافەکانە کە شۆڕشی ئێران بۆ بەدەستهێنانی بەرپا بووە. لۆژیک و پێویستی ئەوە دێنێ کە مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلانی

ئێران بە فەرمی بناسرێ. بەم هۆیەوە پێویستە کە دەوڵەتی ئینقلابیی «مێهدی بازرگان»، رای خۆی لەمەڕ مەسەلەی نەتەوەیی و مافەکانی گەلی کورد کە لە کێشە بنەڕەتییەکانی شۆڕشی ئێرانە، بە ڕوونی رابگەیەنێ. نەتەوەی کورد وەک هەموو نەتەوەکانی دیکە مافی هەیە دڵنیا بێ کە ستەمی نەتەوایەتی، میراتی چەپەڵی ڕێژیمی سەرەڕۆی شا لە نێو دەچێ و ئاسەوارێکی لێ نەماوە. دەبێ نوێنەرانی گەلی کورد لە مەجلیسی دامەزرێنەران و لە ڕێکخستنی یاسای بنەڕەتیی نوێی ئێراندا بەشداری بکەن تا بتوانن مافی سەلمێنراوی گەلانی ئێران و گەلی کورد لە یاسادا بگونجێنن.»

لە بەشێکی دیکەی وتارەکەیدا، ئاماژە بە را و بۆچوونەکانی حیزب و بەرنامەکانی دەکا:

«حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لەو باوەڕەدایە کە لە کۆمەڵگای ئەوڕۆکەی کوردستان دەرەتانی ئەوە هەیە کە یەکیەتیی پتەوی نێوان تەواوی چین و توێژەکانی گەل لە کرێکاران، زەحمەتکێشان، ڕۆشنبیران، بازاڕییەکان و عەشایرە نیشتمانپەروەرەکان سەقامگیر بکا.

.. سیاسەتی ئێمە ئەمە نیە کە هەر کەس دۆستمان نەبێ دوژمنمانە، بەڵکوو هەر کەس دوژمنمان نەبێ دۆستمانە».

«حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران باوەڕێکی قوڵی بە دێموکراسی هەیە و ئامادەی هاوکاری لەگەڵ تەواوی حیزب و گرووپە سیاسییەکان لە سەرانسەری ئێران و نێوخۆی کوردستانی ئێرانە. ئێمە لە ناخی دڵەوە دەڵێین کە زۆر خاڵی هاوبەش وەک ئەم خاڵانەی خوارەوە بۆ هاوکاریی نێوان ئێمە و هەموو هێزە نیشتمانپەروەر و پێشکەوتووەکان هەیە:

١. هەوڵدان بۆ دامەزراندنی ڕێژیمێکی دێموکراتیک لە

ئێراندا.

٢. دابینکردنی مافی خودموختاریی تەواوی گەلانی ئێران لە چوارچێوەی ولاتی ئێراندا.

٣. دابینکردنی ئازادییە دێموکراتیکەکان بۆ تەواوی حیزب و رێکخراوە سیاسی نەتەوەییەکان بە بێ جیاوازی.

٤. گەلالە دارشـتنی سیاسـەتێکی ئابووری لە بەرژەوەندیی کۆمەلانـی خەلکـدا و پۆشـتەکردنی ئاسـتی ژیانـی زەحمەتکێشان.

٥. چارەسـەری مەسـەلەی زەوی بە قازانجی جووتیارانی هـەژار و نێونجەکان. زەوی هی کەسـێکە کە لە سـەری کار دەکا.

٦. سـنوردارکردنی کاتەکانی کاری حەوتووانەی کرێکاران و دابینکردنـی بیمـەی گشـتی بـۆ تـەواوی کرێـکاران و زەحمەتکێشان.

٧. ریشـەکێش کردنی نەخوێندەواری و بردنەسەری پێگەی فەرهەنگی و زانستیی خەلک لەسەر بنەمای پەرەپێدانی زمانی زگماکی تەواوی گەلانی ئێران.

٨. کۆتایـی هێنـان بـە نفـووزی ئیمپرالیـزم بەتایبەتـی ئیمپریالیزمـی ئەمریـکا و وەدەرنانی پەیمانـە نیزامییەکان و دەرکردنی سیاسەتێکی سەربەخۆی دەرەکی.

٩. پشـتیوانی لە بزاڤـی ئازادیخوازی تـەواوی نەتەوەکانی جیهان و بەرگری لە ئەسـلی مافی نەتەوەکان لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیاندا.

١٠. پێکهێنانی پێوەندیی دۆسـتانە لەگەل تەواوی ولاتاندا لە سـەر بنەمای رێزلێنانی بەرانبەر و ناسـینی مافی دەسەلاتی نەتەوەیی و دەسـتوەرنەدان لـە کاروباری نێوخۆی یەکدی و

پتەوکردنی پێوەندییەکی دۆستانە و ...»

دوکتور قاسملوو لە برگەی کۆتایی وتەکانیدا بە پێداگری لەسەر بەرنامەو بۆچوونەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، دەڵێ:

«دەبێ دێموکراسی فێر بین و رایبهێنن. کوردستانیش وەک تەواوی ئێران موڵکی تایبەتی هیچ حیزب و رێکخراوێکی سیاسی نیە. هەموو دەبێ راوبۆچوونی خۆمان بە خەڵکی بگەیەنین و ئەوە خەڵکن کە دەبێ بتوانن ئازادانە رێگەو رەوشی خۆیان هەڵبژێرن. هەر چەشنە تیرۆرێکی فیکری دەبێ لە نێو بچێ و هیچ کەس نابێ بە هۆی بیروباوەڕ و فیکرەکانی بکەوێتە ژێر گوشارەوە.

ئەرکی دۆستان و لایەنگران و ئەندامانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە کە ئامانج و بەرنامەکان و داواکانی حیزب لە نێو گرووپە جۆرەبەجۆرەکانی خەڵکی کوردستان لە رێگەیەکی دێموکراتیکەوە تەبلیغ بکەن...»

«ئاکامی خەباتی یەکپارچەی ئێمە، کۆمارێکی دێموکراتیکی راستەقینە بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستانی ئێرانە.»

## ■ ١٧: شەڕی نەورۆزی خوێناویی سنە (١٣٥٨)

پاش سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران لە ٢٢ی ڕێبەندانی ١٣٥٧ی هەتاویدا لە شاری سنە دوو کومیتە پێک هاتن. کومیتەیەکیان بە سەرپەرەستیی ئەحمەد موفتیزادە و دووهەمیشیان بە سەرپەرەستی ئاخوند سەفدەری کە دیارە سەفدەری بە هۆی شیعە بوونییەوە بوو بە دەسەڵاتی بڕیاردەر لە کومیتەی ئینقلابی ئیسلامیدا و سەرۆکایەتیی پادگانیشی پی ئەسپێردرا کە بەردەوام هاتوچووی پادگانی دەکرد و لە رێکخستنەوەی هێزە ئینتزامییەکانی ئەم پادگانەدا دەوری دەگێڕا. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە ناوبراو کەمترین لایەنگری لە

نێو خەڵکی شــاری سنەدا نەبوو، بەڵام ئەحمەدی مۆفتیزادە خاوەنی پێگەیەکی جەماوەری بوو و ڕێژیم بە هۆی ســونی بوونیەوە بڕوای پێ نەکردبوو کە ئەو ئەرکانەی پێ بسپێرێ.

لــە لایەکــی دیکــەوە، مۆفتیــزادە کــە لەگەڵ کــەم لوتفیــی ڕێژیم بــەرەوڕوو بــوو، «ســتادی ئینقلابــی ئیســلامی» خۆی پێــک هێنا و لــە بینای ئۆســتانداری جێگیر بــوو. لەم ڕۆژە بەدواوە ســەفەرە بەردەوامەکانی بۆ تاران، قوم، سیســتان و بەلووچستان و هەروەها ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردســتان دەســت پێ کرد کە هەموو ئەم سەفەرانە بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆی بوو.

بوونــی دوو کومیتــەی ئینقلابــی ئیســلامی لــەم شــارەدا بوو بە هۆی کێبڕکێیەکی توند و شــاری ڕۆژبەڕۆژ بــەرەو نائەمنی دەبرد. کێشــەی ئەم دوو لایەنە ئەگەر توندڕەویی هێزە چەپەکانیشــی بێتە ســەر، وەزعییەتی زۆر ئاڵۆز دەکرد، دەســەڵاتی تــازەی ناوەندیش بیروباوەڕی بە نیســبەت کوردستان و خەڵکی کوردەوە نەک لەگەڵ ڕێژیمــی پێشــوو جیاواز نەبــوو، بەڵکوو بە هــۆی مەزهەبی بوونی ســەردەمدارانی تازە بە دەســەڵات گەیشــتووەوە کێشەی جیاوازیی مەزهەبیشی لێ زیاد ببوو، ئەمە وەزعەکەی ئاڵۆزتر کردبوو.

لە ڕۆژی ٢٦ی ڕەشەمەی ١٣٥٧ ئەحمەدی موفتیزادە لە نامەیەکدا بــۆ ســەرهەنگ ســەدری، فەرماندەی لەشــکری ٢٨ی ســنە داوای چەکــی لێ کــردن کە ناوبراویش دەڵێ پێدانی چــەک بەوان دەبێ بە ڕەزایەتی نوێنەری خومەینی واتە سەفدەری بێ. نەفەراتی موفتیزادە بــەم وەڵامە زۆر ناڕەحەت دەبن، ســەفدەریش بــەو بیانووە کە ئەو چەکوچۆڵە دەفرۆشرێت ئامادە نابێت چەکوچۆڵ بە مۆفتیزادە بدات. لەم لاشــەوە دەنگۆیــەک بڵاو دەبێتەوە کە ســەفدەری چەکەکانی لە پــادگان بردووە و ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لایەنگرانی موفتیزادە لە ڕۆژی ٢٧ی ڕەشــەمەی ١٣٥٧ لە بەر دەرکی کومیتەی سەفدەری

داوای چەک دەکەن کە لە لایەن کەسێکەوە لە کومیتەی سەفدەری بە ناوی شاتر محەممەد تەقەیان لێ دەکرێ و کەسێک بە ناوی «حەمید دلاوەری» دەکوژرێت و دوو کەسیش بریندار دەبن کە ئەمە دەبێتە هۆی تەقەی بەرانبەر و بەم چەشنە خەڵک دەوری پادگان دەگرن، بەڵام پادگان ئامادە نابێ چەک بە خەڵک بدات و تەقە لە خەڵک دەکەن. ئەم تەقەکردنە بە بڕیاری سەرلەشکر قەرەنی، فەرماندەی ستادی هاوبەشی ئەرتەش بوو کە لەوێدا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک دەکوژرێن و بریندار و دەستگیر دەکرێن. ڕۆژی ٢٨ی ڕەشەمە بێجگە لە تەقە بە چەکی سووک، پادگان ئاگری تۆپخانەی خۆی بۆ کوتانی شار دەخاتە کار و هیلیکۆپتەرەکانی ڕێژیمیش بە دەستڕێژی موسەلسەلەکانیان ژمارەی کوژراو و بریندارەکان زیاتر دەکەن.

پاش بڵاوبوونەوەی دەنگۆی ئەم شەڕە خەڵک لە شار و گوندەکانی کوردستانەوە بە هێنانی ئازووقە و هەروەها بەشداریی چەکدارانە لەو شەڕەدا دێنە یارمەتیی خەڵکی سنە. لەم شەڕەدا فەرماندەی لەشکری سنە دەگیرێت و پاش ئەمە لە لایەن شووری ئینقلابەوە پێشنیاری ئاگربەست بە دەوڵەت دەدرێ کە لە لایەن دەوڵەتەوە ئەم پێشنیارە قبووڵ دەکرێ، بەڵام بە قبووڵی ئاگربەسیش لە لایەن پادگانەوە درێژە بە تۆپ و خومپارەبارانی شار دەدرێ. شەوی ٢٩ی ڕەشەمە تێکهەڵچوونەکە توندتر دەبێ و پادگان زۆر بە توندی شار دەداتە بەر تۆپ و خومپارەباران. لە کرماشانەوە هیلیکۆپتر هێزی یارمەتیدەر دەگوازێتەوە بۆ پادگان. لە ڕۆژی یەکەمی ساڵی ١٣٥٨ واتە یەکەمین نەورۆزی ئازادیدا لە باتی کردنەوەی ئاگری نەورۆز و تەقەی شادی، شار لە ژێر بۆردمان و تۆپبارانێکی خەستی پادگانی سنەدا بە سەر دەبات.

لە ڕۆژی یەکەمی نەورۆزدا وەفدێک پێکهاتوو لە تاڵەقانی، بەهەشتی، ڕەفسەنجانی، بەنی سەدر، لە شووری ئینقلاب و لە لایەن دەوڵەتیشەوە

ئەحمەد سەدر حاج سەید جەوادی (وەزیری ناوخۆ) و یەحیاخان سادق وەزیری (نوێنەری کانوونی وکەلا) و.....

لە لایەنی بەرانبەردا ژمارەیەک لە شـــوورای شار، موفتیزادە و شێخ عێزەدین پێکەوە کۆ بوونەوە کە لەم دانیشتنەدا وەزیری ناوخۆ رایگەیاند کە دەســـەڵاتی پێ نەدراوە و هاوکات فڕۆکەکانی رێژیم بە سەر شاردا خەریکی مانۆڕدان بوون کە ئەمەش بوو بە هۆی نارەزایەتی دەربڕینی خەڵـک. هـــەر بۆیە لە لایـــەن وەزیری ناوخـــۆوە بە تەلەگـراف داوا لە سەرلەشـکر قەرەنی فەرماندەی ستادی ئەرتەش کرا کە سووڕانەوەی ئەو فڕۆکانە بە سەر شاردا رابگرێ کە ئەم داوایەش لە لایەن قەرەنییەوە قبووڵ نەکرا. پاش وتووێژێکی زۆر لە لایەن وەفدی رێژیم و نوێنەرانی خەڵکـــەوە گەڵاڵەیـــەک درایە وەفدی دەوڵەت و ئەمە بوو بە هۆی خراپ تێگەیشتنێک کە گوایە تاڵەقانی خودموختاریی قبووڵ کردووە.

ئـــەوەی کە بڕیـــاری کۆتایی لە نێوان تاڵەقانی و خەڵکی ســـنەدا بوو، ئەوە بوو کە هەر دوو کومیتەی ســـەفدەری و مۆفتیزادە هەڵوەشێنەوە و لە باتی ئەوە کومیتەیەکی کاتی کە نوێنەرێکی تاڵەقانی تێدا بێت، پێک بێـت کە ئەرکی بەڕێوەبردنی شـــاری بکەوێتە ئەســـتۆ و ئەو زیندانیانە کە لە لایەن پادگانی ســـنەوە گیراون ئازاد بکرێن و تاڵەقانی «موزەفەر پەرتەوماە»ی وەکوو بەرپرســـی ئەو کومیتەیە دیاری کرد کە لە لایەن شـــوورای موەقەتی شـــاری سنەوە جێگای پەســـەند نەبوو. ئەرکی ئەم کومیتەیە هەڵبژاردنی شـــوورای شـــار بوو. ژاندارمری و شارەبانی بە هەڵوەشـــاوە راگەیەندران و دوکتور ئیبراهیم یوونسی کە توودەییەکی کۆنەکار بوو، وەک ئوستانداری سنە دیاری کرا.

لەم شەڕەدا زیاتر لە ٣٠٠ کەس شەهید و نزیکەی ٥٠٠ کەس بریندار و زیاتـــر لـــە ٢٥٠ کەس دەستبەســـەر دەکرێن و زیانێکـــی زۆری ماڵی وەبەر خەڵک و شـــار دەکەوێ. لە کۆتایی ســـەفەری هەیئەتی دەوڵەتدا ناکامی وتووێژی دەوڵەتیشـــیان لە رادیۆ و تەلەڤیزیۆن راگەیاند کە لەو

ڕاگەیەنـدراوەدا گوترابوو کە ئینقلابی ئیسـلامیی ئێران دابینکردنی ئەم ئامانجانەی خوارەوە گەرەنتی دەکات.

١. لە دانانی یاسای بنەڕەتیی نوێی ئێراندا ئێوەش هاوبەش و بەشدار دەبـن و لەم یاسـایەدا مافەکانی هەموو خەڵکـی ئێران و لەوانە خەڵکی شەریفی کوردستان دەستەبەر دەکرێن.

٢. خەڵکـی کوردسـتان بۆ پـەرەدان بە فەرهەنگی ڕەسـەنی کوردی ئازادیی تەواویان دەبێ و زمانی کوردی لە تەنیشـت زمانی فارسـی لە ناوچە کوردنشینەکاندا ڕەسمی دەبێ.

٣. کوردسـتان وەک هەموو ئوسـتانەکانی دیکـە کاروباری ناوچەی خـۆی بە ئیرادە و ویسـتی خەڵـک بەڕێوە دەبات و هیچ بەرپرسـێکی ئیداری بە سەریاندا ناسەپێنرێ.

٤. بـە خەڵکی کوردسـتان هەمـو ئیمکاناتێک دەدرێ تا سـەرچاوەی ئابووریـی خۆیـان لـە ڕێـگای خۆشـبژێویی خۆیانـدا بـە بـێ هیـچ چەوسانەوەیەک بە کار بێنن.

٥. خەڵکـی کوردسـتان هـەر وەک خەڵکی سەرانسـەری وڵات مافی بەشـدارییان لە سیاسەتی گشـتی و دیاریکردنی چارەنووسی وڵاتدا بە بێ هیچ هەڵاواردنێک لە بەرچاو دەگیرێ.

٦. دەوڵەتـی ئیسـلامیی ناوەنـدی پاڵپشـتیی تـەواوی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە خەڵکی مەزڵووم و چەوساوەی کوردستان لە سەرەوەی بەرنامەکانی خۆی دادەنێ و قەرەبووی دواکەوتووییەکانی پێشووشـی بۆ دەکاتەوە.

٧. دەبێ ئازادیی خەڵکی کوردسـتان بۆ کەڵک وەرگرتن لە کەلەپوور و بەڕێوەبردنـی داب و نەریتەکانی کوردەواری کەمترین گیر و گرفتی بۆ نەیەتە پێش.

وەفدی نوێنەرایەتیی ئیمام خومەینی
١٣٥٨/١/٥

وەک دەبینیــن لە خاڵی شەشــەمدا بە بێ ئــەوەی بیروڕای خەڵکی سەرانســەری وڵات وەرگیرابێ، ناوی دەوڵەتی ئیسلامی هاتووە کە ئەمــە بۆ خۆی نیشــاندەری نیەتــی ڕێبەرانی ڕێژیمە بــە بێ ئەوەی ڕیفراندۆمێک ئەنجام درابێ.

خاڵــی جێگای ســەرەنج ئەوەیەکــە هەرگیز ئەم خاڵانــە کەمترین هەنگاویان بۆ هەڵنەگیرا و وەک جەوهەری سەر کاغەز مانەوە و بگرە ڕێژیم لە باتی لە بەرچاوگرتنی داخوازییەکانی خەڵکی کوردســتان و دابینکردنــی مافەکانیان، ڕێگای ســەرکوت و زەبروزەنگی گرتە بەر کە لە درێژەی ئەم ڕوداووانەدا بەشێک لەو سەرکوت و زەبروزەنگە دەخرێتە بەرچاوی خوێنەر.

## ■ ١٨: ڕیفراندۆمــی دیاریکردنی نیزام، یەکەم شانۆســازیی ڕێژیم (١٣٥٨)

ڕۆژی ١٠ خاکەلێوەی ساڵی ١٣٥٨ی هەتاوی ڕێژیم لە شانۆسازییەکدا بــە ناوی ڕیفراندۆم داوای لە خەڵکی ئێــران کرد نەزەری خۆیان لە سەر شێوازی ڕێژیمی داهاتوو دەرببڕن. ئەم داواکارییە کە لە شکڵی ڕیفراندۆمــدا بەڕێوە چوو، ئەگەرچی ڕواڵەتێکی دێموکراتیکی هەبوو و داوای لە خەڵک دەکرد بۆ دیاریکردنی نیزام دەنگ بدەن، بەڵام ئەو پرســیارەی کە هاتبــووە گۆڕێ، زۆر نادێموکراتیــک و پاوانخوازانە بــوو و لــە باتی ئەوەی کە خەڵک سەرپشــک بکرێ لــە هەڵبژاردنی سیســتمە ناســراوەکانی دنیادا، سەرپشــک کرابوو لە هەڵبژاردن لە نێوان ڕێژیمی پاشــایەتی و کۆماری ئیســلامیدا. زۆر ڕوون بوو لە کاتێکدا کە هەر ٤٠ ڕۆژ بە سەر رووخانی ڕێژیمی پاشایەتیدا تێپەڕ دەبوو و ڕێژیمی پاشــایەتی ســەمبۆلی فاشــیزم و سەرەڕۆیی بوو، خەڵــک ئامــادە نابــێ دەنگ بە ڕێژیمی پێشــوو بدا و دەنــگ دەدا بە کۆماری ئیسلامی کە چار ناچار دەنگی وەردەگرت.

لــە چوارچێــوەی ئــەم ریفراندۆمەدا بــوو کە حیزبــی دێموکراتی کوردســتانی ئێران و خەڵکی کوردســتان لە بەر دوو هۆکار بڕیاری بایکوتی ریفراندۆمیان دا، یەکەم ئەوەی کە هیچ وێنایەک لە سیستمی کۆماری ئیســلامی لە ئارادا نەبوو تاکوو وەها سیســتمێک بۆ خەڵک ناســراو بێ و بتوانن باشــی و خراپییەکانی لێــک بدەنەوە. دووهەم ئەوەی کە پێش لەوەی جۆری سیســتم دیاری بکرێت، پێویست بوو یاســای بنەڕەتیی وڵات بنوســرێ تا ڕوون بێت کــە ناوەڕۆکی ئەو نیزامــە لە یاســای بنەڕەتیدا چۆن پێناســە کراوە و مــاف و ئەرکی خەڵک و دەســەڵات لە بەرانبەر یەکتردا ڕوون بکرێتەوە و لە ســەر ئــەم یاســایە روونکردنەوەیەک بە خەڵک بــدرێ تاکوو خەڵک بزانن دەنگ بە چ جۆرە نیزامێک دەدەن، ئەم شــێوە ڕاپرســییە مرۆڤ وە بیری ئەم پەندە کوردییە دەخاتەوە کە دەڵێ: «سمۆرەت دەوێ ئەوە سمۆرە، کەروێشکت دەوێ ئەوە سمۆرە».

یەکەم ئامارســازییەکانی ڕێژیمیش کە هەر لــە ئەم ریفراندۆمەوە دەســتی پێ کرد، ڕاگەیاندنــی ئاکامی ریفراندۆم لــە ١٢ی خاکەلێوە بوو کە ڕاگەیەندرا ٩٨٪ی خەڵک دەنگیان بە کۆماری ئیسلامی داوە. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە نیوەی خەڵکی کوردستان لە ریفراندۆمەکەدا بەشــدارییان نەکردبــوو، دووهەم ئــەو کات و دواتریــش کۆمەڵێک لــە ڕووناکبیرانــی ئێرانی ئەو ئامارســازییەیان لەقــاو دا و دوکتور لاجەوەردی کە یەکێک لە بەڕێوەبەران و پێکهێنەرانی ئەو ریفراندۆمە بــوو، لە کاتــی بەڕێوەچوونیدا لــە چەندین وتووێــژی تەلەڤیزیۆنی و لــە تەلەڤیزیۆنی «تیشــک»دا پەردەی لە ســەر ئەم ئامارســازییە هەڵدایەوە.

ئەم هەڵوێســتەی حیزب هەر چەند شــوێنەواری ئەرێنیی لە ســەر کاربەدەستانی ڕێژیمی تازە بە دەسەڵات گەیشتوو دانەنا، بەڵام نیشان دەدات کــە حیزبی دێموکــرات لەو قۆناغە مێژووییەدا هەڵوێســتێکی

دروســت و ئازایانــە و دووربینانــەی هەبــووە و نەکەوتۆتــە داوی ســاختەکارییەکانی دامەزرێنەرانی ڕێژیم و ئەو لایەنە سیاســییانەی کە هەوڵیان دەدا خەڵک بکێشــنە ســەر ســندووقەکانی دەنگدان بەو ڕێژیمە.

## ■ ١٩: هەوڵــدان بۆ دابینکردنی ئاشــتییانەی داخوازییەکانی خەڵکی کوردستان (١٣٥٨)

لە ڕۆژی ١٣٥٨/١/٨ی هەتاویدا وەفدێک بە سەرۆکایەتیی دوکتور قاســملوو بە مەبەستی وتووێژ ســەبارەت بە داواکارییەکانی خەڵکی کوردســتان، ســەردانی خومەینــی و موهەندیس بازرگان ســەرۆک وەزیرانی دەوڵەتی کاتیی کرد.

لــە نێــو ئەو وەفدەدا «دوکتور قاســملوو، غەنــی بلووریان، ئەمیر قازی، محەممەد ئەمین ســراجی نوێنەری شنۆ و نەغەدە و هەروەها ســارمەدین ســادق وەزیــری» هەبوون کــە لە «قــوم» چاویان بە خومەینــی کەوت. لە وتووێژێکی چاپەمەنیــدا لەگەڵ هەواڵنێرە بیانی و نیوخۆییــەکان دوکتــور قاســملوو لە ســەر وتووێژەکەیان لەگەڵ خومەینیــدا دەڵــێ: «لــەو وتوویــژە لەگــەڵ خومەینی ویســتەکانی خەڵکــی کوردســتانمان لەگەڵدا باس کــرد و نیگەرانیی خۆمانمان لە ئاژاوەنانەوەی دژە شۆڕش لە کوردستان پێ ڕاگەیاند و خومەینیش لە وەڵامدا پێداگریی لە ســەر ئەوە کــردەوە و گوتوویە کە بە بێ لە بەرچاوگرتنــی مەزهــەب و نەتەوە، هەموان دەبێ مافی یەکســانیان هەبــێ و ئازادانە بە بێ هیچ چەوســاندنەوەیەک لــە ئێراندا بژین کە ئێمــە هیواداریــن لە داهاتوودا تێگەیشــتنێکی زیاتر لــە نێوان ئێمە و ڕێبەری شۆڕشدا پێک بێ.

پــاش چاوپێکەوتــن لەگــەڵ خومەینــی، هەیئەتــی ناوبــراو لەگەڵ موهەندیس بازرگان ســەرۆک وەزیرانی دەوڵەتی کاتی و داریووش

فرووهەر وەزیری کار چاوپێکەوتنیان کرد. دوکتور قاسملوو وێڕای پیرۆزبایی لە موهەندیس بازرگان سەبارەت بە بوونی بە سەرۆک وەزیران، بە درێژی لە سەر وەزعی کوردستان و ویستەکانی گەلی کورد لە چوارچێوەی خودموختاریدا قسەی کرد کە لە یاسادا بگونجێ و داوای کرد بۆ روونکردنەوەی ئەم داخوازییانەی، ڕێگای پێ بدرێ لە رادیۆ و تەلەڤیزیۆنی سەرانسەری سەبارەت بە ویستەکانی خەڵکی کوردستان روونکردەوە بدات. موهەندیس بازرگان لە وەڵامدا ویستی خودموختاریی نێوخۆیی بە شتێکی پەسەند زانی و گوتی دەبێ لە یاسای بنەڕەتیدا بگونجێ و بۆ وتوویژ لەگەڵ خەڵکی کوردستان بەڵێنیی دا وەفدێک پێکهاتوو لە وەزیری ناوخۆ و کار پێک بێنێ تا لەگەڵ نوێنەرانی راستەقینەی خەڵکی کوردستان وتوویژ بکەن. بازرگان هەروەها گوتی کەڵک وەرگرتن لە رادیۆ و تەلەڤیزیۆن بۆ روونکردنەوەی رای گشتی لە پێوەندی لەگەڵ ویستەکانی خەڵکی کوردستان و ناوەڕۆکی خودموختاری گرفتێک لە ئارادا نیە، بەڵام کاتێک وەفدی حیزبی دێموکرات داواکەیان لەگەڵ رادیۆ و تەلەڤیزیۆن باس کرد، وەڵامیان نەدرایەوە.

لە درێژەی ئەم چاوپێکەوتنانەدا دوکتور قاسملوو رۆژی ١٣٥٨/١/١٦ی هەتاوی کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ کوردەکانی دانیشتووی تاران پێک هێنا و لەو کۆبوونەوەیەدا داوای لە کوردەکانی تاران کرد بۆ روونکردنەوەی بیروڕای خەڵکی غەیرە کورد تێبکۆشن. ئەو گوتی لەگەڵ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی فارس دەزانن کە خودموختاری جیاییخوازی نیە، بەڵام دیسان دژی ئەم ویستە دەوەستن.

بۆ جاری دووهەم پاش شەڕی نەغەدە لە ٣١ی خاکەلێوەی ١٣٥٨ی هەتاوی دوکتور قاسملو دەچێتەوە تاران و لەگەڵ خومەینی بۆ ماوەی ٥٠ خولەک کۆ دەبێتەوە و داوای لێکۆڵینەوە لە سەر شەڕی

نەغـەدە بـۆ روونبوونەوەی کەس یا کەسـانی تاوانبار لە خومەینی دەکـەن و بۆ جارێکی دیکەش مەسـەلەی ئیدارەکردنی کوردسـتان لەگـەڵ خومەینی دێنێتە گۆڕێ، بەڵام لەم سـەفەرەدا دەوڵەت ئامادە نەبـوو وەفـدی حیزب ببینێ، وەفـدی حیزب زیاتر لـە حەوتوویەک چاوەڕوانی وەڵامی بازرگان سەرۆک وەزیرانی ئێران مانەوە.

لەم کاتەدا دوکتور قاسـملوو پێشـنیارەکانی حیزبی دێموکرات بۆ چارەسەری دەخاتە بەر دەستی دەوڵەت کە بریتی دەبن لە:

١. داوا دەکـەن دەوڵـەت هەڵویسـتی خـۆی بەرانبەر بە ویسـتی خودموختاری کە لە لایەن حیزبی دێموکراتەوە دراوە، رابگەیەنێ.

٢. داوا دەکـرێ دەوڵەت لە ناردنـی هێزی ئەرتەش و هەواپەیما و هێلیکۆپتەر و موجاهید و پاسـدار کە بە کردەوە ڕەچاوی بێ لایەنی لـە نێوان کـورد و تورکدا ناکەن و هەروەها بـۆ ناوچەکانی دیکەی کوردسـتانیش هێـز نەنێردرێ بـۆ ئەوەی تەحریـک و دژکردەوەی خەڵکی لێ نەکەوێتەوە.

## ■ ٢٠: شەڕی نەغەدە (١٣٥٨)

دوای ئـەوەی کـە ڕۆژی ١١ی ڕەشـەمەی ١٣٥٧ی هەتـاوی لـە میتینگی سـەد هەزار کەسیی سـتادیۆمی وەرزشیی شاری مەهاباد، حیزبـی دێموکرات دەسـتپێکردنەوەی تێکۆشـانی ئاشـکرای خۆی ڕاگەیانـد، وەک سـوننەتێکی لـێ هاتبـوو لـە هەموو شـارەکان بۆ دەسـتپێکردنی چالاکیـی حیزبی میتینگ بەڕێـوە بچێت. ڕۆژی ٣١ی خاکەلێـوەی ١٣٥٨ی هەتاوی شـاری نەغەدەش لە چوارچێوەی ئەو ڕەوتە گشتییەدا دیاری کرابوو بۆ پێکهێنانی ئەو میتینگە حەوتوویەک پێشـتر لەگەڵ پیاوماقوولانی، کەسـایەتییە ئایینی و بـە نفووزەکانی شاری نەغەدە قسەکرا بوو و موافقەتی هەر دوو لا واتە ئازەرییەکان و کوردەکان وەرگیرابوو.

ئـــەم کۆبوونەوە تەنیــا بۆ کــوردەکان پێک نەهاتبــوو، بەڵکوو بۆ ئازەرییەکانیــش پێک هاتبوو کە ئەندامی حیزب بوون و لە قەدیمەوە هاوســەنگەری حیــزب و هاوپەیمانــی بــوون و ئەم میتینگــە زیاتر پێداگرتــن لە ســەر برایەتی و پێوەندیی برایانە لــە نێوان دوو گەلی کورد و ئازەریدا بوو.

ڕەنگــە لــە بەر ئــەم هۆیــە بێت کــە داروودەســتەی «قەتــاری و مەعبوودی» دوو مۆرەی بەدناو و خائینی زەمانی شــا کە لە لایەن ئاخونــد «حەســەنی» ئیمام جومعە و نوێنــەری خومەینی لە ورمێ پشــتیوانیان لێ دەکرا پیلانگێڕی دژی میتینگەکە دەســتی پێ کرد و کاتێک پەیامی حیزب لە لایەن دوکتور «قاسملوو»ەوە خوێندرایەوە، میتینگەکــە درایە بەر تەقە و ئەم تەقەیــە تا ڕۆژی ٣ی بانەمەڕ هەر درێــژەی هەبــوو. ئەگەرچی ئەم پیلانە بۆ هەمیشــە ســەر نەکەوت، بــەڵام دەبێ قبــووڵ بکەین بە شــێوەی کاتی ســەرکەوت و توانیان سەدان نەفەر لە هەر دوو لا بە کوشتن بدەن.

حەســەنی بە تەواوی ئیمکاناتییەوە ئازەرییەکانی دژی کوردەکان بەســیج کرد و لە هەمــوو ناوچە ئازەرینشــینەکان کۆمەکی دەهێنا. ئەرتەش کە ڕایگەیاندبوو بێ لایەن دەمێنێ، بێ لایەن نەما و بە تانک و تۆپ کەوتنە کوتانی ناوچە کوردنشینەکان و ئەو شوێنانە کە کوردیان تێدا بوو. لە ڕۆژی ٢ی بانەمەڕیش کاتێک دەســتەیەکی نوێنەرایەتیی کورد لە مەهاباد بۆ چارەسەری گیروگرفتی نەغەدە و هەوڵی ڕاگرتنی شەڕ بە بێ چەکدار و پارێزگار چووبوونە شارۆچکەی محەمەدیار و بە ئاشکرا لە لایەن چەکدارانی «حەسەنیەوە» هەرەشەی کوشتنیان لێ کرا، ئەگەر هەوڵی یەک دوو کەس لە کاربەدەستانی ئۆستانداری نەبوایــە کــە حەزیــان دەکرد شــەڕەکە کۆتایی پێ بێ، لە باشــترین حاڵەتــدا هەموو ئەندامانی دەســتەی نوێنەرایەتیی کــورد بە بارمتە دەگیران. بەو حاڵەش دەستەی نوێنەرایەتیی کورد بەبێ تەلەفات دەر

نەچوو و «عوسمان کریمی» کە لەگەڵ نوێنەرانی کورد بە مەبەستی چاوپێکەوتنی هێندێک بە بارمتەگیراوی بانەیی چووبووە «محەممەد یار» بە شێوەیەکی گوماناوی بێسەروشوێن کرا و پاش دوو ڕۆژ تەرمەکەی دۆزرایەوە کە بە دەستی پیاوانی حەسەنی کوژرابوو.

حیزب لە بەر تەشەنە نەکردنی دوژمنایەتیی نێوان کورد و ئازەری ڕۆژی ٢ی بانەمەڕ ئاگربەسی ڕاگەیاند و ڕۆژی ٣ی بانەمەڕ شەڕەکە بە یەکجاری کۆتایی پێ هات.

هەر چەند حیزب هەوڵی دا تاوانباران بناسێنێ و چەند جار هاتوچۆی ورمێ و تاران و قومی کرد، بەڵام هیچ فایدەی نەبوو. «مەهدی بەهادوران» کە لە سەرەتای پاییزی ساڵی ١٣٥٨ی هەتاویدا بە نوێنەرایەتیی شەخسی خومەینی سەری لە ناوچەکە دابوو، لە ڕاپۆرتی خۆیدا بۆ خومەینی هەر چەند «حەسەنی، قەتاری و مەعبودی» بە تاوانبار ناسی و بە خومەینیی ڕاگەیاند، بەڵام هیچ ئیجرائاتێک لەم بارەوە نەکرا.

شەڕی نەغەدە بۆ ماوەیەک کاریگەریی لە سەر پێوەندیی نێوان کورد و ئازەرییەکان دانا و ڕێژیم توانی ئازەرییەکان دژی گەلی کورد هان بدا و جینایەتەکانی «قاڕنێ و قەڵاتان، ئیندرقاش، سۆفیان، حەلبی، کۆکیان، سەوزە و سەرچنار و حەسەن نوران» ئاکامی ئەم ڕقە بوو. بەڵام پاشان ئەم ڕەوتە بەرەبەرە بەرەو باشی ڕۆیشت و ئەم دوژمنایەتییەی ئازەرییەکان لە دژی حیزب نەما، چوونکە بۆیان دەرکەوت کە دوژمنی هەر دوو لایان ڕێژیمە.

### ■ ٢١: هەڵبژاردنی مەجلیسی خوبرەگان (١٣٥٨)

ڕۆژی ١٢ی گەلاوێژی ١٣٥٨ی هەتاوی هەڵبژاردنی خولی یەکەمی مەجلیسی خوبرەگان بەڕێوە چوو. ڕۆژی ٢٨ گەلاوێژ هاوکات لەگەڵ دەستووری جیهادی خومەینی دژی گەلی کورد، نوێنەرانی

هەڵبژێردراو بۆ مەجلیسی خوبرەگان کە لە جێی مەجلیسی دامەزرێنەران بۆ دانانی یاسای بنەڕەتی دیاری کرابوو، دەستیان بە کاری خۆیان کرد. شێوەی هەڵبژاردنەکە ئوستانی بوو. لە ئوستانی ورمێ دوکتور قاسملوو دەنگی یەکەمی هێنابوو و کاتێک ویستی لەم هەلومەرجەدا بۆ کاری نوینەرایەتیی مەجلیسی خوبرەگان بەرەو تاران بچێ، کومیتەی ناوەندی ڕێگای چوونی پێ نەدا، چوونکە دیار بوو لەو هەلومەرجەدا لە باشترین حاڵەتدا دوکتور قاسملوو دەستبەسەر دەکرێت. لە کۆنایيدا ڕۆژی ٢٨ی گەلاوێژ کاتێک کە ئەندامانی ئەو مەجلیسە چوونە لای خومەینی، ناوبراو سەبارەت بە دوکتور قاسملوو رایگەیاند «ای کاش امده بود» واتە «بریا هاتبا، چوونکە دەمەویست لێرە رای بگرم».

## ■ ٢٢: شەڕی پاوە و فتوای جیهادی خومەینی دژ بە خەڵکی کوردستان (١٣٥٨)

لە هاوینی ساڵی ١٣٥٨دا جەوی شاری پاوە بەهۆی دنەدانی «زولفەقاری»، نوینەری ڕێژیم و جەماعەتی «مەکتەبی قورئان»، ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر بەرەو ئاڵۆزی دەچوو. ڕۆژێک بەهۆی وەرگەڕانی ماشینەوە دوو بەکرێگیراوی ڕێژیم کە بۆ گەڕان چووبوونە دەرەوەی شار، دەمرن و چەند کەسێکیش برینداردەبن. مەکتەبییەکانی شاری پاوە دەنگۆی ئەوەیان بڵاو کردبووەوە کە حیزبی دیمۆکرات نارنجۆکی لە ژێر ئەو ماشینە داناوەتەوە، بۆیە هەڵادێراوە و لەم لاشەوە زولفەقاری لە دنەدان و ڕێکخستنی سپای پاسداران خافڵ نەبوو.

لەم هەلومەرجەدا لە شوورای ١١ کەسیی شاری پاوە، سێ کەسیان سەر بە حیزب بوون. ئەو سێ کەسە ئەوپەڕی هەوڵی خۆیان دەدا کە ئاڵۆزی لە شارەکەدا کەم بکرێتەوە، بەڵام ٨ کەسەکەی دیکە بە

هاوکاریــی مەکتەبی قورئان و زولفەقاری، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تۆوی دووبەرەکایەتییان لە نێو خەڵکدا دەچاند و ئاڵۆزییەکەیان زیاتر دەکرد و بە قســەی خۆیان دەیانهەویســت دەسەڵاتەکەیان یەکلا بکەنەوە و تەحەمولی نەزەری موخالیفی خۆیان نەبوو.

هاوکات، هاتوچۆی شــیوعییەکان بۆ پاوە و دۆســتایەتییان لەگەڵ ژمارەیــەک لــە ئەندامانــی ڕێکخــراوی حیــزب لەو شــارە و هاتنی «عەبدولوەهاب ئەترووشی» بۆ پاوە و ڕاوەدوونانی لە لایەن یەکیەتیی نیشــتمانییەوە کە سەرپەرشتیی هێزەکەی یەکیەتی لە ئەستۆی مەلا بەختیار بوو، ئاڵۆزییەکی سەیری پێک هێنابوو. ئەم کۆمەڵە ڕووداوە دەســتیان دایە دەســتی یەک و بیانوویان بۆ مەکتــەب قورئانییەکان خۆش کرد تا ڕۆژی ١٣٥٨/٥/٢٢ی هەتاوی تێکهەڵچوونی دوو کەس بە ناوەکانی محەممەدخان وەیســی (خەڵکــی باینگان) و حەبیبوڵڵای مەلا شــەریفی (خەڵکی شــاری پــاوە) کە عامیلی ڕێژیــم بوو، کرایە بیانوو و هەڕەشەیان لە دووکاندارەکانی شار کرد تا دووکانەکانیان دابخــەن و بڕۆنــە فەرمانداری و ســەبارەت بەم دۆخــە مان بگرن. ئــەوە بوو کە مانگرتن دەســتی پێ کرد، هێشــتا مانگرتووەکان هیچ داواکاری یــا بڕیارێکیان دەرنەکردبوو کە هێزێکی کۆماندۆی دەورە دیتوو لە لوبنان، بە ســەرۆکایەتیی «ئەبوو شەریف» بە هێلیکۆپتەر لە شــاری پــاوە دابەزین و ڕێــگای هاتوچۆی خەڵکیان خســتە ژێر کۆنترۆڵــی خۆیان. پاشــان مانگرتــووان خوازیاری ئــەوە بوون کە هێزی ناخۆجێی واتە هێزی ڕێژیم لەو شارەدا جێگیر بکرێت.

لە بەرانبەردا لە ســەر ڕێگای پاوە کرماشــان و لە گوندی «قۆری قەڵا» ڕۆژی ١٣٥٨/٥/٢٣ واتە ڕۆژێک دوای مانگرتنی شــاری پاوە، مانگرتنێک لە بەرانبەر مانگرتنی شــاری پاوەدا ڕێک خرا. داواکاریی ئــەم مانگرتووانــە ئەوە بوو کــە ئەمنییەتی ناوچە لــە لایەن خەڵکی ناوچەکەوە، دابین بکرێ.

بەڕێوەبەریی ئەم مانگرتنە تا ڕادەیەک کەوتە ئەستۆی ڕێکخراوی حیزب لە پاوە. بەرپرسـایەتی بەڕێوەبردنـی مانگرتنەکە کەوتبووە سەرشـانی ڕەحیم بەغدادی کە خەڵکی شـاری سـنە بوو. لە ماوەی ٢ تـا ٣ ڕۆژ مانگرتنـی قـوڕی قەڵادا، لـە ناوچـە جۆراوجۆرەکانی هەورامـان و جوانـڕۆوە دەسـتە دەسـتە خەڵـک بۆ پشـتیوانی لە داخوازیی مانگرتوانی قوڕی قەڵا دەهاتنە ئەو شـوێنە و پشـتیوانیی خۆیان ڕادەگەیاند. سـەبارەت بە هەلومەرجی ناوچەکە چەند جارێک لـە ڕێـگای تەلەفوونەوە پێوەندی بە شـەهید دوکتور قاسـملۆوەوە دەکرێـت. دوکتور قاسـملوو نـەزەری ئەوەیە کە ڕێژیـم بەرنامەی ئەوەیە شـەڕ بەسەر کورددا بسەپێنێ، بۆیە ئامۆژگاریی ڕێکخراوی حیـزب دەکات تـا ئـەو جێگایەی کـە دەگونجێ، هەوڵ بدەن شـەڕ ڕوو نـەدات. پـاش دوو ڕۆژ وەفدێـک لە بەرپرسـانی ئوسـتان بە سـەرۆکایەتیی ئوسـتاندار کە ئەوکات «سـپهری» بوو، سـەردانی مانگرتووانی قوڕی قەڵا دەکەن. ڕۆژی ٥٨/٨/٢٥ وەفدەکەی ئوستان کـە پێک هاتبـوون لە: سـپێهری، حاجی ئاخونـد فەرماندەی هەنگی ژاندارمریـی کرماشـان و زولفەقـاری و کۆمەڵێکـی دیکـە، لە باتی ئـەوەی بێنە ناو مانگرتووان، هـەروەک چووبوونە ناو مانگرتووانی شـاری پاوە، هاتنە پاسـگای قوڕی قەڵا و داوایـان کرد وەفدێک بە نوێنەرایەتـی لـە لایەن مانگرتووانـی قوڕی قەڵاوە بڕۆنە پاسـگا و داواکارییەکانیان ڕابگەیەنن. بۆ ئەم مەبەستە ڕەحیم بەغدادی، سەید ڕەزا درووگەر و چەند کەسێکی دیکە دیاری کران و چوونە پاسگا و کاتی گەڕانەوەیان بۆ لای مانگرتووان، ڕایانگەیاند، داواکارییەکانی مانگرتووانـی قوڕی قەڵایان داوەتە وەفدەکەی ئوسـتان و ئەوانیش وتوویانـە پاشـان وەڵامتان دەدەینەوە. دواتـر دەرکەوت کە وەفدی ئوستان زیاتر لەوە کە بۆ بیستنی داواکاریی مانگرتووانی قوڕی قەڵا هاتبن، مەبەسـتیان هەڵسـەنگاندنی ورەی مانگرتووان و لە ڕاستیدا

تەواوکردنی پیلانەکەیان بووە.

شـــەوی ٢٦ی گەلاوێژ کـــە گەشـــتییەکانی مانگرتووانی قوڕی قەڵا دەچنـــە لای گوندی «دووریســـان» بۆ ســـەردان لـــە نیگابانەکانیان، دەکەونە بۆســـەی پاســـداران و تەقەیان لێ دەکرێ و بەم چەشنە لە لایەن هەر دوو لاوە تەقە دەســـت پێ دەکا و بەڕەسمی رۆژی ٢٦ی گەلاوێژی ١٣٥٨ شـــەڕ دەســـت پێ دەکات. لە یەکەم تەقەدا مســـتەفا حســـینی (ئێناخی) کە سەرپەرەستی نیزامیی مانگرتووانی قوڕی قەڵا بوو، شـــەهید دەبـــێ. ئەو رووداوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە شـــەڕەکە گەرمتر ببێت. لە بیمارســـتانی شـــاردا ژمارەیەکی زۆر لە پاســـداران ســـەنگەریان گرتبوو و پاش شـــەڕێکی توند و خوێناوی، بیمارستان لـــە کۆنترۆڵی پاســـدارەکان دەرهات و ئەو ژمارە پاســـدارە کە تێیدا بـــوون، کـــوژران. یەکێک لـــە کـــوژراوەکان غەنی باباخـــاس بوو کە خوێنی بوو بە خوێنی ســـیاوەش و رێژیم لە بیمارستانی پاوە دەیان داســـتانی درۆیینی لا ســـاز کرد و بە مەبەســـتی مەزلووم نیشاندانی و هاروووژاندنـــی بیروڕای گشـــتیی خەڵکی ئێـــران، رایگەیاند کە لەو شـــەڕەدا پاســـدارەکانیان ســـەر بڕیون کە دیارە ئەمە فڕی بە ســـەر راستییەوە نەبوو.

پـــاش گیرانی بیمارســـتانی پاوە، شـــەڕ کەوتە ناو شـــاری پاوە و بەشـــێکی زۆر لە شـــار کەوتە دەســـتی مانگرتوانی «قـــوڕی قەڵا»، بـــەڵام لە بەر ئەوەی کە ئەم هێـــزەی مانگرتوانی قوڕی قەڵا هێزێکی عەشـــایری بـــوو، بە مەیلـــی خۆیان دەجوولانـــەوە و لـــە کۆنترۆڵدا نەبـــوون، جنێـــوی زۆر ناشـــیرینیان بە خەڵکی شـــاری پـــاوە دەدا و ئەمەش وای کرد زۆربەی ئەو خەڵکەش کە لە شاردا بێلایەن بوون، لەگـــەڵ مانگرتوانـــی پاوە یەکگرتووتر دیفاع لە شـــار بکـــەن. دوایین ناوەندی رێژیم کە مابووەوە، پاسگای ژاندارمری بوو کە لە رۆژئاوای شـــاری پاوە هەڵکەوتبوو. «چەمران» فەرماندەی بەناوبانگی ڕێژیم

لەم پاسـگایەدا کەوتبووە گەمارۆی چەکدارانی سـەر بە مانگرتوانی قـوڕی قەڵا. ئـەم چەکدارانە دەیانتوانی ئەم دواییـن بنکەیەی ڕیژیم بگرن، بەڵام چەمـران فریوی دابوون و پێی ڕاگەیاندبوون تا بەیانی مۆڵەتیان بدرێتێ تا بەیانی بەبێ شەڕ و کێشە پاسگا تەسلیم بکەن و چەکدارەکانی دەوری پاسـگاش بەم پێشنیارە رازی ببوون. چەمران لەو شەوەدا لەگەڵ هەموو جێگایەک پێوەندیی گرتبوو و ئەوە بوو کە بەیانیـی ٢٨ی گەلاوێـژ خومەینی فەرمانی جیهادی دژی گەلی کورد راگەیانـد و فەرمانــی بە هێزی هەوایی و دەریایـی! و زەمینی دا کە بـە زووترین کات بەرەو پاوە وەڕێ بکەون و پردی هەوایی بۆ ئەم شـارە ببەسـتن، هەر لەو کاتەشـدا بە ئەرکی موسوڵمانانی زانی کە بەشداری لەو جیهادەدا بکەن. بەدوای جیهادی خومەینیدا، تاڵەقانیش رایگەیاند ئامادەیە چەک لە شـان بکا و بۆ جیهاد رەوانەی بەرەکانی شەڕ لە کوردستان بێ.

چەمران و ژاندارمەکانی پاسـگای ژاندارمریی پاوە کە لە فەرمانی جیهـادی خومەینی ئاگادار بوون، دەسـتیان دایـە بەرەنگاری و بەم چەشنە هێزی چەکداری مانگرتوانی قوڕی قەڵا بەهۆی بێئەزموونی و نەبوونی ڕێبەرێکی بەدەستوبرد تووشی شکان هات و پاشەکشەیان کرد. دواتر ڕیژیم زۆر داسـتانی سـەیر و سـەمەرەی لـە ئیمدادی غەیبی و توانای چەمران لەو بەرەنگارییەدا سـاز کرد و خەڵکیان لە ئەسڵی مەسەلەکە چەواشە دەکرد.

پـاش بڕیـاری «جیهاد»ی خومەینی، هێرشـی سـوپای جەهل و نەزانی، تەنیا بە هێرش بۆ سـەر شـاری پاوە ڕانەوەستا. ڕیژیم ئەم هێرشەی بەرەو شارەکانی دیکەی کوردستان، کامیاران، سنە، سەقز و .. درێژە دا و رادیۆ تارانیش داوای لە هێزەکانیان دەکرد سنوورەکان بگرن و نەهێڵن دژی شۆڕش لە سنوور دەرباز بن. ئەم پروپاگەندەیە فەزایەکی پێکی هێنابوو کە بۆ ئەو کەسـانەی کە شارەزاییان لە سەر

نەبوو، زۆر شوێندانەر بوو. رادیۆ تاران ناوی شوێنەکانی وا باس دەکرد هەروەک کۆنە ئەمنییەکیان کردبێ بە بێژەر کە هەموو کەلێن و تووژبنەکانی ئەو ناوچانە شارەزا بێ. لەو لاشەوە خەڵکی ناحاڵی و مەزهەبی هەرکامەیان پەڕۆیەکی سپییان لە سەریان گرێ دابوو کە رەستە بەناوبانگەکەی خومەینیی لێ نووسرابوو: «شەڕ لە کوردستاندا باشترین عیبادەتە». دەستووری جیهاد لە دژی خەڵکی موسوڵمانی کوردستان لە رۆژی ٢٨ی گەلاوێژ، ساڵرۆژی کوودەتای رێژیمی شا لەسەر حکوومەتی دوکتور موسەدیقدا بووو ئەمەش لە خۆیدا زۆر مانادار بوو. رۆژەکانی دوایی هێرش بەرەو کامیاران، سنە، مەریوان، سەقز، بۆکان و مەهاباد تا گەیشتە سەردەشت درێژەی کێشا. ئەو شەڕە دەستپێکی شەڕێک بوو کە لە کوردستاندا بە «شەڕی سێ مانگە» ناوبانگی دەرکرد و بە شکستی رێژیم و پەیامی خومەینی لە ٢٦ی خەزەڵوەری ٥٨دا (هەر چەند بە رواڵەت و بە شێوەی کاتی) کۆتایی پێ هات.

تێبینی: لەم شەڕەدا هێلیکۆپتریکی شەڕکەری رێژیم کە مستەفا چەمران، فەرماندەی بەناوبانگ و وەزیری بەرگریی رێژیمی دەگواستەوە بۆ پاوە، کەوتە بەر ئاگری چەکی پێشمەرگە و لە کار کەوت. بەڵام چەمران توانیی خۆی دەرباز بکات. هەر لەو شەڕەدا هێلی کۆپتریکی شەڕکەری دیکەی رێژیمیش بە هۆی تەقەی پێشمەرگەوە کەوتە خوارەوە. هەروەها فڕۆکەیەکی F٤ کە لە پایگای هەوایی «شاهرۆخی»ی هەمەدانەوە بۆ سەرکوتی خەڵکی پاوە هاتبوو، کەوتە بەر رەهێڵەی چەکی پێشمەرگە و کۆنترۆڵی لە دەستی فڕۆکەوان دەرچوو. فڕۆکەوانی کابینی پشتەوەی ئەم فڕۆکەیە بە ناوی ستوان یەکەم «بەشیر مووسەوی» هەر لە نێو فڕۆکەکەدا بریندار دەبێ و پاش بڕینی چەند کیلوومیترێک رێگا، ئەم فڕۆکەیە لە گوندی قشلاخ (هەڵکەوتوو لە سەر رێگای پاوە روانسەر)

دەکەوێتە خوارەوە و هەر دوو فڕۆکەوانەکەش بە ناوەکانی «ستوان یەکەم بەشیر مووسەوی» و «سەرگورد موحەممەد نووژە» گیانیان لە دەست دەدەن. پاش ئەو رووداوە بە هۆی ئەوەی کە موحەممەدی نووژە و هاوکارەکەی یەکەم کوژراوەکانی هێزی هەوایی ئەرتەش لە پاش شۆڕشی ٥٧ بوون، ناوی پایەگای هەوایی شاهرۆخیی هەمەدان کە پاش سەرکەوتنی شۆڕش کرابوو بە «پایەگای هەوایی حوڕ»، بە «پایەگای نووژە» گۆڕدرا.



خاوەنی وێنە، موحەممەدی نووژە، ئەو فڕۆکەوانەیە کە لە شەڕی پاوە فڕۆکەکەی بە ئاگری چەکی پێشمەرگە کەوتە خوارەوە و خۆی و هاوکارەکەشی گیانیان لە دەست دا.

## ▪ ٢٣: ئیعدامەکان لە کوردستان

پاش هاتنە سەرکاری رێژیمی کۆماری ئیسلامی لە ساڵی ١٩٧٩ی زایینی کە ئاخوندەکان توانیان دەسەڵاتی خۆیان بە سەر هەموو دامودەزگاکانی دەسەڵات و سیستمی کۆمەڵگادا بسەپێنن، ئیعدامەکان بە شێوەیەکی بەربڵاو بۆ تەوجیهی ئیدئۆلۆژیک بەڕێوە دەچن.

خومەینی بە دیاریکردنی ئاخوندێکی جینایەتکار بە ناوی «شێخ سادق خەڵخاڵی» بۆ پۆستی حاکمی شەرع دەسەڵاتی بێ سنووری بۆ کوشتوبڕی خەباتگێڕەکان بە ناوبراو بەخشی، بە جۆرێک کە ناوی خەڵخاڵی وەبیرهێنەری وشەی ئیعدام و دیمەنی گوللەبارانکردنەکان و لە سێدارەدانەکانی هەزاران مرۆڤی بێ تاوانە.

خەڵخاڵی لە فتواکانیدا پێوانەیەکی زۆر ئایینییانەی هەبوو و دەیگوت ئێمە دەکوژین، ئەگەر بێ گوناح بێ دەچێتە بەهەشت و ئەگەریش

تاوانبار بن بە سزای خۆیان دەگەن.

ئیعدامەکانــی کوردســتان بێجگە لەوەی کــە رق و قینی پێوە دیار بوو، هەر لەو کاتەشــدا مەبەستی ترساندنی خەڵکی کوردستان بوو. وابوو کە بریاری کوشتنی چەند لاوی خەباتگێڕی لە کەمتر لە چەند چرکەدا دەردەچوو بەبێ ئەوەی هیچ لێپرسینەوەیەک بکرێ. حوکمە ئیعدامــەکان لــە پاوە دەســتی پێ کرد و لــە ٢ رۆژدا دەیان نەفەری دڵســۆز و ئازادیخــوازی بێ تــاوان لە لایــەن خەڵخاڵییــەوە ئێعدام کران.

حاجی شــێخ حسەین کرمانی کە نوێنەری خومەینی لە کوردستان بوو، دەڵێ:

هەواڵیان پێ دام کە خەڵخاڵی بەرەو ســنە بەڕێوەیە، بە ئەحمەدی کوڕی خومەینیم گوت ئێرە (ســنە) ئارامە. هیچ کێشــەیەک لە ئارادا نیە، بۆ رەزای خودا مەهێڵن خەڵخاڵی بێتە ئێرە؟ لە بیرم نیە سبەینێ ئەو رۆژە بۆ چ کارێک چوومە فڕۆکەخانەی سنە هێلیکۆپترێکم دیت کە خەڵخاڵی لێی هاتە خوارێ، بە من گەیشــت و پاشــان هەواڵ هات ژمارەیەکــی لە ناوەڕاســتی فڕۆکەخانە ئێعدام کــردوون کە یەکێک لەو ئێعدام کراوانە کەســێکی نەخۆش بوو کە لە بیمارستان لە سەر برانــکارد بردبوویــان و ئیعدامیــان کردبوو، وێنەی ئــەم ئێعدامە بە کۆمەڵانە پاش ماوەیەک بڵاوکرایەوە.

«حوســەین برووجــردی» یەکێک لــە فەرماندەرانــی خومەینی لە سەقز دەڵێ: «لە سەقز ١٣ کەسیان لە چەند خولەکێکدا ئێعدام کرد و حوکمەکەیان هەر لەوێ بەڕێوە بردن کە یەکیان منداڵێکی ١٢ ساڵان بــوو، هەر نەیدەزانی بۆ چی گیراوە. کەســێکی دیکەیــان بەو تاوانە ئیعدام کرد کە گوایە باوکی «رباخوار» واتە ســووخۆرە. کاتێک کە پێی دەڵێن تاوانی ئەوەیە کە باوکی «رباخوار»ە، ئەو لاوە لە وەڵامدا دەڵێ گوناحی من چیە کە باوکم ســووخۆرە؟ خەڵخاڵی دەڵی تۆ لەو

خوێنەی و ئەمە دەبێتە هۆی ئیعترازی «حوسەین عەلی مونتەزری» و داوا لە «موحسین ڕەزایی» فەرمانەدەی سپای پاسداران دەکا پێش بەو وەزعە بگرن کە ناوبراو لە وەڵامدا دەڵێ بۆ دامرکانەوەی نارەزایەتییەکان، ئەم توندوتیژییانە پێویستن.

پاش ئەم ئیعدامانە و تا ئێستاشی لەگەڵ بێ، ئیعدام کەرەسەی تۆقاندنی حکوومەتی کۆماری ئیسلامییە و بە ناوی دژایەتی لەگەڵ ئیسلام جینایەتی زۆر ئەنجام دراوە، نموونەش لەو پەیوەندییەدا کوشتوبڕەکەی ساڵی ١٣٦٧ی هەتاوی بوو کە لە دوو مانگدا نزیکەی حەوت هەزار کەس ئیعدام کراون.

لەوەش جینایەتکارانەتر فتواکەی خومەینیی خوێنمژ بوو کە داوای دەکرد پێش ئەوەی ئیعدامییەکان ئیعدام بکرێن، خوێنەکانیان لێ بگرن و بۆ چارەسەری ئەو بریندارانەی کە لە بەرەکانی شەڕدا بریندار دەبن، بە کاری بەرن.

## ■ ٢٤: دەستپێکردنی شەڕی بەرگری لە کوردستان (١٣٥٨)

پاش دەستووری جیهادی خومەینی لە دژی خەڵکی کوردستان و هێزە خەباتگێڕەکانی، بەداخەوە ئەوەی کورد لێی دەترسا ی هەوڵی دەدا روو نەدات، ڕووی دا و بە هێرشی هێزەکانی ڕێژیم بۆ سەر خەڵکی کوردستان، زۆر جینایەتی سامناک لە لایەن ئەو هێزانەوە خوڵقان کە بەشێک لەو جینایەتانە لە توێی لاپەرەکانی ئەم کتێبەدا دەکەونە بەرچاو. ڕۆڵە خەباتگێڕەکانی کوردستانیش لە بەرانبەر ئەو هێرشەدا کەوتنە دیفاعکردن و لەماوەی ئەو شەڕەدا ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکانی ڕێژیم کوژران و بە دیل گیران. ژمارەیەکیش پێشمەرگە لە ڕێگای دیفاع لە ئازادی و کەرامەتی گەلەکەیاندا بە سەخاوەتەوە گیانیان بەخشی. ئاماری ئەو شەڕە ـ هەر چەند ناتەواوە ـ لە نامیلکەی شەڕ لە کوردستاندا (جنگ در کردستان) کە [illegible] کە ئەم

ئامارە لە ساڵی ١٣٥٩ تا ١٣٧٣ دەگریتەوە. ئاماری پێش و پاش ئەو ریکەوتە نە بەردەستدا نەبوو، بۆیە ئەو ئامارەی تێدا نیە.

بێگومـان ژمـارەی کـوژراوی دوژمـن و هـەر وەهـا چالاکیـی بەڕێوەچـوو زۆر لـەوە زیاترن کە لێرەدا هاتووە. ئـەم ئامارە تەنیا تایبەتە بەو شەڕانەی کە حیزبی دیموکرات بەڕێوەی بردوون و ئەو شـەڕانە ناگرێتەوە کە هێزە خەباتکارەکانی دیکەی وەک کۆمەڵە و .. بەڕێوەیان بردووە.

جەدوەلـی ژمـارە «یەک» کـوژراو و دیلی دوژمن و شـەهیدانی حیـزب لە خـۆ دەگری کە بـە بـەراورد لەگەڵ یەکتـر دەردەکەوێ لـە بەرانبەر هەر شـەهیدێکی حیزبدا ١٠ کەس لـە هێزەکانی ڕێژیم کـوژراون و ئەمە نیشـانەی ئازایەتـی و لێزانیی هێزی پێشـمەرگە بەرانبـەر بە هێزەکانی ڕێژیمە و بە تایبەتیش ئەگەر ئەوە لە بەرچاو بگرین کە لە تەواوی ئەو شەڕانەی ڕێژیم لە دژی هێزی پێشمەرگە، هێزەکانـی ڕێژیم بە چەکی قـورس و موهیماتی بێ ئەژمار و هێزی هەواییەوە پشتیوانی کراون.

هەروەها جەدوەلی ژمارە (٢) دەسکەوتی کەرەسەی نیزامیی هێزی پێشـمەرگە لە شەڕەکانیاندا دژ بە ڕێژیم لە ساڵی ١٣٥٩ تا ١٣٧٣ لە خۆ دەگرێت.

ئەم ئامارە لە دامەزراندنی رادیۆ دەنگی کوردسـتانەوە دەست پێ دەکات و عەمەلیاتەکانـی پێش ئەو ڕێکەوتە نەنووسـراون. هەروەها ئـەم ئامارە تەنیا ئـەو کوژراوانەی دوژمن دەگرێتـەوە کە تەرمیان کەوتۆتە دەسـتی پێشـمەرگە. هەر بۆیە ئاماری تـەواوی زیانەکانی دوژمن لەو شەڕەدا دەکرێ چەند قات لەوەش زیاتر بێت.

**■ جەدوەلـی ژمـارە (١): ئاماری زیانـە مرۆییەکانی دوو لایەن لە شەڕی کوردستاندا (١٣٥٩ـ١٣٧٣)**

| سال | کوژراوی دوژمن | دیل | گەڕانەوە بۆ باوەشی گەل | دیلی ئازادکراو لە مەیدانی شەڕدا | شەهیدی پێشمەرگە | عەمەلیاتی نەزانراو |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٣٥٩ | ٢١٧٢ | ٢٥٦ | ٣٢ | ١٢٠ | ٣٢٤ | ٩٧ |
| ١٣٦٠ | ١٧٧١ | ٢٣٥ | ٥٤ | ١٩ | ١٤٤ | ٨٨ |
| ١٣٦١ | ٥٢٤٥ | ٢٦٤ | ١١٢ | ٢٢٤ | ٤٢٠ | ٤٤٢ |
| ١٣٦٢ | ٤٢٠٠ | ٣١٢ | ٣١ | ١٥٠ | ٣٨٤ | ٢٤٥ |
| ١٣٦٣ | ٤٦٣٠ | ٤٣١ | ١٣١ | ٣٦٣ | ٤٠٦ | ٣٢٦ |
| ١٣٦٤ | ٢١١٩ | ٢٣٥ | ٢٩٤ | ١٨٠ | ٢٧٤ | ٣٤١ نەفەر |
| ١٣٦٥ | ١٣٩٥ | ٢٤٨ | ١٢٩ | ٩٠ | ١٦٨ | |
| ١٣٦٦ | ١٥٢١ | ٢٠٨ | ٨٨ | ١٣٢ | ٩٧ | |
| ١٣٦٧ | ٦٩٧ | ١٠١ | ٧٥ | ١١٨ | ١٠١ | |
| ١٣٦٨ | ٤٤٤ | ٢٥٣ | | ٢٥٣ | ٦٦ | |
| ١٣٦٩ | ٤٥٩ | ٣٠٤ | ٥٠ | ٣٠٤ | ٧٠ | |
| ١٣٧٠ | ٢٠٧ | ١٠٨ | | ١٠٨ | ٤٨ | |
| ١٣٧١ | ٢٢٨ | ١٥٢ | | ١٥٢ | ٣١ | |
| ١٣٧٢ | ٣٥٧ | ٢٥٩ | ٥٦ | ٢٥٩ | ٣٣ | |
| ١٣٧٣ | ١٩٩ | ٥٥ | ١٦ | ٥٥ | ٣٨ | |
| کۆی گشتی | ٢٥٦٤٧ | ٣٤٢١ | ١٠٦٨ | ٢٥٢٧ | ٢٤٩٩ | |

**■ جەدوەلـی ژمـارە (٢): دەسـکەوتی کەرەسـەی نیزامیی هێزی پێشمەرگە لە شەڕەکانیاندا دژ بە رێژیم لە ساڵی ١٣٥٩ تا ١٣٧٣**

| ساڵ | فیشەک | خەشاب | دووربینی چاو | گوللەی چەکی قورس | ماشێنی سووتێنراو | لەنێوبردنی چەکی قورس |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١٣٥٩ | ٢٧٣٠٠ | ٦٤ | ١ | - | ١٥١ | ٣ |
| ١٣٦٠ | ٢٨٣٤٥ | ٢١٥ | ٢ | ١٥٢ | - | - |
| ١٣٦١ | ٨٢٨٤٣ | ١٠٦١ | - | ١١١ | ٢٩٠ | ٢٢ |
| ١٣٦٢ | ٣٦٩٥٠ | ٥٥١ | ٧ | - | ٧٧ | ١ |
| ١٣٦٣ | ١٢١١٩٦ | ١٧٧٢ | ٣٥ | ٣٥ | ٦٠١ | ٢٧ |
| ١٣٦٤ | ٩٦٢٥٠ | ١٥٦٥ | ٦ | ٥٤ | ٢٥٧ | ٦ |
| ١٣٦٥ | ١٣٠١٩٠ | ١٩٩١ | ١٦ | - | ٢١٤ | ٣٣ |
| ١٣٦٦ | ٥٥٩٥٠ | ١٤٣٩ | ٤ | - | - | - |
| ١٣٦٧ | ٢٥٤٩٠ | ١٠٢٨ | ٣ | - | - | - |
| ١٣٦٨ | ١٤٠٥٣٠ | ١١٨٣ | ٤ | - | - | - |
| ١٣٦٩ | ٣٠٨٨٤٠ | ١١٠٠ | ٢ | - | - | - |
| ١٣٧٠ | ١١٩٤٠ | ٥٢٠ | ٤ | - | - | - |
| ١٣٧١ | ٨٩٢٥٠ | ١٢١٩ | ٩ | - | - | - |
| ١٣٧٢ | ١٦٠٠٠ | ٢٩١٥ | ٤ | - | - | - |
| ١٣٧٣ | ٤٦٥٠ | ٨٧ | ٤ | - | - | - |
| کۆی گشتی | ١١٦٥٧٢٤ | ١٦٧١٠ | ٩٠ | ٣٥٢ | ١٥٩٠ | ٩٢ |

لە هەزاران عەمەلیاتی هێزی پێشمەرگەدا کە لە نێوان ساڵەکانی ٦٥ تا ٧٣ ئەنجام دراون، ژمارەی ئەو عەمەلیاتانە لە بەردەستدا نیە کە ئاماری کوژراوەکانی دوژمن تێیاندا روون نەبۆتەوە، بەڵام لە ساڵەکانی ٥٨ تا ٦٤ ژمارەی ئەو عەمەلیاتانەی کە ئاماری کوژراوانی دوژمن تێیاندا روون نەبۆتەوە ١٥١٩ عەمەلیات بووە. بەو پێیە دەبێ ژمارەی ئەو عەمەلیاتانە لە نێوان ساڵەکانی ٦٤ تا ٧٣یشدا کە ژمارەی تەلەفاتی دوژمن نەزانراوە، چەند قات لەوە زیاتر بێ.

لەو ساڵانەدا ٣٠ قەبزە قەناسەی دووربیندار، زیاتر لە ١٠٠ نارنجەکی دەستی، نزیک بە ٤٠ موسەلسەلی گەورە، دەیان ماشین و کەرەسەی دیکەی نیزامی وەک کۆڵەپشتی، کیسە خەو، قوتب نما و .. بە دەسکەوت گیراون کە لەم نووسراوەیەدا نەهاتوون.

## ■ ٢٥: بەشداریی خەباتگێرانی بەشەکانی دیکە لە بزووتنەوەی کوردستانی ئێراندا

شانازیی یەکەم بەشداریی کوردەکانی بەشەکانی دیکەی کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی کۆماری کوردستان لە ساڵی ١٩٤٦ کە بارزانییەکان لەم بەشدارییەدا پشکی شێریان وە بەر دەکەوێ و شەڕەکانی «قاراوا» و «مامەشا» شاهیدی ئازایەتیی ئەو هێزەی بارزانییەکانە و ئیستا ئیتر بەشێکە لە سەرفیرازییەکانی مێژوو کە هەموو کوردێک شانازیی پێوە دەکات.

خاڵی دیکە، بەشداریی چوار ئەفسەرە خەباتگێڕەکە بوو کە ئەوانیش پاش رووخانی کۆماری کوردستان بە گەڕانەوەیان بۆ عێراق بە داخەوە لە لایەن رێژیمی پاشایەتییەوە شەهید کران و یادیان لە دڵی هەموو کوردێکدا زیندووە. بەشداریی کادر و پێشمەرگەکانی حیزبی شیووعی لە شەڕەکانی ساڵەکانی ٥٨ و ٥٩ی هەتاوی لە کوردستانی ئێراندا شانبەشانی پێشمەرگەکانی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی

ئێران بە تایبەت لە شـــەڕی ۲٦ڕۆژەی شاری سنەدا کە لەو شەڕەدا فەرماندەی ئازا و بەوەج مەلا محەممەد جوانڕۆیی (برایم) بریندار و چەند هاوڕێیەکی وەک جەبار کۆکۆیی و.. شەهید بوون.



شەڕی سنە ئەبوو ئازا و تەرمی شەهید جەبار کۆکەیی

بەشـــداریی پێشـــمەرگەکانی حیزبـــی سۆسیالیســـتی کوردســـتانی تورکیە لە شـــەڕی جادەی سەردەشـــت ـ پیرانشـــار کە لەم شـــەڕەدا کەسێکیان شەهید بوو.

ســـەرئەنجام بەشـــداریی پێشـــمەرگەکانی یەکێتیـــی نیشـــتمانیی کوردســـتان لـــە ســـاڵی ۱۳٦۲ لـــە شـــەڕەکانی جادەی سەردەشـــت ـ پیرانشـــار کە لە دەشـــتی «ســـاوان» لە شـــەڕێکی ئازایانەدا چەند پێشـــمەرگەیەکی یەکێتی شەهید بوون و ناوی «هێزی پشتیوان» لە سەر ئەو هێزە دانرا.

بەشـــداریی ئـــەم هێزانـــە ئەگەر شـــانازییەک بـــۆ هێزەکانیان بێت، نیشانەیەک لە هەست و سۆز و چارەنووسی گەلێکی دابەشکراویشە کە بە بێ ئیرادە و ویســـتی خۆی دابەش کـــراوە، بەڵام داگیرکەرانی

کوردســتان لــە درێژەی ســەدان ســاڵ داگیــرکاری و کاولکاری لە کوردستاندا نەیانتوانیوە هەست و سۆز و عاتیفە بۆ نیشتمان لە دڵی رۆڵەکانــی ئەم نیشــتمانەدا لاواز بکەن و بــە قەولی کوردی «برا لە پشت برا بێ، مەگەر قەزا لای خوا بێ».

### ■ ٢٦: قارنێ و قەلاتان، کۆمەڵکوژیی گەلی کورد (١٣٥٨)

پاش سەرکەوتنی شۆرشــی گەلانی ئێران دژی رێژیمی پاشایەتی خەڵــک بــە هیوا بوون لــە ژێر ســێبەری رێژیمی تازەدا بــە ئازادی و ژیانێکــی بــاش بگەیــەن، بەڵام مخابن ئــەو هیوایــە نەهاتە دی و پاش سەرکەوتنی شــۆڕش ئاخوندە کۆنەپەرستەکان دەسەڵاتیان بە تەواوی قەبــزە کرد و بۆ بەڕێوەبردنی سیاســەتەکانیان کەڵکیان لە مۆرەکانی رێژیمی پێشــوو و توێژی دەمارگرژی ئایینی وەرگرت و دەیان و بگرە سەدان جنایەتیان لە کوردستان بەڕێوە برد.

لە ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستان لە کاتێکدا کە جووتیارەکان لــە کێڵگەکانیانــدا ســەرقاڵی کاری خۆیــان و پەیداکردنــی بژیــوی ژیانیان بوون، کەوتنە بەر شــاڵاوی هێرشی بێبەزەییانەی پاسداران و هێزەکانــی دیکــەی رێژیــم کــە رەحمیان بە ژن و منــداڵ و پیر و پەککەوتەش نەدەکرد و خەڵکی بێ تاوان بە بێ هیچ پاســاوێک تەنیا بە هۆی کوردبوونیانەوە دەدرانە بەر دەســترێژی گوللەی پاســدارە جەنایەتکارەکان و رێبەرانی ئەو کوشــتوبڕەش بەرپرسانی رێژیمی تازە بە دەســەڵات گەیشــتوو بوون. لە درێژەی چەندین کوشــتاری بەکۆمەڵدا لە شــار و گوندەکانی کوردســتان، نــاوی ژمارەیەک لەو گوندانــە لە کۆتایی ئەم باســەدا دێت. خومەینی کــە خۆی هاندەری سەرەکیی ئەو کوشتوبڕانە بوو، لە بەر سکاڵای زۆر لە لای ناوبراو ســەبارەت بەو کۆمەڵکوژییانە کەسێکی بەناوی «بەهادوران» وەک نوێنەری خۆی ناردە کوردستان و بەهادوران لە کۆتایی لێکۆڵینەوە

و لێپرسینەوەکانیدا راپۆرتێکی بۆ خومەینی بەرز کردەوە کە هەرچەند ئەو راپۆرتەش وەک زۆر راپۆرتی دیکە لە بیر کرا، بەڵام لە بەر ئەوەی ناوبراو نوێنەری خومەینی بوو، راپۆرتەکەی دەتوانێ بەڵگەیەکی حاشاهەڵناگر بۆ سەلماندنی راستییەکان بە تایبەتی لە رووداوی «قارنێ»دا بێت.

لێرەشدا سەرنجی خوێنەران بۆ بەشێک لە راپۆرتی مەهدی بەهادۆران، نوێنەری خومەینی لە پارێزگاکانی سنە و ورمێ سەبارەت بە کارەساتی قارنێ رادەکێشین کە لە رێکەوتی ٢٤ی خەرمانانی ١٣٥٨ ناردوویەتی بۆ خومەینی و دوو رۆژ دواتر، واتە ٢٦ی خەرمانان لە رۆژنامەی کەیهان چاپ کراوە. لە راپۆرتەکەدا هاتووە کە:

«١) بەپێی بەڵگە و باسەکان، لەو دوو پارێزگایەدا پیلانێکی رەمزاوی لە لایەن مۆرەکان و رێبەرانێکی باوەڕپێکراو و رواڵەتییەوە لە ئارادایە، چوونکە ئەو فیئۆداڵ و خاوەن ملکانەی کە لە رێژیمی پێشوودا هۆکار و ئامرازی بەڕێوەبەریی شا لە ناوچەدا بوون، لە لایەن کەسانێکی وەک دوکتور چەمران، تیمسار زەهیرنژاد، فەرماندەی لەشکری ٦٤ی ورمی، سەرهەنگ شەهبازیان و ئەو فەرماندەرانەی ئەرتەش و ژاندارمرییەوە تا بن گوێ خۆیان بە چەک و گوللە تەیار کردووە و ئامادەن و چەکدارن و لە بەرانبەردا خەڵکی چەوساوە و هەژاری ناوچە و کەسانێک کە سالانێکی زۆر لە دەستی فیئۆداڵەکان رەنجیان بینیوە، دەکەونە بەر تەوژم.

٢) بە ئاماژە بە هەڵخراندن و پەرەپێدان بە رۆحێکی دوژمنانە و رق لە نێوان تورک و کوردەکانی ناوچەدا لە لایەن فەرماندە و ئەرتەشییەکانی ئەو کاتەی کوردستان و ئازەربایجانی رۆژئاواوە بۆ هەمیشە ئەم دژایەتییانە بەردەوامە و رەنگە دەوڵەت لەگەڵ شەڕی نیزامیی دیموکراتەکان رووبەڕوو ببێتەوە. هەر ئەمە بۆتە

هـۆی ئەوەی کە خەڵکی بێ تاوان لە کۆماری ئیسـلامی بێزار بن و ئێسـتاش لە هەمبەر خەڵکـدا لەم بارەوە دیدێکـی خراپمان هەیە کە خەڵک بەرەو لای دێموکراتەکان هان دەدرێن و ئەوان بە دۆسـت و پشتیوانی خۆیان دەزانن.

٣) بەپێی شریت و ئەو راپۆرتانەی کە لە بەردەستدان، کاربەدەستانی ژاندارمـری و موجاهیـدە رواڵەتییەکانی نەغەدە بە سەرپەرەسـتیی «ئاغای مەعبوودی» و «سـەرگورد نەجەفی» لە ئاوایی قارنا سەر بە شـاری نەغەدە لانیکەم ٤٥ کەسـی بێ تاوانیان لە شـوێنی ژیانی خۆیاندا کوشـتووە و دواتر گواستوویانەوە بۆ بیابان تاکوو نیشان بدەن کە ئەمانە لە شەڕدا کوژراون و گوندەکەشیانیان تاڵان کردووە و لە ئاگردا ئەسـووتێت و «ئیسـتوار بیگلەری» لە کۆپلۆدا ٥ کەسی کوشتووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ بێ بایەخی یان خەیانەت و پیلانی ئەو فەرماندانەی کە لە ژاندارمریدان لە لایەکەوە و وروژاندنی ئەو هەسـت و ئیحساسـانەی کە دژ بە کورد دێنە کایەوە و هەسـتانی بیرێکی تۆڵەسەندنەوە دژ بە کوردە بێ تاوانەکان لە لایەکی ترەوەیە. بە داخەوە سـەرەڕای ئەوەی کە ئەوانەی ئەم کردەوە دڕندانەیان بە ئەنجام گەیاندووە ناسراون، بەڵام بە هۆی لایەنگریی زەهیرنژاد لەو تاوانبارە دڕندانە ئەو هەلە نەڕەخسـاوە کە شـوێنیان دەربکەوێت و دەستبەسەر بکرێن.

٤) نەبوونـی توانایـی و دەسـەڵاتی پێویسـت لـە لایەن سـوپای پاسـدارانی شۆڕشـەوە بۆ راگرتنی ئەو مەلا رواڵەتیانە و ئەندامانی ساواک کە دژ بە کوردن و بوونەتە هۆی خوێنڕشتن لە سەرتاسەری کوردسـتان و ئازەربایجاندا، بۆ وێنە: پرۆسەی قارنێ کە بە حوکمی حاکمی شەرع، «ئاغای خەڵخاڵی» و ئاغای «ئومید نەجەف ئاوایی» لەوێدا بەڕێوە چوو.

٥) لـە تەنیشـت رێگاچـارەی نیزامیـدا، رێگاچـارەی فەرهەنگی و

ئایدۆلۆژیـک و ئاوەدانـی بۆ کوردسـتان و ئازەربایجانـی ڕۆژئاوا پێویستە.

هەروەهـا مەهدی بەهادووران، نوێنـەری خومەینی لە درێژەی ئەم ڕاپۆرتەدا پێشـنیار دەکات کـە: «ڕۆحانییە ڕواڵەتییەکان کە بوونەتە هـۆی شـەڕ و خوێنڕێژی لە ناوچـەدا ڕامالێن و ئەو کەسـانەی کە کارەسـاتی قارنێیان خولقاندووە، دەستگیر بکرێن و پێشگیری بکرێ لە ئاگردانی خەرمان و ماڵەکانی ئەوان و.. و دادگای باڵای شـۆڕش چاوەدێری بکات. بۆ دەسـتگیریی تاوانبـاران، لابردنی ئەو فەرماندە و هێزانەی کە بە شـێوەی ڕەسـمی ئەندامی دایرەی ئیتلاعاتن و لە خزمەتی نەیارانی شۆڕشـدان و ئەیانەوێ سـوپای پاسـداران لاواز بکـەن و ناردنـی دوو بازڕەس لـە لایەن ئیمامەوە، دوو بازڕەسـی دیکـەش لە لایەن لیژنەی شـۆڕش و کەسـێک لە لایەن دادسـتانیی گشتیەوە پێویستە».

ئـەم ئامارەی کە لە خوارەوە دێت، ناوی ژمارەیەک لەو گوندانەیە کە هێرشیان کراوەتە سەر و خەڵکیان لێ کوژراوە و ماڵ و مەزرایان ئاگری تێ بەردراوە:

قارنـێ ٦٨ شـەهید، قەلاتـان ١٢ شـەهید، ئیندرقاش ٣٠ شـەهید، وسووکەند ٥٨ شەهید، سۆفیان ١٢ شەهید، سارۆقامیش ١٣ شەهید، بانیراوی نەغەدە ١٣ شەهید، قەرەگۆلی مەهاباد ١٨ شەهید، سەوزی ٤ شەهید، چەلی کۆیکان ٢٣ شەهید، گێچە و هەڵەقووش ١٤ شەهید، چەقەڵ مسـتەفا ١٩ شـەهید، گوندە وێڵەی شـنۆ ٦ شەهید و دەیان و سـەدان گوندی دیکەش کە ئەم جنایەتانەیـان تێدا بەڕێوە چوون. ئەمـە تەنیا کۆمەڵێک لە نموونەکانن کە باسـیان لێ کراوە، ئەگەر نا ناوچەی وا هەبووە وەکوو سـەڵماس، باوەجانی و زەهاو کە بێجگە لەوەی بە سـەدان کەسیان کۆمەڵکوژ کراون، لە ماڵ و حاڵی خۆیان هەڵکەندراون و پەڕیوەی عێراق و وڵاتانی دیکە بوون.

### ■ ٢٧: داگیرکردنـی باڵوێزخانــەی ئەمریـکا و هەڵوێسـتی حیـزب (١٣٥٨)

ڕۆژی ١٣ی خەزەڵوەری ١٣٥٨ کۆمەڵێک لە خوێندکارانی ناســراو بــە «پەیــڕەوی خەتی ئیمــام» هێرشــیان کردە ســەر باڵوێزخانەی ئەمریـکا لــە تــاران و داگیریــان کرد و بــە «لانەی جاسووســی» ناودێریــان کــرد. ڕێژیمی ئاخونــدی لەو ڕۆژە بــە دواوە بۆ ماوەی ٤٤٤ ڕۆژ خەڵکی ئێران و دنیای دەرەوەی بە کێشەی بەبارمتەگرتنی دیپلۆماتــە ئەمریکاییەکانــەوە ســەرقاڵ کرد و گرتنــی باڵوێزخانەی ئەمریکایــان وەک کردەوەیەکـی دژی ئیمپریالیســتی لــە قەڵــەم دا. تەنانەت بیشەرمییان گەیاندە رادەیەک کە ئەو کارەیان بە شۆڕشێکی گەورەتر لە شۆڕشــی ٢٢ی ڕێبەندانــی ١٣٥٧ دانا. هێندێک حیزب و ڕێکخراوی هەڵپەرەســت و خۆبەدەســتەوەدەریش ئــەو کارە غەیرە قانوونییەیان بە نیشــانەی دژی ئیمپریالیســت بوونی ڕێژیم زانی و زۆریــان بە بەژن و بــاڵای هەڵگوت. بەداخــەوە هێندێک ڕێکخراوی شۆڕشــگێڕی ڕاســتەقینەش تووشــی هەڵە بوون و بێ ئەم لاوئەولا پشــتیوانییان لــەو بێقانوونییــەی ڕێژیمی خومەینی کــرد تاکوو لەو جەوە کە پێکی هێنابوو کەڵک وەرگرێت و بناغەی ڕێژیمەکەی پتەوتر بکا. قانوونی ئەساســیی کۆنەپەرســتانەی زوو بە تەسویب گەیاند و پاوانخوازیی حیزبی جمهووریی ئیسلامی، حیزبی گۆپاڵ بەدەستانی بە سەر گەلانی ئێراندا زاڵ کرد.

حیزبــی دێموکــرات هەر لە ســەرەتاوە لــەو باوەڕەدا بــوو کە بە بارمتەگرتنــی دیپلۆماتەکانــی ئەمریکایــی ناتوانــێ نیشــانەی دژی ئیمپریالیســت بوونــی ڕێژیم بێ و ئەوە تەنیا بــۆ فریودانی بیروڕای گشــتیی خەڵکــی ئێرانە. حیزب پێــی وابوو ئەو کارە بــە پێچەوانەی قانوون و ڕێوشوێنە نیونەتەوەییەکانە و تەنیا بەرهەمێک کە لێی وەر دەگیرێ، بێ ئیعتبار بوونی ئێران لای بیروڕای گشــتیی دنیا دەبێ و

مەحکوومی کرد.

تێپەڕبوونـی ڕۆژگار راسـتی و دروسـتیی بۆچوونەکەی حیزبی نیشـان دا. هـەر چەند ڕێژیمی خومەینی لە پێشـدا بـۆ ئازادکردنی بارمتـەکان چەندیـن مەرجـی وەک گەڕاندنەوەی حەمەڕەزا شـا و داراییەکـەی دانابـوو، بەڵام لە کۆتاییدا پـاش ٤٤٤ ڕۆژ هەراوهۆریا و دوای ئەوەی زیانێکی زۆر بە ناوبانگ و ئیعتباری ئێران گەیشـت، ڕێژیم لەگەڵ بەناو شـەیتانی گەورە ڕێ کەوت و بە بێ ئەوەی هیچ کام لە مەرجەکانی جێبەجێ کرابن، بارمتەکانی ئازاد کرد.

هـەر وەک دیتمـان، بـە بارمتەگرتنـی کارمەندانـی باڵوێزخانەی ئەمریکا وڵاتی تووشـی گەمارۆی ئابـووری هێنا و خەڵکی هەژار و نەداری ئێرانی لەگەڵ کەمبوون و تەنانەت نەبوونی زۆر شـتومەکی هەرە پێویسـتی ژیان بـەرەوڕوو کرد. ئەو بـە بارمتەگرتنە بوو بە هـۆی ئەوەی کـە نزیکەی دوازدە میلیـارد دۆلار زەخیرەی ئەرزیی ئێران دەسـتی بە سەردا بگیرێ کە ڕێژیمی خومەینی بە ئازادکردنی بارمتەکان تەنیا چوار یەکێکی ئەو پووڵەی بۆ ئازاد کرا.

### ■ ٢٨: بۆچوونی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لەمەڕ پێشنووسی یاسای بنەڕەتیی ئێران (١٣٥٨)

حیزبـی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران هەر لە یەکـەم ڕۆژەکانی پـاش بڵاوبوونـەوەی ناوەڕۆکـی پێشنووسـی یاسـای بنەڕەتیـی کۆماری ئیسلامییەوە لە هاوینی ١٣٥٨دا بە دەرکردنی بەیاننامەیەک، کەموکوڕییەکانی ئەم یاسایەی بە روونی باس کرد. هەڵبەت دەکرێ ،لیین بـە هۆی کەشـوهەوای پاش کۆنگـرەی چوارەمـی حیزب و ،ونـی تاقمی لایەنگری بۆچوونەکانی توودە لـە نێو حیزبدا و هەر ،ەها بە لە بەرچاوگرتنی ئەو راسـتییەی کە لەو سـەردەمەدا هێشتا ،ووخاندنی کۆماری ئیسـلامی نەبۆتە سیاسـەتی ڕەسـمیی حیزب،

جۆرێک پارێزکاری و خۆبواردن لە رەتکردنەوەی تەواویەتی یاساکە بە بەیاننامەکەوە دیارە.

■ لە برگە جۆراوجۆرەکانی ئەم بەیاننامەیەدا هاتووە کە:

«خوێندنەوەی بنچینە گشتییەکان و ناڕوونیی ئەم گەلاڵەیە لە راستیدا نیشاندەری ئەوەیە کە پێشنووس بە پرتاوێکی خێرا ئامادە کراوە. جگە لەوە نوێنەرانی راستەقینەی گەلانی ئێران لە ئامادەکاریدا رۆڵیان نەبووە. بەم هۆیەوە و بە هۆی نەناسینی وڵات لە لایەن کەسایەتییەکانی ئامادەکاری ئەم یاسایەوە، مافە بنەڕەتییەکان و ویستی گەلانی بندەستی ئێران بەو شێوەیە کە لە پێگەی شۆرشی ئێرانە، مسۆگەر نەکراوە و نەپارێزراوە.

.. لە ئەسڵی ١٣ لە فەسڵی دوهەمی یاسای بنەڕەتیدا، ئایین و مەزهەب لە ریزێکدا هەڵکەوتوون. مەزهەبی فەرمی مەزهەبی جەعفەرییە کە ئەمە خۆی چەشنێک دەسەڵاتخوازی و سەروەریخوازیی مەزهەبییە و ئەگەر ئایینی فەرمیی ئێران ئیسلام بێ، ناوبردنی مەزهەب خۆی چەشنێک دوبەرەکی و ئاژاوەنانەوە لە نێوان گەلانی ئێران دەبێ.

لە ئەسڵی ٢١دا، کەڵک وەرگرتن لە زمانی زگماکی، ناڕوونە و بەکورتی هاتۆتە بەر باس. باشتر بوو شێوەی کەڵک وەرگرتن لەوە دیاری بکرێ. بە تایبەت هێنانە بەرباسی ئەم مەسەلەیە لە ئەسڵی ناوبراودا پێویستە کە پەروەردەو فێرکردن تا قۆناخی تایبەت بە زمانی زگماکی بێ و جگە لەمە، زمانە زگماکییەکان لە ناوچەدا فەرمی بن و لە ئیدارەکانی دەوڵەتیدا زمانی فارسی بە کار بهێنرێ.

.. گرینگترین عەیبی گەلاڵەی پێشنیاریی یاسای بنەڕەتی، نەبوونی خودموختاری بۆ گەلانی ئێرانە. لە هیچکام لە ئەسڵەکان و دەستەواژەکانی ئەم یاسایەدا، چەمکی خودموختاری بەدیار ناکەوێ. یەکێک لە داواکارییەکانی شۆڕشی ئێران، شانبەشانی دیموکراسی

لە وڵاتی فرەنەتەوەی ئێراندا ئەمەیە کە مافە سروشتییەکان و مافی گەلانی ئێران بە شێوەی «خودموختاری» یان «فیدراتیو» ڕێزیان لێ بگیردرێ...گەلانی ئێران بە بەختکردنی خوێن و لەخۆبردوویی، ڕەساڵەتی ڕێژیمی پەهلەوییان تێکەوە پێچا. شۆڕشی ئێران دەبێ بۆ گەشەکردن و درێژەدان و پتەوکردنی پێگەی خۆی و پاراستنی دەسکەوتەکانی، ویست و ئیرادەی جەماوەری گەلانی ستەملێکراوی ئێران وەڵامی ئەرێنی بدەنەوە. باس نەکردنی خودموختاری و ڕەچاونەکردنی ئەم سەرەتاییترین مافانە لە دەقی پێشنیاریی یاسای بنەڕەتیدا، نە بە قازانجی شۆڕشە و نە بە مەسڵەحەتی ئەم گەلانەش دەبێ.

.. شۆڕشی ئێران ڕێگە نادات یاسای بنەڕەتی کە نرخی خوێنی هەزاران شەهید و لەخۆبردوویی تەواوی خەڵکی ئێرانە، ببێتە ئامرازی دەستی کەسانێکی پاوانخواز و ناپسپۆڕ و ماف و ئازادییە دیموکراتیکەکان و مرۆڤایەتی و مافە نەتەوەییەکانی گەلانی ئێران بە بەراورد لەگەڵ ڕێژیمی پاشایەتیدا لە بەرچاو بگیرێ. یاسایی بنەڕەتی دەبێ ڕێز دابنێ بۆ ویستە نەتەوەییەکانی خەڵکی ئێران و مەسلەکانی خۆی پشت ئەستوور بە ویستی جەماوەری زەحمەتکێش دابرێژێ.

.. ئەسڵە داڕێژراوەکانی یاسای بنەڕەتی دەبێ لە مەجلیسێک بە ناو مەجلیسی دامەزرێنەران بکەوێتە بەر باس و شرۆڤەوە. کەوابوو کە نوێنەرانی ڕاستەقینە و هەڵبژێردراوی گەلانی ئێران لە مەجلیسێکدا بەناوی مەجلیسی دامەزرێنەران لە دەوری یەک کۆ نەبنەوە، چاوەڕوانی یاسای بنەڕەتییەک بەراورد کراو لەگەڵ بارودۆخ و پێداویستییەکانی کۆمەڵگا و شۆڕشی ئێران بێسوود دەبێ.

. حیزبی ئێمە خوازیاری پێکهێنانی مەجلیسی دامەزرێنەرانە. نە بەهانەی کەمیی کات و خێرایی لە پەسندکردنی یاسای بنەڕەتی و

نە بانگەشــەیەک کە ئەم ویستەی پێکهێنانی مەجلیسی دامەزرێنەران وەک پیلانێک لێک بدرێتەوە، ناتوانێ ئەم راستییە وا گۆڕدراو وێنا بکا کە دامەزرانی یاسای بنەڕەتی بێ پێکهێنانی مەجلیسی دامەزرێنەران، کردەوەیەکی نادێموکراتیکە و مێژوو بە خۆشی یادی ناکاتەوە».

هــەر وەک گوتمــان، وادیــارە کۆمیتــەی ناوەنــدی لــەو کاتــەدا نەیویســتووە مەســەلەکە بە تەواوی بورووژێنێ و لە بنی کوولەکە بــدات، ئەگەر نا یاســای بنەڕەتیــی ئێران زۆر بەنــدی خراپی تێدایە کە نەک لەگەڵ ویســت و داخوازییەکانی سەردەم ناگونجێن، بەڵکوو مــرۆڤ دەگەڕێننەوە بۆ هەزارو چوارســەد ســاڵ پێش و خراپترین بەند کە لەو یاســایەدا گونجاوە، سیستمی حکوومەتییە کە سیستمی ولایەتــی فەقیهــە و کەســێک بــە نێــوی وەلــی فەقیە دەســەڵاتێکی بێسنووری هەتاهەتایی دراوەتێ و لە راستیدا ئەم بەندەیە کە دەبێتە نیوەڕۆکــی حکومەتەکە و باقی دامەزراوەکان. ســەرکۆمار و هێزی قەزایــی و پارلەمــان لەو سیســتمەدا هیچ دەســەڵاتێکیان نیە و هەر پاش پەســەندکرانی ئەم یاســایە لە پێداچوونەوەیەکــی دیکەدا زۆر خاڵــی نەرێنییــان تێــدا گونجاند کە جێــگای ئەم باســە نیە و زۆری لە ســەر نووســراوە. مەبەست لە نووســینی ئەم چەند دێڕەی دوای نووســراوەکەی کۆمیتەی ناوەندی ئەوە بوو کە روون بکرێتەوە کە ئــەو قانــوون و یاســایە زۆر لەوە خراپترە کە لــەو کاتەدا و بە پێی هەلومەرجی سەردەم لە سەری نووسراوە.

## ■ ٢٩: کۆنگرەی چوارەمی حیزب (١٣٥٨)

پێــش کۆنگرەی چوارەم ســێ تەیفی فکری بۆ بە دەســتەوەگرتنی ڕێبەرایەتی لە کۆنگرەی چوارەم لە هەوڵدا بوون: لایەنگرانی حیزبی تــودە بە پشــتیوانیی حیزبە تودە، تەیفی دێموکــرات و نەتەوەخواز، تەیفێکی عەشیرەیی.

کۆنگـرەی چـوارەم لـە رۆژانـی ١٣٥٨/١١/٣٠ تـا ١٣٥٨/١٢/٥ لە سالۆنی سینەما ئومێدی مەهاباد بە بەشداریی ٣١٠ کەس لە ئەندامانی هەڵبژێردراوی کۆنفڕانسەکان لە سەرتاسەری کوردستان دەستی پێ کرد. لەم کۆنگرەیەدا دوو لایەنی فیکری کەوتنە بەربەرەکانێی لایەنی دیموکـرات و نەتەوەخـواز کە دوکتـور قاسـملوو رێبەریی دەکرد، لایەنەکەی دیکە بە دنەدانی حیزبی توودە و بە سـەرۆکایەتیی غەنی بلووریان و محەممەد ئەمین سراجی.

لەم کۆنگرەیەدا چوار مەسەلەی گرینگ دەکەوتنە بەرباس، هەڵوێست بەرانبەر بە رێبەرایەتیی شۆڕشـی ئێران، دەستنیشانکردنی دۆستان و دوژمنان لە رادەی نێوخۆ و دەرەوە، دیاریکردنی ئامانجی دوارۆژ، دیاریکردنی سنوورێک لە نێوان مرۆڤی دیموکرات و نادیموکرات.

سـەرەڕای هەوڵێکـی زۆری دوکتـور قاسـملوو بـۆ نیشـاندانی کەموکوڕییەکانـی سۆسـیالیزمی سـوننەتی، بـەڵام بەهۆی ریشـە داکوتانـی ئـەم بیروبۆچوونە لە نێو ژمارەیەکی زۆر لە بەشـدارانی کونگـرەدا کارێکی بۆ نەچووە پێشـەوە و ئاکامی لێدوانەکان ئەوەی لـێ کەوتەوە کـە ئامانجـی دوارۆژی حیزب بوو بە سۆسـیالیزمی زانسـتی. سەبارەت بە رێبەرایەتیی شۆڕش کۆنگرە پشتیوانیی خۆی لە رێبەرایەتیی شـۆڕش دووپات کردەوە و خومەینیی وەک رێبەری شۆڕشی ئێران ناسـی و لە هەمان کاتدا دروشمی «دیموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان»ی پەسند کرد.

سـەبارەت بە دیاریکردنی دوژمنانی دەرەوە و نێوخۆ و هەروەها سـنووری نێوان مرۆڤی دیموکرات و نادیموکرات، دوکتور قاسملوو ،وانیی سـیمای دیموکرات لەم کۆنگرەیەدا بچەسـپێنێ و مەبەسـت ا‌ـە چەسـپاندنی ئـەم تاریفانـە لـە مرۆڤی دیموکـرات لە راسـتیدا ،ـنوردانانێک لە نێوان بیروبـاوەڕی توودەیی و مرۆڤی دیموکراتدا ،و و ئەم مەرزبەندییە دەورێکی باشی گێڕا لە کزکردنی بیروباوەڕی

توودەئیسـتیدا کـە ئەم هەوڵە واتـە هەوڵدان بۆ ریشـەکێش کردنی نفووزی بیروبۆچوونی توودەیی کە ریشەی لە حیزبدا داکوتابوو، تا کاتی شەهید بوونی درێژە دا. سیمای دێموکرات کە لەو کۆنگرەیەدا بە پەسند گەیشت، بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

سیمای دێموکرات لە روانگەی شەهید دوکتور قاسملوو:

«دێموکرات، باوەڕی بە رەسـاڵەتی مێژوویـی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران هەیە و ئەم حیزبە بە رێبەر و رێکخەری خەباتی خەڵکی کوردستان دەزانێ.

دێموکـرات، بەرنامـە و پێـڕەوی نێوخـۆی حیزبـی دێموکراتـی کوردسـتانی ئێرانـی پەسـەند کـردووە و لە تێکۆشـانی سیاسـیی خۆیـدا پەیـڕەوی لە سیاسـەت و رێنوێنییەکانی ئـەم حیزبە دەکا و بۆ بەرەوپێشـبردنی ئەم سیاسـەتە لە هیچ چەشنە فیداکارییەک خۆ نابوێرێ.

دێموکـرات، شـانازی بەوە دەکا کـە ئەندامی حیزبـی دێموکراتی کوردسـتانی ئێـران، حیزبی پێشـەوا قـازی محەممـەد و هەزاران شـەهیدی سـەربەرزە کە لە پێنـاوی ئازادیی کوردسـتاندا گیانیان بەخت کردووە.

دێموکـرات، لە بەسـتراوەیی بێـزارە و هەر بۆیە پێی خۆشـە کە حیزبەکەی بە بێ هیچ بەسـتراوەییەک لە بڕیارداندا بە تەواوی ئازاد و سەربەخۆ بێ.

دێموکرات، پشتیوانی خەباتی رزگاریخوازانەی گەلانی زۆرلێکراوی سەرانسەری جیهانە.

دێموکرات، لایەنگری ئازادی و دێموکراسییە و باوەڕێکی قووڵی بە دێموکراسی هەیە و لە ئاکار و کردەوەی خۆیدا بەرامبەر بە هەموو هێزە سیاسـییەکان و بەرامبەر بە کۆمەڵانی خەڵک لەم ئەسڵە ئیلهام وەردەگرێ.

دێموکرات، بۆ هێنانە سـەرکاری ڕێژیمێکی دێموکراتیک لە ئێراندا لە سەر بناغەی پلۆرالیسم خەبات دەکا.

دێموکرات، بۆ وەلاتانی ستەمی نەتەوایەتی خەبات دەکا. دابینکردنی ئـەم ئامانجە بۆ گەلـی کورد لە دیاریکردنی چارەنووسـی خۆی بە شێوەی خودموختاریدا دەبینێ.

دێموکـرات، ناسیۆنالیسـتی بەرچاوتەنـگ نییە و بۆ دۆسـتایەتیی نێوان گەلانی ئێران ڕێز دادەنێ و مافی هەموو گەلانی لە لا بەڕێزە.

دێموکـرات، پارێزەری مافی زەحمەتکێشـانە و دژی هەر چەشـنە چەوسانەوەیەکی ئادەمیزاد بە دەستی ئادەمیزاد خەبات دەکا.

دێموکـرات، لایەنگری بەرابەریی تەواوی مافـی ژنان و پیاوان لە کۆمەڵ و لە نێو خێزاندایە.

دێموکرات، بەشەردۆسـتە و دۆستایەتیی نێوان ئینسانەکان، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ڕەگەز و مەزهەب، بایەخێکی زۆر دەدا و هەر چەشنە ڕەگەز پەرستی و فاشیزم و مەزنیخوازییەک مەحکووم دەکا.

لە هەڵبژاردنی ئەندامانی کومیتەی ناوەندیدا تەیفی فیکریی دوکتور قاسـملوو توانی بە وەلاتانی کەسانی وەک محەممەد ئەمین سیراجی و کەریم حیسـامی و چەند کەسـێکی دیکە سـەرکەوتنی دوایی واتە زۆرایەتیی کومیتەی ناوەندی دەستەبەر بکا. بەڵام توودەییەکان پاش کۆتایـی هاتنی کۆنگرە بە دنەدانی حیزبەی تودە دەسـتیان لە پیلان و دژایەتـی بە دژی ڕەوتـی دێموکرات هەڵنەگـرت و دوای کۆنگرە لـە یەکـەم پلینۆمـی کومیتـەی ناوەندیـدا هەوڵیـان دا جێگایەک بۆ خۆیان بکەنەوە. سـەرەتا هەوڵیان دا غەنی بلووریان بکەنە سکرتێر کـە ئەمەیان بـۆ نەچووە پێش. ئەمجار کە سـکرتێر بوو بە دوکتور قاسـملوو، پێشنیاری سـەرۆکی حیزبیان کرد کە بە هۆی ئەوەی کە لە پێڕەوی نێوخۆدا دەرەتانی وەها کارێک نەدرابوو، ئەوەش سەری نەگـرت. حیزبی توودە بەهۆی ئـەوەی کە بە تەواوی چووبووە ژێر

باڵی خومەینی و بە بیانووی خەباتی دژی ئیمپریالیستی دەیهەویست خۆشـــخزمەتی بە ڕێژیمی ئیسلامی بکا، ئەمجار تاقمی توودەیی نێو حیزبـی هـــان دا و گەلاڵەیەکیـان هێنا بە نـاوی «خودگەردانی» کە دەستبەجێ دوکتور قاســملوو لە میتینگی گەورەی شاری مەهاباددا ناوی «ســەرگەردانی» لە ســەر دانا و ڕایگەیاند خەڵکی کوردستان «خودموختاری» دەوێ نەک «سەرگەردانی».

لــە ماوەی پێش کۆنگرەی چوارەم و تا دوای کۆنگرەی چوارمیش حیزبـی دێموکـرات زۆری هەولأ دا بەڵکوو مەســەلەی کوردســتان لە ڕێگای ئاشــتیخوازانەوە چارەســەر بکرێ و چەنــد وەفدی ناردە تاران، بەڵام ســوودی نەبوو و ئاخرەکەی خومەینی لە ڕۆژی ۲۸ی گەلاوێژ لە شــاری پاوە بە بیانووی دەستکرد شەڕی بەسەر خەڵکی کوردســتاندا ســەپاند و خومەینی دەســتووری جیهادی دژی گەلی کورد ساز کرد.

## ■ ۳۰: هەڵبژاردنی مەجلیســی شــوورای ئیســلامی لە کوردستان (۱۳۵۹)

ماوەیەک دوای تەواوبوونی کاروباری کۆنگرەی چوارەم، هەڵبژاردنی نوێنەرانی مەجلیســی شوورا لە سەرەتا سەرتاسەری ئێراندا دەست پــێ کرا. لەگەڵ ئەوەی حیزبی ئێمە لە لایــەن دەوڵەتی خومەینییەوە بە هەڵوەشــاوە!! ڕاگەیەندرابوو و هەر چەند پێشــمان وا نەبوو ئەو ڕێژیمە ڕێگا دەدا نوێنەرانی هەڵبژێردراوی خەڵکی کوردســتان بچنە مەجلیس، دیسان لەو هەڵبژاردنەدا بەشدار بووین. هەر چەند لە زۆر شــاری جنووبی کوردستاندا هەر لە سەرەتاوە ڕێژیمی خومەینی بە بیانووی ئەوەی کە ئەمنیەت نیە، ئامادە نەبوو هەڵبژاردن پێک بهێنێ، بەڵام بــە ئیقراری نوێنەرانی وەزارەتی کیشــوەر کە بۆ چاوەدێریی هەڵبــژاردن هاتبوونە کوردســتان، هەڵبژاردنــی نۆینەرانی مەجلیس

لە کوردســتاندا نموونــەی هەڵبژاردنێکی ســالم و دێموکراتیک بوو. لــەو هەڵبژاردنەدا خەڵکی کوردســتان بۆ یەکەم جــار دەیانتوانی بە ئازادی دەنگ بدەن و نوێنەری خۆیان هەڵبژێرن. کاندیدەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستان لە بەشی زۆری حەوزەکانی هەڵبژاردندا هەر لــە قۆناغی یەکەمدا ســەرکەوتن و لە حەوزەکانی دیکەشــدا هەموو کاندیداکانی حیزب چوونە دەوری دووهەم. لەو هەڵبژاردنەدا بەرنامەی کاری کاندیدەکان هەر هەمان بەرنامەی حیزب بوو. لەم هەڵبژاردنەدا ژمــارەی دەنگی کاندیدە براوەکانی حیزب بەم چەشــنە بوو: «غەنی بلووریان» نوێنەری مەهاباد ٩٥/٢٪ی دەنگەکان، «مستەفا هیجری» نوێنەری نەغەدە و شــنۆ ٢١٠٦١ دەنگ (٩٥/٩٪ی دەنگەکان)، «قادر عەبدی» نوێنەری پیرانشــار و سەردەشــت ٢٨٢٨٥ دەنگ (٨٢/٦٪ی دەنگــەکان)، «ئەبووبەکر هیدایەتی» نوێنــەری بۆکان ١١٦٢٣ دەنگ (٥٧/٢٪ی دەنگەکان)، «فارووق کەیخوســرەوی» نوێنەری سەقز و بانە ٢٠٧٠٢ دەنگ (٥٧/٧٪ی دەنگەکان).

دیارە ئەگەر ئەوەش لە بەرچاو بگرین کە لە هێندێک شــوێندا پێگە و مەوقیعیەتــی شەخســیی کاندیداتۆرەکانــی حیزبەکانی دیکە وەک دوکتــور جەعفەر شــەفیعی لە بۆکان و دوکتور شــاکری لە ســەقز لــە هیی کاندیداکانــی حیزبی دێموکرات زۆر باشــتر بوو، بەڵام بەو حاڵەشــەوە کاندیداکانی حیزب سەرکەوتن، ئەوکات باشتر لە نفووز و خۆشەویستیی حیزب لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا تێدەگەین.

هەڵبژاردنی مەجلیس دەرفەتێک بوو بۆ ئەوەی خەڵکی کوردســتان جارێکی دیکە پشــتیوانیی خۆیان لە حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێــران دەرببــڕن. ئەگــەر لە ســەر یــەک حیسـابی بکەین، ســەدی هەشــتای خەڵکی کوردســتان (لەو شــوێنانەی کە هەڵبژاردن کرا و ڕێگەی بەشــداری بۆ نوێنەرانی حیزب ئاوەڵا بوو) دەنگی خۆیان بە کاندیدەکانی حیزبی دێموکرات دابوو.

بـەڵام هەر وەک چاوەڕوان دەکرا، ڕێژیمی خومەینی هیچ ڕێزێکی بۆ رای خەڵکی کوردستان دانەنا و ڕێگای نەدا هیچ کام لە نوێنەرانی هەڵبژێردراوی خەڵکی کوردستان بچنە مەجلیس.

**■ ٣١: هێرشی سەرتاسەری بۆ سەر کوردستان (بەهاری ١٣٥٩)**

لە مـاوەی نێوان کۆنگرەی چوارەم و کۆنگـرەی پێنجەمی حیزبدا وڵاتــی ئێـران و بەتایبەتی کوردســتان هێندێـک ڕووداوی گەورەی بـە خۆیـەوە دی. هێشــتا دوو مانگ بە ســەر کۆنگـرەی چوارەمدا ڕانەبردبوو ڕێژیمی کۆماری ئیســلامی کە لە پاییزی ســاڵی ١٣٥٨ی هەتاویدا بۆ سەقامگیریی دەسەڵاتی خۆی و بۆ پشوو تازەکردنەوەی هێزەکانی بە پەیامی ٢٦ی خەزەڵوەری خومەینی شەڕی پەلاماردانی کوردســتان ڕاگرتبوو، سەر لە نوێ هێرشی کۆنەپەرەستانەی خۆی بۆ سەر خەڵکی کوردستان دەست پێ کردەوە. پەلاماری ئەمجارەی کۆنەپەرەســتی بۆ سەر کوردستان لەگەڵ هێرشی دڕندانەی هاوینی ساڵی ١٣٥٨ جیاوازییەکی زۆری هەبوو. لە پێشدا گەمارۆیەکی توندی ئابووریی خستە سەر کوردستان و تەنانەت پێشی بە هاتنی دەرمانی نەخۆشـان و شیر وشـکی منداڵانیش گرت، بەو مەبەستە کە خەڵکی قارەمانی کوردستان بە چۆکدا بێنێ. پاشان کاتێک کە تێگەیشت ئەو کارە دژی گەلییە چووکەترین شـوێندانەریی لە ســەر ورەی بەرزی کۆمەڵانی تێکۆشەری گەلی کورد دانەناوە، گوللە تۆپ و خومپارە و ڕاکێت و بۆمبی بە ســەر ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتووی شـار و گوندەکانی کوردستاندا باراند.

قوربانیــی یەکەمــی ئــەم سیاســەتە، شـاری ســنەی خۆڕاگـر و قارەمانپــەروەر بوو کە لە شــەڕێکی ٢٦ ڕۆژەدا دەیان حەماســەی ئازایەتیی لە بەرانبەر ئاگربارانی لەشکری پۆشتە و پەرداخی ڕێژیمدا تۆمار کرد. بەدوای ســنەدا شاری نەبەزی سەقز و شاری قارەمانی

بانــە کەوتنە بەر هێرش، ئەو دوو شــارە سەرســەخت و لە شــکان نەهاتووەش هەر زیاتر لە مانگێک لە ژێر رەهێڵەی شێستێر و بارانی تۆپ و خومپارە و راکێتی کۆنەپەرەستیدا ژن و پیاو و پیر و لاویان بوو بە قوربانیی سیاسەتی فاشیستیی رێژیمی خومەینی.

هاوکات لەگەڵ کوتانی شارەکانی کوردستان، هێرشی کۆنەپەرەستی بۆ ســەر ناوچە لادێیەکانیش دەســتی پێ کردبوو. لە شــیمالەوە تا جنووب لە هەموو جێگایەک ئاگری شەڕێکی نارەوا کڵپەی هەڵدەستا و شــار و گوند و شــاخ و دەشــتی پێکەوە دەســووتاند. لە کۆتایی هاوینی ١٣٥٩دا رێژیمی خومەینی هێرشــی دڕندانەی خۆی بۆ سەر شاری مەهاباد دەست پێ کرد. فەرماندەی پادگان بە پانەوە دەیگوت: «دەســتوورمان پــێ دراوە کــە مەهابــاد خاپوور بکەیــن و پیواز و پەتاتەی لێ بچێنین».

لــە ناوچــە لادێکانیشــدا هێزەکانــی کۆنەپەرســتی دەڕندەیــی و خوێنخۆریــی خۆیــان گەیاندە ئەوپەڕی. لە هــەر جێگایەک بەرامبەر بــە هێزی لەشــکان نەهاتووی پێشــمەرگە و خۆیان پــێ ڕانەگیرا و پاشەکشــەیان دەکرد. پەلاماریان بردە ســەر دێنشــینە بێدیفاعەکان و قەلاچۆیــان تێ خســتن. «قەڵاتــان و ئیندرقاش و وەســووکەند و حانەگی و سۆفیان و کولیج و سەرۆکانی و دارەلەک و هەڵەقۆش و گێچێ» و دەیان گوندی دیکەی کوردستان شاهیدی وەحشیگەری و خوێنڕێژیی بە ناو پاسدارانی ئیسلام! بوون. بە کورتی هیچ شارێکی کوردســتان نەما کە وە بــەر پەرلاماری کۆنەپەرەســتی نەکەوێ و کەمتــر دێیەک لەو نیشــتمانە پان و بەرینەدا ما کە دەســتی چەپەڵی دوژمنانی ئازادی جینایەتێکی تێدا نەخولقاندبێ.

بــەڵام خەڵکی قارەمــان و ئازادیخوازی کوردســتان بەرانبەر بەو هەموو مرۆڤکوژی و دڕندەییەی دوژمنانی مرۆڤایەتی وەک کێوێکی پۆلایین راوەستان و هیچ کاتێک تەسلیمی زبروزەنگی کۆنەپەرەستان

نەبوون.

خەڵکی شارەکان تەرمی نزیکترین خۆشەویستانی خۆیان لە حەوشەی ماڵەکانیاندا دەناشت، بەڵام حازر نەبوون سەر بۆ دوژمن نەوی بکەن، فەرماندەی پادگانی مەهاباد گوتبووی شەش مانگە من لێرەم، یەک نەفەر مەهابادی رووی نەکردووەتە پادگان. خەڵکی گوندە کاولکراوەکانی کوردستانیش چەک لە سەر شان، لە ریزی پێشمەرگەدا دیفاعیان لە ئازادیی گەلەکەیان دەکرد و دەیانگوت ئێستا کە دێکانمان سووتاون، چیمان ماوە لە دەستی بدەین؟ قەلاچۆی چەند گوندی کوردستان نەک هەر دێنشینە بەشەرەفەکانی چاوترسێن نەکرد، بەڵکوو زیاتر هانی دان کە چەک هەڵبگرن و دیفاع لە خۆیان بکەن تا بە دەردی «ئیندرقاش و وەسووکەند» و گوندە قەلاچۆکراوەکانی دیکە نەچن. بەو جۆرە گەلی کورد بە دنیای نیشان دا کە لە پێناوی ئازادیدا لە هیچ جۆرە فیداکارییەک درێغ ناکا و هەر بۆیەش شایانی ژیانێکی ئازاد و سەربەستە.

## ■ ٣٢: شەڕی ٢٦ رۆژەی سنە (١٣٥٩)

خومەینی ساڵی ١٣٥٩ی وەکوو «ساڵی ئەمنیەت» ڕاگەیاندبوو و بۆ ئەم مەبەستە دەستی سپا و ئەرتەشیان ئاوەڵا کردبوو بۆ دابینکردنی ئەمنیەت بە هەر قیمەتێک و مەبەست ئەوە بوو کە دەتوانن دەست بۆ هەموو کارێک بەرن.

بەنی سەدر لە ڕێوڕەسمی ١٢ی خاکەلێوە ساڵڕۆژی دامەزرانی کۆماری ئیسلامیدا پێداگریی کردبوو کە مەسەلەی یەکەمی وڵات بە تێگەیشتن لە پەیامی خومەینی ئەمنیەتە و رایگەیاندبوو کە لەم ساتەوە ئەرتەش بۆی نیە پۆتینەکانی لە پێ دەر بێنێ تا ئەو کاتە ئەم ناوچەیە لەم یاخییانە پاک دەکاتەوە. رۆژی ٢٤ی خاکەلێوەی ١٣٥٩ بنی سەدر رایگەیاند ئەگەر ئەوان دەڵێن هەر چیمان دەوێ دەبێ

پێمان بدەن دەنا شــەر دەس پــێ دەکەین، من بە میللەت رادەگەیەنم کە هیچ کاتێک جیابوونەوەی تەنانەت بســتێک لە خاکی وڵات قبووڵ ناکەم.

ئەم هێرشــە توندانەی بەنی ســەدر لە کاتێکدا بوو کە هیچ کام لە هێزەکانی کوردستانی ئێران خوازیاری جیابوونەوە لە ئێران نەبوون و زورتر پێوەندیی بە کێشە و دووبەرەکایەتییەکەوە هەبوو لە نێوان خەتی ئیمام و بەناو لیبراڵەکاندا هەبوو. ناوبراو وەک ســەرکۆمار لە نێوخۆی رێژیمدا لەگەڵ شووڕای ئینقلاب کە بە دەستی ئاخوندکانەوە بــوو، لە کێبڕکێدا بوو و بەم لێدوانە توندانە دەیهەویســت پێگەیەکی قایمتر بۆ خۆی دابین بکا. کوردستان لە ماوەی ئەو چەند دەیەدا بە داخەوە خاڵێکی کێبڕکێ مۆرە ورد و درشتەکانی رێژیم بوو. کامەیان هەڕەشــەیان بۆ ســەر کوردســتان توندتر و جنایەت و ســەرکوتی زیاتریان بە رێوە بردبێت، باڵادەســتتر دەبوون و ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو روانینە کە سیســتمی کۆماری ئیســلامی بەگشــتی لە ســەر کوردستان هەیەتی.

پێویســتە دووپاتــی بکەینــەوە کــە جموجۆڵــی شــەڕخوازانە و ئاژاوەگێڕانەی هێزە پەلاماردەرەکانی رێژیم هەر لە زستانی ١٣٥٨ی هەتاویدا دەستی پێ کردبوو، هێشتا ساڵۆنی کۆبوونەوەکانی کۆنگرە چۆڵ نەکرابوو کە لە شیمال و جنووبی کوردستان خەبەری پەلاماری دوژمــن بــڵاو بــووەوە. لە ناوچــەی کامیــاران لە جنــووب، وێڕای گەمارۆی ئابووری، پەلاماری نیزامیش درێژەی هەبوو. لە شیمالیش لە دەوروبەری ورمێ کۆنەپەرەســتان دەیانەویســت شۆڕشــگێڕانی کورد چەک بکەن. بەڵام هێرشــی بەربڵاو و بێبەزەییانەی جەللادانی رێژیمی خومەینی لە بەهاری ١٣٥٩دا دەستی پێ کرد.

یەکەم قوربانیی ئەو پەلامارە وەحشیانەیە شاری قارەمانپەروەری سنە بوو. سنەی خوێناوی نزیکەی چل رۆژ لە ژێر ئاگربارانی تانک

و تۆپ و خومپارە و هێلیکۆپتێر و فانتۆمدا بوو، بە هەزاران شەهید و بریندار ی دا، بە سەدان خانووی بە سەر دانیشتوانی بێ دیفاعیاندا رووخاند، دەیان و بگرە سەدان میلیۆن تمەن زیان و زەرەری مالّیی وێکەوت. بە کورتی هەرچی شوێنەواری ئاوەدانیی ئادەمیزادی سەدەی بیستەمە، لە نەخۆشخانە و قوتابخانە و هیتر، هەمووی بە دەستی کوندەبووی نەگبەتی لە نێو چوو.

لێرەدا پێویستە بگوترێ کاتێک هێزەکانی رێژیم بە مەبەستی هەڵگیرساندنی شەڕ دەیانەویست بە شاری سنەدا تێپەڕن و بەرەو سەقز بڕۆن، حیزبی دێموکرات زۆری هەوڵ دا رێگایان بدرێ بڕۆن بۆ ئەوەی شەڕەکە بچێتە دەرەوەی شار و خەڵکی بێ دیفاع نەکوژرێ و شارەکەش وێران نەبێ. بەڵام بەداخەوە هێندێک دەستە و تاقمی بێ ئەزموون شەڕەکەیان لە نێو شاردا هەڵگیرساند، دروشمی «سنە دەکەینە ئیستالینگراد»یان هەڵگرت و کاتێکیش دوژمن بە هەموو هێزی سەرکوتی خۆیەوە دەستی بە کوتانی شار کرد، پێشمەرگەکانی حیزب جگە لەوەی کە دیفاع لە خەڵک بکەن، رێگایەکیان بۆ نەمایەوە. بەڵام ئەندامانی ئەو گرووپانە کە لایەنگری شەڕی نێو شار بوون، شاریان بە جێ هێشت.

شەڕی سنە رۆژی ٢ی بانەمەڕ دەستی پێ کرد و شوێنە جۆراوجۆرەکانی سنە کەوتنە بەر رەهێڵەی ئاگری تۆپخانەی پادگان. بە وتەی سەرهەنگ سەدری فەرماندەی پادگانی لەشکری ٢٨ی سنە، ئەوان تەنیا لەو پادگانەوە لە هەر کاتژمێرێکدا ٤٠٠ گوللە تۆپیان بە شاری سنەوە ناوە و ئەمە بێجگە لە بۆمب هەڵڕشتن و تیربارانی فڕۆکە و هێلیکۆپتر بوو کە بەردەوام بە سەر شاردا دەسووڕانەوە و شاریان بۆردمان دەکرد.

گوردانی ٢ی سپای تاران بە فەرمانی ئەبووشەریف بە هوی هێلیکۆپترەوە گوازرایەوە بۆ پادگانی سنە و رێژیم بەردەوام هێزی

زیاتر و زیاتری دەنارده مەیدانی شــەڕەوە و ســپای ئیســفەهان بە ســەرکردایەتیی سەبیادی شــیرازی و رەحیم سەفەویش بۆ شەڕی سـنه بــەڕێ کــران و له ســپای کرماشــانیش بو ئەو شــەڕە کەڵک وەرگیرا.

محەممــەد برووجــردی کــه دەکرێتــه فەرمانــدەی لەشــکرەکانی کرماشــان و پارێزگای کوردســتان دەڵێ: کاتێک پادگانی لەشــکری ٢٨ی کوردســتانم وەرگرت، ٣٠ قەبزە چەکی ١٠٦ میلیم و ٢٠ قەبزە خومپــارەی ١٢٠ میلیمم بە موهیماتێکی تــەواوەوە وەرگرت کە ئەو چەکوچۆڵە بۆ ساڵیانی ساڵ شەڕ لە کوردستاندا بەس بوو.

له رۆژی یەکەمی شــەڕدا پێوەندیی نێوان پادگان و فڕۆکەخانە و باشــگای ئەفسەران کە شــوێنی جێگیربوونی لە پادگانی سنەدا بوو، پچڕا. بەو هۆیەوە لە هەموو ئەو ئەفســەر و دەرەجەدار و سەربازە کوردانە دردۆنگ دەبن و بە عامیلی بە وتەی خۆیان دژەشۆڕشــیان ناو دەبەن، بۆیە یان دەریان دەکەن یا دەستبەسەر.

لەسێ رۆژی سەرەتای شەڕەکەدا بەپێی ئاماری خودی رێژیم ٢٦ کــەس له هێزەکانی رێژیم کوژران. یەکەمین کوژراویان ســەرهەنگ نوســرەت زادە، فەرمانــدەی تیپی یەکی لەشــکری کوردســتان بوو کە پاش کوژرانی پلەکەیان بردەســەرەوە. پاش ئەم شــەڕە بوو کە قــەرارگای «حەمــزەی سەیدولشــوهەدا»یان لەهەموو کوردســتان دامەرزاند.

لــه درێــژەی ئەم شــەڕەدا هێزەکانــی رێژیم لە گەمــارۆی هێزی پێشــمەرگەدا دەبن کە بــە هێلیکۆپتر تەداروکاتیان بــۆ دەچوو و لە ناکامــی ئاگــری چەکەکانی هێــزی پێشــمەرگەدا هێلیکۆپتر دەکەونە خوارەوە.

هاوکات لەگەڵ ئەو شــەڕە، لەبەشــێک لەشــارەکانی کوردســتانی ئێران بۆ پشــتیوانی لە سنەخۆپێشــاندان کرا و لەهەموو شــارەکاندا

یارمەتی و خواردن و دەرمان بو سنەدەنێردرا.

بەداخەوە لەو شـــەڕەدا زیاتر لە بیست پێشمەرگەی حیزب شەهید و ژمارەیەکی زۆریش بریندار بوون. لە کۆتاییدا خەڵکی شاری سنە راستی و دروستیی سیاســەتی حیزبی دێموکراتیان بۆ دەرکەوت و تێگەیشــتن کە لە بەر پاراســتنی گیان و ماڵی ئــەوان بوو کە حیزب خۆی لە شەڕی نێو شار دەبوارد.

## ■ ٣٣: جیابوونــەوەی تاقمی حەوت کەســی لــە حیزبی دێموکرات (١٣٥٩)

لە ســەروبەندی ســەرکەوتنی شۆرشــی ٥٧دا رێبەریی حیزب بە سەر سێ بیروبۆچووندا دابەش کرابوون: بیروبۆچوونی عەشیرەتی، بیروبۆچوونــی توودەیی، بیروبۆچوونی دێموکـرات و نەتەوەخواز. نوێنــەری بیروبۆچوونــی توودەیی لــە رێبەریدا غەنــی بلووریان و محەممەد ئەمینی ســەراجی بــوون، نوێنەری بیــری نەتەوەخوازیی دێموکراتیک دوکتور قاسملوو بوو و چەند کەسێکیش نوێنەری بیری عەشیرەتی بوون.

پاش ســەپاندنی شەڕ بە سەر کورد و حیزبی دێموکراتدا لە لایەن ڕێژیمەوە، باندی توودەیی نێو حیزب لە سەر رێنوێنیی حیزبی توودە دەســتیان دایە پۆلێنکردنێکی ســەیر و هەر کەس و لایەنێک ئامادەی نۆکەری بۆ رێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی نەبووبایە، بە دژەشۆڕش و خزمەتگوزاری ئەمپریالیزم ناودێریان دەکرد. ئەم گرووپە کێشەی کوردی گرێ دابوو بە خاشەبڕکردنی ئاسەواری دەسەلاتی سیاسی، کۆمەلایەتی و ئابووریی ئەمپریالیزم و ســەقامگیرکردنی دەوڵەتێکی میللی دێموکراتیک کە لــە چوارچێوەی ئەو رێژیمەدا خودموختاریی فەرهەنگــی و ئیـداری لــە چوارچێـوەی تەواویەتی ئەرزیــی ئێراندا مسۆگەر بکرێ.

بەڵام دوکتور قاسملوو و هاوڕێیانی مەسەلەی پشتیوانیکردن لە شۆڕش و بەڕێوەبەرایەتییەکەیان بەستبوو بە چارەسەری کێشەی کورد لە چوارچێوەی گەڵاڵەی پێشنیارکراوی خودموختاری و ڕاگەیاندن و جێبەجێکردنی لە لایەن کاربەدەستانی تارانەوە.

یەکێک لەخاڵەپەسەندکراوەکانی کۆنگرەی چوارەم درێژەدان بەوتوویژ لەگەڵ کوماری ئیسلامی بوو. هەر چەند کە پەسەندکرانی ئەم بڕیارەش نەیتوانی پێش بە شەرخوازیی کۆماری ئیسلامی بگرێ و دوای چەند مانگ بەناو وتوویژ، ڕژیم بەدنیەتیی خۆی نیشان دا و هەر لەڕۆژەکانی بەڕێوەچوونی کۆنگرەی چوارەمدا بوو کەهێرشی خوی لەپاوە و کامیارانەوە بۆ ناوچەئازادکراوەکان دەست پێ کرد و پاش تەواوبونی کۆنگرەی چوارەمیش حیزب زۆری هەوڵ دا تا وتوویژەکان بەردەوام بن، بەڵکوو مەسەلەی کورد لەڕێی وتوویژەوە چارەسەر بکرێ. تەنانەت پاش گەڵاڵە٢٦ مادەییەکەی هەیئەتی نوینەرایەتیی گەلی کورد کەبەئاکام نەگەیشت، حیزبی دێموکرات لەهەوڵێکی دیکەدا بۆ بەئاکام گەیاندنی وتوویژ گەلالەیەکی ٦ مادەیی پێشکەش بەدەوڵەت کرد کەئەمەشیان بێ وەڵام مایەوە.

ئەم کێشەیە هەروا درێژەی کێشا و دەیان تۆمەتیان بۆ دوکتور قاسملوو و حیزبی دێموکرات وەکوو عامیلی ناتۆ، عامیلی بەعس و.. ساز کرد و لە پشتی هەموو ئەم تەبلیغەوە دەستی حیزبە دۆڕاوەکەی توودە دیار بوو، تا لە ئاکامدا لە رۆژی ٢٥ی جۆزەردانی ١٣٥٩ی هەتاوی ٧ کەس لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بە ناوەکانی غەنی بلوریان، رەحیم سەیفی قازی، فەوزیە قازی، فاورق کەیخوسرەوی، ئەحمەد عەزیزی، نەوید موعینی و مامۆستا هێمن، لە بەیاننامەیەکدا جیابوونەوەی خۆیان راگەیاند و خۆیان بە «حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران - پەیڕەوانی کۆنگرەی چوارەم» لە قەڵەم دا و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانیشیان کە ١٨ ئەندامی کومیتەی

ناوەندی و زیاتر لە ٩٥٪ی ئەندام و کادر و پێشمەرگەکانیان لەگەڵ بوو، بە «باندی قاسملوو» لە قەڵەم دابوو.

لە بەیاننامەکەدا ڕایانگەیاندبوو کە بە پەیڕەوی لە ڕێبازی دیاریکراوی کۆنگرەی چوارەم دەچنەوە ناو ڕێژیم و بە وتەی خۆیان «باندی قاسملوو»یان وە دەر ناوە، لەو ڕاگەیەندراوەدا زۆر تومەت وەپاڵ ڕێبەرایەتیی حیزب بە تایبەت شەخسی دوکتور قاسملوو درابوون، ئەوان لە ڕاگەیاندراوەکەیاندا حیزبی دێموکراتیان بە لادان لە ڕێبازی کونگرەی چوارەم تۆمەتبار دەکرد و خۆیان بە پەیڕەوانی کۆنگرەی چوارەم لە قەڵەم دەدا، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە بەرنامەی حیزب لە کۆنگرەیەکدا پەسەند کرابوو کە ئەوان شکستیان هێنابوو، لەو ڕاگەیەندراوەدا هاتبوو کە: «کومیتەی ناوەندی لەو ماوەیەدا بە کوشتنی ئەو برا پاسدارانە زۆر جینایەتی کردوون کە ئەوانیش لە بەر ئەوەی ئیفشاگەرییان لەو بارەوە بۆ کۆمەڵانی خەڵک و توودەهای حیزبی نەکردووە، خۆیان بە تاوانبار دەزانن».

لەو بەیاننامەدا هەروەها هاتبوو کە ئەم باندە سەر بە سۆسیال دێموکراسیی ئورووپای غەربییە و لەگەڵ ئاڵوگۆڕەکانی دنیای ئەمڕۆ دژایەتی دەکا و مێشکی ریفۆرمیشی هەیە و ناسیۆنالیستی کوێر و بەرچاوتەنگە، ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە دوکتور قاسملوو هەوڵی گونجاندنی «سۆسیالیزمی دێموکراتیک»ی لە بەرنامەی حیزبدا دەدا.

ئەمە کاکڵی بۆچوونی گرووپی حەوت کەسی بوو کە تەنانەت واوێکیش لەگەڵ بۆچوونی حیزبی توده فەرقی نەبوو و لە ڕاستیدا هەر هەمان بۆچوونی حیزبی توده بوو کە پێیان دیکتە کرابوو و ئەوانیش «تووتی وار» دەیانگوتەوە. بەم چەشنە گرووپی حەوت کەسی بە ژمارەیەک کادر و پێشمەرگەی لایەنگری خۆیانەوە چوونەوە و لە نێو ڕێژیمدا جاسووسییان لە سەر ئەندامانی حیزب

دەکرد و شـەڕیان لەگەڵ هێزی پێشـمەرگە دەست پێکرد. ماوەیەک پـاش جیابوونەوەیان بە دنەدانی ئـەوان و حیزبی توودە گرووپێکی ٣ کەسیی دیکە لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی بە ناوەکانی «سەنار مامـەدی، جهانگیر ئیسـماعیل زادە و ڕەحمـان کەریمی» لە حیزب جیـا بوونـەوە و بـە هاوکاریـی ئـەو ٣ کەسـەی دیکە بـە تایبەتی جهانگیر و سەننار کە هێزی عەشیرەیی خۆیان لەگەڵیان بوو، لەگەڵ هێزی پێشـمەرگە بە شـەڕ هاتن و چەند ناوچەیەکیان بە هاوکاریی پاسـدارەکان لە دەستی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دەرهێنا و لە گێرانـەوەی هـەر کام لە ناوچەکاندا ئەحمەد عەزیـزی، کە ئەو کات لە نێو تاقمی حەوت کەسـیدا بەرپرسـایەتیی تەشـکیلاتیی لە سـەر شـان بوو، بۆ خەڵک لە دژی حیزب و بە پشـتیوانیی پاسـدارەکان و خومەینـی و ڕێژیمی کۆماری ئیسـلامی تەبلیغی دەکرد. ڕەحمان کەریمی پاش ماوەیەک کە لە لایەن ڕێژیمەوە مەئموورییەتی کوشتنی سەنناری پێ دەدرێ و سەننار بەم پیلانە دەزانێ و دەستپێشخەری دەکا و ڕەحمان کەریمی دەکوژرێ.

لە کاتی جیابوونەوەی گرووپی حەوت کەسیدا دوکتور قاسملوو لە مەهابـاد میتینگێکی بۆ خەڵک پێک هێنا و پێی ڕاگەیاندن کە گرووپی حـەوت کەسـی داوای چەکدانان و تەسـلیم بوونەوەمـان بە ڕێژیم دەکەن، ئێوە چ دەڵێن کە لەو میتینگەدا خەڵک ئەو گرووپەیان بە خائین ناسـی و داوایـان لە حیزب کرد کە درێژە بـە خەبات تا وەدیهێنانی ئامانجەکانی گەل بدات، خەباتێک کە تا ئێستاش بەردەوامە.

تاقمی حەوت کەسی دواتر بە سەر سێ بەشدا دابەش بوون:

بەشی یەکەمیان وەک فارووق کەیخوسرەوی و .. بوون بە بەشێک لە ڕێژیم.

بەشـی دووهەم پێش لە کۆنگرەی حەوتەم داوایان کرد بگەڕێنەوە بۆ حیزب. کومیتەی ناوەندی پێی ڕایگەیاندن کە دەتوانن بگەڕێنەوە

بۆ نێو حیزب، بەڵام پێش لەوەی کە بگەڕێنەوە پێویستە هەم پەیڕەوی نێوخۆی حیزب بەو شێوەیە کە لە کۆنگرەی شەشەمدا پەسەند کراوە قبـووڵ بکەن، هەم هەڵوێسـتی خۆیان لەمەڕ چالاکیـی ڕابردوویان بەرانبەر بە سیاسەتی ئەو کاتی تاقمی حەوت کەسی کە دوژمنایەتیی لەگەڵ بزووتنەوەی میللی ـ دێموکراتیکی خەڵکی کوردسـتان هەبوو، روون بکەنەوە و ئەم بۆچوونەی خۆیان دەبێ بە شێوەی نووسراوە بـدەن بە حیزب. ئەو جارە حیزب ماوەیەکیان بۆ دیاری دەکا، ئەگەر لـەو ماوەیـەدا نیازپاکی و دڵسـۆزیی خۆیان بە کردەوە نیشـان دا، ئـەو کات تاک تاک بە ئەندامی حیزب وەردەگیرێنەوە کە بە پێی ئەم مەرجە چەند کەسێکیان گەڕانەوە بۆ نێو حیزب.

بەشـی سـێهەم پـاش چەند سـاڵ لـە ڕاگەیەندراوێکی رەسـمیدا خۆیان بە هەڵوەشـاوە ڕاگەیاند، پاش ئەوەی ژمارەیەکیان (سراجی، بلووریـان) چوونـەوە باوەشـی حیزبـی دایکیان (تـوودە) و غەنی بلووریان دەستبەجێ بوو بەئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزبی توودە، سەرەنجام ناوێک لەو تاقمە نەما و ئێستاش خەڵکی کوردستان وەک بەشێک لە مێژوو سەیری دەکەن.

لە پاش جیابوونەوەی ئەم گرووپە لە یەکەم کۆبوونەوەی خۆیاندا ٦ کەسـی دیکـە کران بـە ئەندامی کومیتـەی ناوەنـدی (کارێک کە رەوتی ڕەستگار ـ حەسـەنزادەش پاش دابڕانیان لە حیزب کردیان). محەممـەد ئەمین سـیراجی لە یەکـەم کۆبوونەوەدا کـرا بە ئەندامی کومیتەی ناوەندی و دەسـتبەجێ بوو بە ئەندامی دەفتەری سیاسی. ئەم کەسـانەش بوون بە ئەندامی کومیتـەی ناوەندی: قادر خالیدی، ناسـر خۆشکەلام، حوسێن بەخشی، کە لە هەموو کۆبوونەوەکانیاندا ٣ کادری کوردی حیزبی توودە بەشـدارییان دەکرد. هەر لەو کاتەدا محەممەد ئەمین سـیراجی، غەنی بلووریان و رەحیم سـەیف قازی، لە تاران لە تەنیشت حیزبی توودە قۆناغی پێگەیشتن و تێگەیشتنیان

تێدەپەڕاند و بەم چەشــنە گرووپی حەوت کەســی بە تەواوی کەوتە بەر دەستی حیزبی دایک و هەر چەشنە سەربەخۆییەکی بڕیاردانیان لێ زەوت کرا. لە راستیشدا پاش ئەم قۆناغە سیاسەتی حیزبی توودە لــە رێــگای پەیڕەوانی کۆنگرەی چــوارەوە لە کوردســتاندا بە ڕێوە دەچوو. رۆژنامەکەشیان هەر بە ناوی «کوردستان» دەر دەکرد.

لــە بەهاری ١٣٦١دا ژمارەیــەک لە ئەندامانی کومیتــەی ناوەندیی حیزبــی توودە پاش ئــەو هەموو خزمەتە تەنانەت لــە ئیختیاردانانی لیســتەی ئەندامانیــان و خۆشــخزمەتییەکی لە رادەبــەدەر لە لایەن رێژیمی ئیســلامییەوە گیــران و لــە رۆژی ١٧ی رێبەندانی ١٣٦١ی هەتاویدا کیانووری، ســکرتێری گشتیی حیزبی توودە و چەند کەس لــە بەڕێوەبەرانی دیکەیان کەوتنە بەر هێــرش و گیران و ئەندامانی رێبەریــی حیزبــی تودە دەســتیان بە ئیعترافاتی ســەیر و ســەمەرە لەسەر رادیۆ و تەلەڤیزیۆن کرد و خۆیان بە عامیلی بێگانە، خائین و .. لــە قەڵەم دا و خومەینی و رێژیمەکەیان بە نموونەی رێژیمی باش هێنایە بەر باس و داوای لێبووردنیان لێی کرد.

لــە ســەرەتای مانگــی بانەمــەڕی ١٣٦٢دا راوەدوونــان و گرتنی توودەییــەکان دەســتی پێکــرد و لە رۆژی ١١ی بانەمــەڕی ١٣٦٢دا «کیانووری» سکرتێری گشتیی حیزبی توودەیان هێنایە سەر شاشەی تەلەڤیزیۆنــی ئێران و ناوبراو دانی بــە خەیانەتەکانی حیزبی توودە و پێوەندیی بەســتراوەیی بە حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتیی سۆڤییەت و ســیخوڕیکردن بۆ ئەو وڵاتە و هەروەها چەوتیی بیروبۆچوون و ئامانجەکانی حیزبەکەیاندا نا.

لەم پێوەندییەدا بوو کە تاقمی حەوت کەسیش وە خۆیان کەوتن و بەرەو «خواکوڕک» هەڵاتن و ماوەی ٣ ساڵ لە لای حیزبی شیوعی مانــەوە کــە لەو ماوەیەدا ٣ کەســیان بە ناوەکانی غەنــی بلووریان، محەممەد ئەمین سراجی و نوید موعینی بە هیوای قسەکردن لەگەڵ

ڕێبەرایەتیی حیزب لە دەرەوە بوون و لە ئاکامدا بە پێی نامەیەک و بە بێ ئەوەی پرس بەو کەسانەیان بکەن کە لە «خواکورک» لای حیزبی شیوعی بوون، بڕیاری تێکەڵبوون بە حیزبی توودەیان قبووڵ کرد، غەنی بلووریان بوو بە ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزبی توودە و محەممەد ئەمین سیراجی بوو بە ئەندامی کومیتەی ناوەندی و بەپێی ڕاگەیەندراوێک خۆیان هەڵوەشاندەوە کە پاش چەند ساڵ لەگەڵ حیزبی تودە بوون و جارێکی دیکە بەپێی بەیاننامەیەک کە لە ڕێکەوتی ١٠ی خاکەلێوەی ١٣٦٩ دەرچوو، ئاماژەیان بە هەڵەی خۆیان لە رابردوودا کرد و جیابوونەوەی خۆیان لە حیزبی توودەی ئێران ڕاگەیاند، حیزبی توودەیەک کە بۆ خۆی مەوزووعیەتی نەمابوو، باسێکی نەدەکرا. لە بەشێک لەو بەیاننامەیەدا هاتبوو کە:

«پێویست بە گوتنە، کاتێ کە ڕێبەران و کادر و ئەندامانی حیزبی توودە و گرووپی حەوت کەسی کەوتنە بەر پەلاماری ڕێژیم، ڕێبەرایەتیی حیزبی دیموکرات لە ڕاگەیاندنێکی بەرپرسانەدا ڕایگەیاند باوەش بۆ پەنادانی ئەو کەسانە کە لە دەستی ڕێژیم هەڵبێن، ئاوەڵایە، بێ ئەوەی قەسدی کەمترین تۆڵەکردنەوەی لە کەس هەبێ کە لەم پێوەندییەدا چەند کەسێکیش پەنایان بۆ حیزب هێنایەوە و پەنا دران».

یەکێکی دیکە لە کەسانی سەر بە ئەو تاقمە «ڕەحمان کەریمی» بوو کە بە پێی بڕیاری کومیتەی ناوەندی، بە تاوانی «پیلانگێڕی لە دژی حیزب»، خیانەت بە ئامانجەکانی گەلی کورد و جاسووسی بۆ دەسەڵاتی حاکم (وەک دەرخستنی نهێنییەکانی حیزب)، پێوەندی لەگەڵ سپای پاسداران و ئەرتەش بەبێ ئیزنی حیزب، تەواوکردنی عەمەلیاتی نیزامی لە پیرانشار بە قازانجی دوژمن (بە گوێرەی نووسراوی خۆی)، پیلانگێڕان لە ناو حیزبدا بۆ لەناوبردنی یەکگرتوویی ڕیزەکانی حیزب، بڵاوکردنەوەی درۆ و دەلەسە و بەستنی تۆمەتی

نارەوا بە ڕێبەرایەتی حیزب، هاوکاری لەگەڵ «سەنار مامەدی» کە بە خائین بە حیزب و جووڵانەوەی گەلی کورد دەناسرا لە حیزب دەرکرا و بەو تاوانانە بۆ موحاکمە ڕەوانەی دادگای شۆڕش کرا.

شایانی باسە ڕەحمان کەریمی پاش دەرکەوتنی پیلانێکی بۆ بەدەستەوەدانی سەنار مامەدی، لە لایەن ناوبراوەوە دەستبەسەر و ئیعدام کرا.

### ■ ٣٤: دامەزرانی ڕادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران (١٣٥٩)

لە جەرەیانی خەباتی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورددا بۆ بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی خەباتی گەلی کورد و گەیاندنی دەنگی خەبات و هەروەها لەقاودانی جینایەتەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێران، بوونی دەزگایەکی ڕادیۆیی زەروورەتێکی زۆری پەیدا کردبوو. بۆیە لە هەوڵێکی چڕوپڕدا سەرەنجام دەزگایەکی ڕادیۆیی دامەزرا و بە ناوی «دەنگی کوردستانی ئێران»ەوە لە ڕۆژی ٢٧ی جۆزەردانی ١٣٥٩، ڕادیۆ دەنگی کوردستان بە دوو زمانی کوردی و فارسی دەستی بە کار کرد.

ڕادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران لە ماوەی تێکۆشانیدا بە هۆی شەڕ لە کوردستاندا زۆر جار ئاڵ و گۆڕ بە شوێنی بنکەکەی کراوە، بەڵام ساتێک لە بڵاوکردنەوەی بەرنامەکانی نەوەستاوە. ڕادیۆیەکی ڕاستگۆ و حەقبێژ و جێگای متمانەی گەلی کورد و گەلانی دیکەی ئێران بووە. لە پاش کۆنگرەی ١٣ ڕادیۆ کوردستان کەوتە سەر کاناڵی دیجیتاڵ و لە ساڵی ١٣٨٥یشەوە بەرنامەی ڕادیۆ لە کاناڵی ماهوارەیی «تیشک»ەوە بڵاو دەکرایەوە.

لە جەریانی جیابوونەوەی گرووپێک لە کادر و پێشمەرگەکانی حیزب لە ڕێکەوتی ١٣٨٥/٩/١٥ی هەتاویدا زۆربەی پێرسۆنێلی ڕادیۆ سەر بە جەریانی دابڕاو بوون و وایان دانابوو کە ڕادیۆ دەنگی

کوردستان لە بڵاوکردنەوەی هەواڵ و بابەتەکانیدا بە تەعتیلی بکێشن، بەڵام بە هەوڵأو هیمەتی ٢ تا ٣ کادر و پێشمەرگە، هەر لەو ڕۆژەی کە جیابوونەوەکە ڕووی دا، بەرنامەی ڕادیۆ وەک هەمیشــە دەستی بە وەشــاندنی بەرنامەکانی ئاســایی خۆی کــرد و ڕۆژی دواتریش ڕادیۆ بە شێوەی ڕاستەخۆ بەرنامەکانی خۆی بڵاو کردەوە و پیلانی تاقمی ڕۆیشتووش نەیتوانی چرکەساتێکیش کۆسپ لە سەر پەخشی بەرنامەکانی ڕادیۆ دابنێت.

■ کرانەوەی نیو ســاعەت بەرنامەی ئازەربایجانی لە ڕادیۆ دەنگی کوردستاندا (١٣٥٩)

لە ڕێکەوتی ٥٩/١٠/١٥دا کۆمیتەی ناوەندیی حیزب لە ڕادیۆ دەنگی کوردســتاندا بەشی ئازەریی کردەوە و لەم پێوەندییەدا پەیامێکی بۆ گەلی تێکۆشەری ئازەری نارد کە لە بەشێک لەو پەیامەدا هاتبوو:

«دوژمنانــی ئازادی و ئینســانیەت لە کۆنەوە تــا ئەمڕۆ لە ڕێگای جۆراوجــۆرەوە هەوڵیان داوە ئەو پێوەندییە پیــرۆزەی نێوان گەلی کــورد و ئازەربایجــان تێک بدەن و ڕۆڵەکانی ئــەو دوو نەتەوەیە لە بەرامبەر یەکتردا ڕابگرن. بەڵام بەختەوەرانە وشیاریی تێکۆشەرانی ئەو دوو نەتەوە بەشخوراوە هەموو کاتێک نەقشەی دوژمنانی ئازادیی کردووەتە بڵقی سەر ئاو و پێوەندیی کوردەکان و ئازەربایجانییەکان ڕۆژ بە ڕۆژ پیرۆزتر و پێویستتر خۆی نواندووە.»

لە بەشێکی دیکەی پەیامەکەدا هاتووە:

«هیــوای ئێمــەی ئەوەیــە کــە بەرنامەی بەشــی ئازەریــی ڕادیۆ دەنگی کوردســتانی ئێــران، ببێتە ئەڵقەیەکی نــوێ و پتەو و قایم لە زەنجیرەی پێوەندیی کۆن و لەمێژینەی گەلانی کورد و ئازەربایجانی. ئاواتەخوازین کە هەڵســووڕێنەرانی ڕادیۆ دەنگی کوردستانی ئێران بتوانــن ســەرنج و ڕەزایەتــی ئێوە بــۆ لای بەرنامەکانی ڕابکێشــن. داواشمان لە تێکۆشەرانی گەلی ئازەربایجان ئەوەیە، پێوەندیی خۆیان

لەگەڵ رادیۆکەیان پتەو بکەن و لە باشتر بەڕێوەبردنی بەرنامەکانیدا یارمەتی بدەن.»

بەم چەشــنە پلینۆمی کۆمیتەی ناوەنـدی گرینگیی هاوکاریی دوو نەتـەوەی کـورد و ئازەربایجانی و هاوخەباتــی و هاوپەیمانیی ئەم دوو نەتەوەیە لە سەردەمی کۆماری کوردستان و حکوومەتی میللی ئازەربایجانـدا وە بیر دێنێتەوە و وێڕای شــرۆڤەکردنی هەلومەرجی ئێـران، داوا دەکا بـۆ بــە چۆکـدا هێنانی کۆنەپەرەســتی هــاوکار و هاوپەیمــان بن. رەســتەکانی کۆتایی ئـەم بەیاننامەیە بەم شــێوەیە کۆتایی پی دێت

«.. لە هەلومەرجێکی وادا دەســت لە ســەر دەست دانان و بێدەنگ دانیشــتن رەوا نیە. دەبێ تێبکۆشــین بە خەباتــی یەکگرتوو پێش بە دیکتاتۆری و سەرەڕۆیی بگرین.

پێویســتە شــانازییەکانی رابردوومان زینــدوو بکەینەوە و رێگای شــەهیدە قارەمانــەکان درێــژە بدەیــن. دەبــێ پێوەندیــی کــورد و ئازەربایجانی سەرلەنوێ پتەوتر لە هەمیشە دامەزرێنینەوە.

نابێ رێگا بدەین تاقمێکی نەزان و داخ لەدڵ وڵاتی ئێمە لەوە زیاتر بــەرەو نەمــان بــەرن. با هەمو پێکــەوە بۆ جێگیر کردنــی ئازادی و دیموکراســی و دابینکردنی مافی ئینســانی و سیاسی و کۆمەڵایەتیی خەڵکی ئێران تێبکۆشین».

## ■ ٣٥: سیاســەتی هەناردەکردنی شــۆڕش و هەڵگیرســانی شەڕی ئێران و عێراق (١٣٥٩)

سیاســەتی نەزانانەی رێژیمی خومەینی و هەراوهۆریای بۆ ناردنە دەرەوەی شۆڕش! لە ئاکامدا شەڕێکیماڵوێرانکەری بە سەر خەڵکی ئیراندا سەپاند. بە هۆی دەستدرێژیی دەوڵەتی عیراق بۆ سەر ئێران لــە ٣١ی خەرمانانی ١٣٥٩دا کە بەرهەمی راســتەوخۆی سیاســەتی

مەزنیخوازیــی رێژیمی خومەینی بوو، هــەزاران کیلوومیتر لە خاکی ئێــران، ئەویش لە ناوچەیەک کە بە شــارەگی ژیانی ئابووریی ئێران دەژمێردرێ، کەوتە ژێر دەسەلاتی ئەرتەشێکی بێگانەوە. چەندین شار و ســەدان و بگرە هەزاران دێ لە خووزســتان و جنوبی کوردستان خاپوور بوون کە لەگەڵ بێ جێگا و رێگایی و نەبوونی پێداویستی و سیاسەتی چەوتی کاربەدەستە کۆنەپەرەستەکانەوە گیانی خۆیانیان لە دەســت دا، یان بریندار و نوقســان بوون و سەدان میلیارد دۆلار زیانی ماڵی وە بەر ئابووریی شپرزە و بێ بەرنامەی وڵات کەوت.

کومیتەی ناوەندیی حیزب چەند رۆژ دوای هەڵگیرســانی شــەڕی ئێران و عێراق لە پەیامێکی رەسمیدا دەستدرێژیی دەوڵەتی عیراق بۆ سەر ئێرانی مەحکووم کرد و رایگەیاند کە ئەگەر دەوڵەتی مەرکەزی داخوازە بنەڕەتییەکانی خەڵکی کوردستان بە رەسمی بناسێ، حیزبی ئێمە ئامادەیە بە تەواوی هێزی خۆی بۆ رزگاربوونەوەی ئەو ناوچانە لە پەلاماری عێراق وە کار بخا. کومیتەی ناوەندی هەر لەو کاتەشدا ئاشکرای کرد کە پەلاماری عێراق بۆ سەر ئێران، بەرهەمی سیاسەتی چەوتی کاربەدەســتانی کۆماری ئیسلامییە کە هەمیشە باسی ناردنە دەرەوەی شۆڕشــیان کردووە و خەڵکی وڵاتانی دراوسێیان لە دژی دەوڵەتەکانیــان هــان داوە. دیارە نیازپاکیــی حیزبی دێموکرات وەک هەمیشــە بێ وەڵام مایەوە و تەنانەت ئەنجامی پێچەوانەشی هەبوو. چوونکە دوابەدوای ئەو پەیامە هێرشــی هێزە ســەرکوتکەرەکان بۆ سەر کوردستان توندوتیژتر بوو.

## ■ ٣٦: بۆردمانی زیندانی «دۆڵەتوو» (١٣٦٠)

کاتژمێــر ١٠/٥ی ســەرلە بەیانــی رۆژی شــەممە، رێکەوتی ٢٢ی بانەمەڕی ١٣٦٠، ٢ فڕۆکە و چوار هیلی کۆپتێری عێراقی هێرشــیان کــردە ســەر زیندانی «دۆڵەتــوو»ی حیزبی دێموکــرات و زیندان و

زیندانییەکانیـــان بە توندی بۆردمان کرد. لـــەو بومبارانەدا لە بومبی ناپاڵـــم کەڵـــک وەرگیـــرا و لە ئاکامـــدا ٤٢ کەس کـــوژران و نزیکەی ٥٠ کەس بریندار بوون. ٦ کەس لە پێشـــمەرگەکانی حیزب شـــەهید و ژمارەیەکیـــش بریندار بوون. لەو پێوەندییـــەدا کۆمیتەی ناوەندیی حیزب بەیاننامەیەکی دەرکرد کە ئەمە کورتکراوی بەیانییەکەیە:

«.. کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بەناوی خەڵکی زۆرلێکراوی کوردستانی خوێناوی و راپەڕیو، ئەم کردەوە جینایەتکارانە و دژی ئینســـانییەی رێژیمی عێراق بەتونـــدی مەحکووم دەکا. ئەم کردەوە، دژی تەواوی قانوونە نێونەتەوەییـــەکان و پێچەوانـــەی ســـادەترین مافـــی مرۆڤە و عامیلەکان، جەنایەتکارانێکن کە لە ریزی جەللادەکانی مێژوو، وەک نازییەکانی هیتلەردان.

ئێمە بە ناوی حیزبی دێموکرات و هەموو خەڵکی کوردستان، لە هەموو گەلانی خەباتگێڕ و زۆرلێکراوی جیهان، لە تەواوی رێکخراوە نێونەتەوەییەکانی دیفاع لە مافی مرۆڤ و لە هەموو حیزب و شەخســـیەتە ئازادیخوازەکان داوا دەکەین کە دەنگی بێزاریـــی خۆیان بە دژی ئـــەم جەنایەتـــە گەورەیەی رێژیمی عێراق بەرز بکەنەوە و بەرامبەر بە بیروڕای گشـــتیی جیهان، عامیلەکانی ئەم جینایەتە بە توندی مەحکووم بکەن.

ئێمـــە بە عامیلەکانـــی ئـــەم جینایەتە هۆشـــداری دەدەین و دڵنیایـــن کە ئەم کردەوە دڕندانەیـــەی جەللادانی گەل، بێوەڵام نامێنێتەوە و ئەو جەللادانە بە سزای کردەوەی جینایەتکارانەی خۆیان دەگەن.

کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، لەم پێوەندییەدا بە پێویســـتی دەزانێ کە ســـەبارەت بە فریوکاریی بێشـــەرمانەی بەڕێوەبەرانی جمهوریی ئیسلامی و بە تایبەتی

دەوڵەتــی کۆنەپەرەســت و دژی گەلیی رەجایــی کە دەیەوێ لــەو رووداوە دڵتەزێنــە بە دژی حیزبــی ئێمە و بزووتنەوەی دێموکراتیکی خەڵکی کوردستان کەڵک وەرگرێ، رق و بێزاریی خۆی و هەموو خەڵکی کوردستان دەردەبڕێ.

دەوڵەتی جمهوریی ئیســلامی لە هیــچ جینایەتێک بەرامبەر بە خەڵکی کوردستان و هەموو گەلانی ئێران خۆی ناپارێزێ، دەوڵەتــی جمهوریی ئیســلامی کە بە عامیلەکانی کوشــتاری دڵتەزێنــی «ســینەما رێکــس»ی ئابــادان، پلــە و مەقامــی گرینگــی ئەســپاردووە، .. لــە بەیاننامــەی رۆژی سێشــەممە ٢٢ی بانەمــەڕدا، حیزبــی پێشــڕەو و خۆشەویســتی گەلــی کــورد، حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران بە مەســئوولی کارەســاتی دڵتەزێنی زیندانی دۆڵەتوو لە قەڵەم دەدا. دەوڵەتی جمهوریی ئیســلامی کە جەللادەکانی خەڵکی بێ تاوانی قارنێ و قەلاتــان و ئێندرقاش و دێهاتەکانی دیکەی کوردســتانی لە باوەش گرتووە و دەستخۆشــانەیان دەداتێ، ئێســتا خۆی بە مرۆڤدۆســت دەناســێنێ و بەردی دڵسۆزی بۆ گەلی کورد لە سینگ دەدا.

ئەوپەڕی بێشەرمییە کە پشتیوانانی پیاوکوژ و گۆپاڵبەدەست و چەقۆکێشــەکان، کە لــە دەوڵەتی رەجاییدا کــۆ بوونەتەوە، دەیانــەوێ بەم جۆرە لە خوێنی زیندانییــەکان، بۆ قایمکردنی پایــەی لەرزۆکــی دەوڵەتــی خۆیــان، بەهــرەی تەبلیغاتــی وەرگرن.

لــە بۆردمانی زیندانــی دۆڵەتوودا، ژمارەیەک لە باشــترین پێشــمەرگەکانی حیزبــی ئێمــە شــەهید بوون. فریــوکاران و هەڵخەڵەتێنەرانی دەوڵەتی رەجایی، بێشــەرمییان بەو جێگایە گەیانــدووە کــە ئیدیعــا دەکــەن حیزبــی ئێمە لە کوشــتاری

زیندانییەکان و پێشمەرگەکاندا دەستی هەبووە.

نـا، ئاغایانی ئەندامی کابینەی دەوڵەتی کۆنەپەرسـت! ئەمە پێشـمەرگەکانی ئێمە نین کە زیندانییەکان و بەدیلگیراوەکانی شـەڕ دەکـوژن، ئەمە پاسـدارە بەکرێگیراوەکانـی ئێوەن کە خەڵکی بێتاوان و پێشمەرگە بریندارەکان دەگرن و لە مەیدانی شەڕدا گوللەبارانیان دەکەن.

حیزبـی ئێمـە و پێشـمەرگەکانی کوردسـتان بۆ ئینسـان، کەرامەت و شەرەف، بۆ مافی ئینسان ڕێز دادەنێن و لە ماوەی دوو ساڵ شەڕدا، ئەمەیان سەلماندووە. ئەمە ڕاستییەکە کە لە نیشتمانی خۆشەویستمان و دەرەوەی ئێراندا، هەموو کەسێک دەیزانێ.

حیزبـی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران نیـازی بەوە نیە کە لـە جەللادپەروەرێک وەک ئێوە، گەواهینامەی ئینساندۆسـتی وەرگرێ.

دەوڵەتی کۆنەپەرسـتی ئێوە، هەر ئێسـتا خەریکی سـازش لەگـەڵ دەوڵەتـی عێراقـە. ئێـوە کـە ئیدیعاتان دەکـرد هەتا ڕووخانـی ڕێژیمـی عێـراق، بە شـەڕ درێژە دەدەن، ڕاسـت وەک مەسـەلەی بارمتەکان، بۆ جارێکی دیکـە خۆتان ئامادە کردووە، تا بەرامبەر بە بێگانەکان سـەری تەسـلیم دانەوێنن. بەڵام ناوێرن ئەم ڕاستییە بە خەڵکی ئێران بڵێن!

بـەڵام خەڵکـی کوردسـتان، بـە ڕێبەرایەتیـی حیزبـی خۆشەویسـتیان، حیزبـی دێموکراتـی کوردسـتانی ئێـران، هەتا گەیشـتن بە دێموکراسـی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردسـتان، خەباتی خۆیان درێژە دەدەن. دڵنیاین کە خەڵکی کوردستان بە وەها پلەیەک لە یەکیەتیو خەبات گەیشتوون کە بەرامبەر بە ئێوە و بەرامبەر بە فشاری دەوڵەتی عێراق تەسلیم

نابن. دڵنیاین کە سازشی ئێوە لەگەڵ دەوڵەتی عێراق، خەباتی خەڵکی کوردســتان لە ڕێگای دێموکراســی و خودموختاریدا توندتر دەکا.

ئێمــە دەزانین کە یەکێــک لە هۆیە بنەڕەتییەکانی سازشــی ئێــوە لەگــەڵ دەوڵەتی عێــراق ئەوەیە کە پاش ئەم سازشــە کە بێشــک لەگەڵ دانی ئیمتیازێکی گرینــگ بە ڕێژیمی عێراق تێکەڵــە، دەتانــەوێ هەمــوو هێــزی جمهــوری ئیســلامی کۆ بکەنــەوە و هێرشــێکی چەکدارانــە و پــان و بەرین بۆ ســەر خەڵکی کوردستان دەست پێبکەن.

لــەم پێوەندییەدا کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی ئێمە، بە گەلانی ئێــران و هەمــوو هێــزە شۆڕشــگێڕەکان بەڵێنــی دەدا کە بە ئیمان بە حەقانیەتــی جووڵانەوە و داخوازە ڕەواکانی خەڵکی کوردســتان و پشــت ئەســتوور بە هێزی دوایی نەهاتووی کۆمەڵانــی میلیۆنیی گەلی کــورد، خەباتی بێوچانی خۆی هەر وا درێژە پێدەدا و دەوڵەتی ڕەجایی، نە بە سازشکردن لەگەڵ دەوڵەتــی عێــراق و نە بــە هاوکاریی ئــەو دەوڵەتــە، ناتوانێ بەربەرەکانێی بزووتنەوەی مەزنی خەڵکی کوردستان بکا.»

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران
کۆمیتەی ناوەندی
١٣٦٠/٢/٢٣

■ ڕاپۆرتی حیزبی سەوزەکانی ئاڵمان لە سەر زیندانی دۆڵەتوو لە ســەر بانگهێشتی دوکتور قاسملوو، ســکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، سەوزەکانی ئاڵمان بریتی لە «یوورگن ریتس و ئێدریش تیلنگر» لە ٢٨/ ٧/ ١٩٨٥ سەفەری کوردستان دەکەن و لە نزیکەوە چاویان بە کوردســتان دەکەوێ و ڕاپورتێک لە ســەر مەسەلە جۆراوجۆرەکانی کوردستانی ئێران بڵاو دەکەنەوە. یەک لەو

بەشانەی کە چاویان پێ کەوتووە و لە سەری نووسیوویانە، زیندانی دۆڵەتـووە، ئەو زیندانەی کە ڕێژیم تەبلیغاتێکی زۆری لە سـەر کرد و فیلمێکی چەواشەکارانەی لە سەری بڵاو کردەوە کە گوایە حیزبی دێموکرات لەگەڵ زیندانییەکاندا هەڵسوکەوتی باش نەبووە.

بۆچوونی ئەو شـاندە لـەو ڕووەوە گرینگە کـە درۆکانی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی لەو پێوەندییەدا زیاتر دەر دەکەون. لێرەدا سەرنجی خوێنەران بۆ دەقی ئەو ڕاپۆرتە ڕادەکێشین:

«ڕۆیشتن بۆ زیندان وەک زۆربەی مەقەڕەکانی حدکا تەنیا بە سـواری هیستر و پیادە دەبێ، زاهیری وەک زیندان ناچێ. چەند ماڵی بێ حەوشـە کە لە داوێنی کێوێکدا دروست کراوە و لە تەماشـای یەکەمـدا تەنانەت هیـچ نیگابانێکیش نابینرێ، پاشـان چەند پێشـمەرگەیەک دەبینین کە لە سـێبەری یەکێک لـە خانووەکانـدا دانیشـتوون، گرووپێک لـە زیندانییەکان لە حاڵی گەرانەوە لە کاری کشـتوکاڵن، ئەویـش بە بێ نیگابان، ئـەوان دەتوانن ئەگەر خۆیان بیانەوێ، لە نزیکی دیوەکانیاندا سـەوزی بچێنـن و زۆربەیان کەڵکی لـێ وەربگرن. خۆراکی زیندانییەکان هەر ئەو خۆراکەیە کە پێشـمەرگەکان دەیخۆن، خانووەکانیـان هـەر ئەو ماڵە گڵێنە سـادانەن کـە لە هەموو شوێنێکدا دەبینرێن. هیچکەس لەو ڕەفتارەی کە لەم زیندانەدا لەگەڵـی دەکرێ شـکایەتی نییە. ژمارەیەکیـان دەڵێن وەزعی خواردنێـک کە لێرە دەیخۆن باشـتر لەوەیە کە لە ئەرتەشـی ئێران بوو. زۆربەیان خۆشـحاڵن لەوەی کە شـەڕ بۆ ئەمانە کۆتایـی هاتووە، ژمارەیەکیان دەکەونە پێداهەڵگوتن و تاریفی حیزبـی دێموکـرات. بـەڵام ژمارەیەکی دیکەیـان بەبێ ترس بـە پڕوپاگەنـدەی خۆیان لـە دژی حدکا درێـژە دەدەن و بە ڕاشـکاوی ڕادەگەیەنن پاش ئازادبوونیان دەگەڕێنەوە بۆ نێو

ئەرتەش و سپای پاسداران.

لــە نێــو زیندانییەکانــدا دوو لاوی دوازدە ســاڵان کەوتنــە بەرچاومــان کــە بە وتــەی خۆیــان کاتێک دەســتگیر کراون ویســتوویانە لــە ســەر مەئمووریەتــی ڕێژیــم لــە یەکێک لە گوندەکاندا خۆراکی پێشــمەرگەکان مەســمووم بکەن. ئەوان ماوەیەکــی کورت لێــرە دەمێننــەوە و بنەماڵەکانیــان ئاگادار کراونەتەوە کە بێن مناڵەکانیان ببەنەوە.

## ▪ ٣٧: کارو کردەوەکانــی حیــزب لــە ناوچــە ئازادکراوەکانــی کوردستان

لە درێژەی شەڕی کوردستاندا کە ناوچەیەکی زۆر ئازاد کرا و لە ژێر دەسەڵاتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە ڕێبەرایەتیی حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێراندا بوو، حیزب بۆ ئیدارەی کار و باری خەڵــک کۆمەڵێــک دامەزراوی بۆ خزمەتکردن بــە خەڵک، پێک هێنان و کۆمیســیۆنێکی بۆ ئیــدارەی ئــەو کارە خزمەتگوزارییانە بە نێوی کۆمیسیۆنی کۆمەڵایەتی پێک هێنا کە ئەو کۆمیسیۆنە لە چەند بەشی قەزایــی، پەروەردە و فێرکردن، شــووراکان، شــەهیدان، زەویو زار، ڕێگاوبان و .. پێک هاتبوو.

حیــزب بۆ ئیــدارەی ئــەم کارانــە کارێکــی زۆر بەرچــاوی کرد، کەلالەی ســزادانی گشــتیی پەسەند کرد کە بەشــی قەزایی ناوەندی و بەشــەکانی دیکە لە چوارچێوەی ئــەو کەلالەیەدا قەزاوەتی ناوچە رزگارکراوەکانیان بەڕێوە دەبرد.

بۆ پەروەردە و فێرکردن، وێڕای بارهێنانی مامۆستا و دامەزراندنی مەدرەســەکان، کتێبی بۆ دەرس گوتنەوە بە منداڵانی قوتابخانەکانی شــۆڕش ئامــادە کــرد. لە بەشــێکی دیکەی دەرســەکاندا لــە کتێبی مەدرەسەکانی ئێران کەڵک وەردەگیرا.

گەلاڵەی دابەشــکردنی زەویوزاری پەسەند کرد کە لەو گەلاڵەیەدا بەشــێک لــە زەویی ئاغــاکان دەدرا بە رەعیەتەکان، بــەلام گەلاڵەکە بەشــێوەیەک ئامادە کرابوو کە ئاغای نەدەکردە رەعیەت و رەعیەت بــکا بە ئاغا، بەڵکــوو تەوازونێکی پێک دەهێنا کە جێگای پەســـەندی هــەردوو لا بــوو. هەرچەنــد ئاغاکان پێیــان غەدر بوو کە بســتێک زەوییان لێ ببڕدرێ.

بۆ زۆر جێگا، رێگاوبانی دروست کرد و ئەو رێگایانەش کە خراپ دەبــوون بەو کەرەســتە کەمەی لە دەســتی حیزبدا بــوو، تەعمیری دەکردنەوە.

بــۆ ئیــدارەی گوندەکان، شــوورای پێــک هێنــان و پێکهێنانی ئەم شــوورایانە بــە هەڵبژاردن و بڕیاردانیان ســەبارەت بــە کاروباری ناوچەیی خۆیان، جێگای رێز بوون.

بەداخــەوە ئــەو بەڵگانە لە دەســتدا نەماون، بــەلام ئەوەندەی بۆم مومکیــن بــووە و پەیدام کردووە بــە دوای ئــەم روونکردنەوەیەدا، دەکەوێتە بەرچاوی خوێنەر:

■ دابەشکردنی زەوی‌وزار (١٣٦٠)

گەلاڵــەی دابەشــکردنی زەوی‌وزار پــاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد لە کۆبوونــەوەی کۆمیتەی ناوەندی، رێکەوتی ١٠ تا ١٣ی پووشــپەڕی ١٣٦٠دا پەســـەند کرا کە بەو پێیە بەشــێکی زەوی لە دەست خاوەن زەویدا دەمایەوە و نیســبەت بە هەر ناوچەیەک دیاری دەکرا. پاشان کۆبوونەوە گەلاڵەی پێشــنیارکراوی زەوی‌وزاری خستە بەردەستی دەفتەری سیاسی تا بە راوێژکردن لەگەڵ جووتیاران و کۆمیتەکانی حیزبــی، دەفتەری سیاســی گەلاڵەکە بە یەکجاری پەســـەند بکات و پیادە بکرێ.

هــەر لــەم کۆبوونەوەیــەدا گەلاڵــەی ســـەرەتایی بــۆ پێکهێنانــی شــووراکانی شــار و گوندی خستە بەرچاو و بڕیاری دا سمینارێکی

تایبەتی بۆ باس لە سەر ئەو گەلاڵەیە لە لایەن دەفتەری سیاسییەوە پێک بێت.

■ ئاگاداریی حیزب لەمەڕ پاراستنی دارستانەکان (١٣٦٠)

دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، لە ڕێکەوتی ٢٦ی جۆزەردانــی ١٣٦٠دا ســەبارەت بە پاراســتنی دارســتانەکان ئاگادارییەکی دەرکرد کە بە شێوەی خوارەوەیە:

هاونیشتمانانی بەڕێز!

خەڵکی بەشەرەفی کوردستان!

جووڵانەوەی ڕەواو هەقخوازانەی گەلی ئێمە لە کوردستانی ئێــران، خــۆ لە دوو ســاڵ نیزێک دەکاتــەوە. خەڵکی قارەمان و کۆڵنــەدەری ئێمــە، ئەگەر لــەو پلە ئاســتەم و مێژووییەدا، هەســت بــە مەســئولیەت دەکا و بە هەر شــێوە و بە هەموو توانــاوە، لــە گیان و مــالأ و لە بوونی خــۆی پاڵەوانانە دیفاع دەکا، بەداخەوە لە ســەر هێندێــک گیروگرفتی کۆمەڵایەتی بە تایبەتی لە ناوچەکانی لێڕەوار، بەو چەشــنەی کە پێویســت و لازمە هەست بە مەسئوولیەت ناکا.

جەنگەڵ سروەت و سامانی هەموو دانیشتوانی کوردستانە، سەرەڕای ئامۆژگارییەکانی پەیتاپەیتای حیزبی دێموکرات لەو بارەوە، ئێستاش زۆر بە بێڕەوییە لە لایەن خەڵکی ناوچەکانی لێــڕەوارەوە، دەردێ و دەکرێ بە زەوی، یان بۆ ســووتاندنی گەڵی ئاژەڵاً و ڕەژی بێڕەحمانە دەبڕدرێ. ئەگەر جەنگەڵاًبڕین بــەو شــێوەیە درێژەی هەبــێ، زۆر پێ ناچێ کە لــە لێڕەوار، شــوێنەوار نامێنــێ و دانیشــتوانی وڵاتەکەمــان لەو ســامانە خودادادە بێسوود و بەهرە دەمێننەوە.

دەفتەری سیاســیی حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران، بــە پێویســتی دەزانــێ، جارێکی دیکــەش ســەرنجی هەموو

دانیشتوانی کوردستان، بە تایبەتی خەڵکی ناوچەکانی لێڕەوار، بۆ پارێزگاری لە جەنگەڵ رابکێشێ.

بۆ ئەو مەبەستە و بەو هۆیەوە رادەگەیەنین:

- دەرهێنانی جەنگەڵ بە هەر شێوەیەک و لە ژێر هەر ناو و عینوانێکدا قەدەغەیە.

- بڕینی داری جەنگەڵ بۆ خانوو و کەڵکی شەخسی قەدەغەیە. مەگەر بە ئیجازەی شووورای دێیەکان، ئەویش دەبێ بە گوێرەی ئەندازەو ئیحتیاج بێ، نەک زیاتر.

- بڕینی جەنگەڵ بۆ رەژی، هەروەها بە مەبەستی گەڵا بۆ ئاژەڵ، بە تەواوی و بە یەکجاری قەدەغەیە.

بۆیە پێویستە هەر لە ئێستاوە ئاژەڵدارەکان بۆ تفاق لە فکری گیادا بن.

- هەر چەشنە لادان و جووڵانەوەیەک بە پێچەوانەی ئەو بڕیارە دەبێتە هۆی سزادانی توندوتیژ و زیندان و بژاردنی زەرەر و زیانی کەوتووی هەیە.

■ گەڵاڵەی فێرکردن و بارهێنان لە سەرانسەری کوردستان

بە شوێن پەسەندکردنی گەڵاڵەی شۆڕشگێڕانەی فێرکردن و بارهێنانی کوردستان لە کۆبوونەوەی دوایی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێراندا، بە مەبەستی خەبات دژی نەزانی و بێسەوادیو پەرەپێدانی عیلمو زانست لە بەشە رزگارکراوەکانی کوردستاندا، کۆڕی ئیجرایی فێرکردن و بارهێنان وەک بەڵگەیەکی دیکە لە کردەوەکانی دڵسۆزانەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران یەک بە دوای یەک لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستاندا پێک هاتن.

بە دوای پێکهاتنی ئەو کۆڕانە، لاوانی خوێندەواری کوردستانیش بە هەست پێکردن بە پێداویستیی پیادەکردنی ئەو گەڵاڵەیە، هەر

وەک پەروانــە لە دەوری شــەم کــۆ بوونەوە هەتــا ئەوانیش بتوانن هەنگوێنی»ســەواد» لە دەمی رۆڵە بەشــخوراوەکانی شار و گوندی ئەم وڵاتە ســووتاوە بەلام شۆڕشــگێڕە بنێن و زامی بەژارگەستەی جێدەمــی بــە ناو لایەنگرانی «موســتەزعەفان» بــە بەرهەمی گیانی خۆیان دەرمان بکەن.

بەرەوپیرچوونــی پــڕ بە هەســتی ئــەو گەلاڵەیە لە لایــەن لاوانی خوێنــدەوار و شۆڕشــگێڕی کوردســتانەوە، نموونەیەکــی دیکــە لە بەرەوپیرچوونــی خەڵکی تێکۆشــەر و بەشــەرەفی کوردســتانە بۆ بانگەوازەکانــی حیزب و وێنەیەکە لەو لەماڵ و لە گیان بوردوییە کە لە پێناوی بە ئاکام گەیاندنی جووڵانەوەی نیشــتمانی ـ دێموکراتیکی گەلەکەمانــدا نیشــان دراوە. لاوانــی ئێمە بە بەشــداری لە دەورەی «بارهێنانــی مامۆســتایان» هەڵوێســتی قایمــی خۆیــان لــە بــاری ئامادەبــوون بــۆ خزمەت بە رۆڵە بەشــخوراوەکانی شــار و گوندە رزگارکراوەکانی کوردستان دەربڕی.

ئــەو ســەرکەوتنە بەرچــاوە، وەک خوێنێکــی تازە وا بــوو کە لە دەمارەکانی لەشــی جووڵانەوەی پێشــکەوتووی خەڵکی کوردستاندا وە گەڕ کەوتبێ.

بە شــوێن داخوازیــی حیزب لە لاوانی خوێندەوار و بەهەســت بۆ کاری پیرۆزی»مامۆستایەتی» هەتا ١٥ی مانگی خەرمانان ژمارەی ئەو کەســانەی کەلاســەکانی ١٥ رۆژەی بارهێنانی مامۆســتایانیان بە ســەرکەوتوویی بردۆتە ســەر و ئامادەی چوونە کەلاسی دەرس بوون بەم چەشنەیە:

بانە ١٦ کەس ـ بۆکان ٥٠ کەس ـ مەهاباد ٧٢ کەس ـ سەردەشــت ٩٠ کەس ـ پیرانشار ٦٤ کەس ـ شنۆ ٩٠ کەس ـ نەغەدە ٢٥ کەس.

■ پەسەند کردنی یاسای سزادانی گشتی لە لایەن حیزبی دیموکراتەوە (١٣٦٠)

یاسای سزادانی گشتی لە ڕەشەمەی ١٣٦٠ لە لایەن حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانەوە پەسەند کراوە. سەرەتا باسێک لە ساختاری کۆمیسیۆنی قەزایی دەکات کە لە پێنج کەس ماف پەروەر پێک دێ و لقەکانی لە شارەکاندا لە ژێر چاوەدێریی ئەم کۆمیسیۆنەدا بە ڕێوە دەچن.

ئەو بەشە لە یاسای سزادانی گشتی کە لە ڕەشەمەی ١٣٦٠ پەسەند کراوە ٨٩ بەند لە خۆ دەگرێ. لە ڕەشەمەی ١٣٦١یشدا ٢٩ بەندی پێ زیاد کراوە، واتە لە سەر یەک دەبێتە ١١٨ بەند. ئەمە وێڕای ئەوەیە کە چەندین تێبینی لە خۆ دەگرێ.

■ ٣٨: پاساوێکی نارەوا بۆ شەڕێکی زیانهێنەر (١٣٦٠)

یەکێک لەو شەڕانەی کە شوێندانەریی زۆری لەسەر لە دەستدانی بەشێکی زۆری ناوچە ئازادکراوەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەبوو، شەڕی نێوان قیادە موەقەت و حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بوو. ئەم شەڕە بەو هۆیەوە هەڵایسا کە گۆیا ئەندامێکی ڕێبەریی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران بە ناوی سەید ڕەسوولی دیهقان دەستی لە دەرهێنانی تەرمی ڕێبەری ناوداری کورد، مەلا مستەفا بارزانیدا هەبووە. ئەم تاوان وەپاڵدانە لە کاتێکدا بوو کە مەلا مستەفا بارزانی لە نێو کوردەکانی ئێراندا بە هۆی بەشداری لە پاراستنی کۆماری کوردستاندا خاوەن پێگەیەکی پتەو بوو. بێجگە لەمەش لە کاتی هێنانەوەی تەرمی بارزانیدا بۆ شاری شنۆ، شوورای ئەو شارە کە نزیک بە تەواویان ئەندامی حیزبی دیمۆکرات بوون، سێ ڕۆژ ماتەمینیی گشتییان بەو بۆنەیەوە ڕاگەیاند و بەشدارییەکی چالاکانەیان لە ناشتنی تەرمی بارزانیدا کرد. بە وتەی ئەو کەسانەی کە سەید ڕەسوول باش

دەناســن، ناوبراو ڕێزێکی تایبەتی بۆ مەلا مســتەفا هەبووە. کاتێک ئەم هەواڵــە بە ڕێبەریی حیــزب دەگات ئەو کردەوەیە بە کردەوەیەکی دژی مرۆڤانە ناو دەبات و مەحکووم و شەرمەزاری دەکات. هەر لەو کاتەدا کومیتەی ناوەندی بڕیار دەدات لەوکارەســاتە بکۆڵنەوە و تێ بکۆشــێ تاوانبارەکان بدۆزرێنەوە و بە توندی سزا بدرێن. لەو بارەوە ڕێنوێنیی پێویســت بە کومیتەی شارســتانی شــنۆ دەدرێ. حیزب داوا لە پارتی دەکات بــۆ لێکۆڵینەوە لــەو ڕووداوە وەفدی هاوبــەش پێک بێنن کە لە لایەن پارتییەوە وەلامی ئەرێنی وەرناگرێتەوە.

ئەم ڕووداوە دەبێتە هۆی ســازبوونی شــەڕێک کە لە هاوینی ســاڵی ١٣٦٠ی هەتاویــدا لــە نێوان قیــادە موەقەت و حیزبــی دێموکراتدا ڕوو دەدات کــە زیانەکــەی بۆ هەر دوو لایەنی شــەڕ و لە قازانجی کۆماری ئیسلامیدا بوو. بەم هۆیەوە بەشێکی بەرچاو لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردســتانی ڕۆژهــەڵات کە بە دەســتی هێــزی پێشــمەرگەوە دەبێت، دەکەوێتە دەســتی کۆماری ئیسلامی. ئەم شەڕە چەند ساڵێک بەردەوام بوو تا لە کاتی ڕزگاربوونی کوردســتانی باشــووردا دوای ڕاپەڕین لە ســاڵی ١٩٩١ بەڕێز مەســعوود بارزانی ســەردانی دەفتەری سیاســیی حیزبــی دێمۆکــرات لە «بۆڵــێ»ی بناری قەندیــل دەکات بە بێ ئەوەی باسێک لەو شەڕە بکریت و بەم چەشنە پەیوەندییەکە ئاسایی دەبێتەوە و بە خۆشییەوە ئیستا پەیوەندییەکانمان بەرەو باشتربوون چووە.

پــاش هەمووی ئــەو ڕووداوانە دەرکــەوت کە کردەوەی نەشــیاوی دەرهێنانی تەرمی بارزانی لە لایەن حکوومەتی بەعس و بە هۆی «کاکل ئاغا» ئۆســتانداری ئەوکاتی سلێمانییەوە ئەنجام دراوە و ئەم ڕاستییە لە ڕۆژنامەکانی دەورانی بەعسدا پشتڕاست کرایەوە.

بۆ مێژووش بووە باسی ڕووداوێک بکەم کە بۆ خۆم لەو ڕووداوەدا بەشدار بووم. ئە ویش ئەوەیە کە لەو ساڵانەدا کە زەمینەی ئەو شەڕە خۆش دەکرا هێزێکی قیادە موەقەت بە بەرپرسیاریێتیی «ناله هەورامی»

لــە «کێمنە» و «بێدرواز»ی ناوچەی هەورامان نیشــتەجێ کرابوون و لــەو ماوەیەدا بوو کە ئەم هێزە کەوتە بەر پەلاماری هێزی هاوبەشــی سپای رزگاری و جاشەکانی حکوومەتی بەعس و لە گەمارۆی تەواوی ئــەو دوو هێــزەدا بــوون کــە ئێمــە کادر و پێشــمەرگەکانی کومیتەی هەورامــان بە هانایانەوە چووین و لــەو گەمارۆیە دەربازمان کردن و لەو دوو گوندە کە لە پشــتی بیارە هەڵکەوتوون تا ناوچەی سەلاســی باوەجانی ئیســکۆرتمان کردن و بەم چەشــنە دەرباز بوون و گەیشتنە هەڤاڵەکانیان لەو ناوچەیەدا.

## ■ ٣٩: کۆنگرەی پێنجەم و دوو بڕیاری گرینگ (١٣٦٠)

کۆنگرەی پێنجەم لە ڕێکەوتی ١٥ تا ١٨ی سەرماوەزی ساڵی ١٣٦٠ لە گوندی «شێوەجۆ» لە ناوچەی «گەورکایەتیی سەردەشت» پێک هات. گرینگترین بڕیاری ئەم کۆنگرەیە پەســەندکردنی دروشمی ڕووخاندنی ڕێژیــم بوو کــە دیارە لە پەســەندکردنی ئەم درووشــمەدا دوو هۆکار دەوری ســەرەکییان هەبــوو: هــۆکاری یەکــەم نائۆمێــد بوونی حیزب بەهۆی وەڵام نەدانەوەی داخوازییەکانی گەلی کورد لە لایەن ڕێژیمەوە و ڕۆیشتنی دەسەڵاتی حاکم لە وڵاتدا بەرەو پاوانخوازیی زیاتر بوو.

هۆکاری دووهەم دەرکردنی موجاهیدینی خەڵکی ئێران و ڕاگەیاندنی خەباتیان بە دژی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی تا ڕووخاندنی بوو کە لەو کاتەدا موجاهیدین ڕێکخراوێکی بەنفووز لە سەرتاسەری ئێراندا بوو و خاوەن هێزێکی خەباتگێڕ و بەربڵاو لە سەرانسەری ئێراندا بوو.

بڕیاری چوون بۆ نێو شوورای بەرگریی نیشتمانیش لەم کۆنگرەیەدا پەسەند کرا کە لە سەر داوای مەسعوود ڕەجەوی لە دوکتور قاسملوو بوو کە لە نامەکەیدا داوای کردبوو حیزبی دێمۆکرات پەیوەســت بێ بە شوورای نیشتمانیی بەرگرییەوە.

## ■ ٤٠: ٥٩ عەمەلیات بۆ تۆڵەی ئیعدامی٥٩ لاوی مەهاباد (١٣٦٢)

هەروەک لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەی پێ کرا، کۆماری ئیسلامی بۆ تۆقاندن و تەسلیم بوونی خەڵک بەو ڕێژیمە دیکتاتۆر و کۆنەپەرەستە دەستی لە هیچ جینایەتێک لە کوردستان نەپاراست و هەر ماوەیەک کۆمەڵێک لە بنەماڵە و دایک و بابەکانی بە ئیعدامی خۆشەویستەکانیان ئازیەتبار دەکرد و یەک لەو جینایەتانە کە لە زەینی خەڵکی کوردستاندا بە زیندوویی دەمێنێتەوە، ئیعدامی بە کۆمەڵی ٥٩ لاوی مەهاباد لە ڕۆژی ١٢ی جۆزەردانی ١٣٦٢ی هەتاوی بوو کە ئەو لاوانە لە باری فیکرییەوە لە تەیفی جۆراوجۆر بوون، لە کەسی بێ لایەن تا ئەندام و لایەنگرانی حیزبەکانی کوردستانی ڕۆژهەلاتی تێدا بوون. بەبێ گومان زۆربەی هەرە زۆریان یان ئەندام یان لایەنگری حیزبی دێموکرات بوون و تەنیا تاوانیان بیروباوەڕیان و کورد بوونیان بوو. ئەوان هیچ کردەوەیەکیان ئەنجام نەدابوو کە تەنانەت لە چوارچێوەی یاسای کۆنەپەرەستانەی ڕێژیمیش سزای زندانیشیان بە سەردا بسەپێ.

ئەنجامی ئەم جینایەتە سامناکە دڵی خەڵکی کوردستان و کادر و پێشمەرگەکانی حیزبی بریندار کرد و لە تۆڵەی ئەو شەهیدانەدا چالاکیی جۆراوجۆر بەڕێوە چوون کە لووتکەی ئەو چالاکییانە ئەو بەڵێنییە ئازایانە بوو کە پێشمەرگەکانی هێزی بێستوون، ڕۆڵە بەوەجەکانی گەلەکەمان دایان تاکوو بە تۆڵەی ئەو جینایەتە سامناکە، ٥٩ عەمەلیات لە دژی هێزەکانی ڕێژیم لەو ساڵەدا بەڕێوە بەرن. لە سەرەتاکاندا زۆر دژوار دەهاتە بەرچاو کە ئەو هێزە بتوانێ ئەو ٥٩ عەمەلیاتە بەڕێوە ببات، بەڵام زۆری نەخایاند کە پێشمەرگەکانی هێزی بێستوون، شاپوورەکان، سالارەکان، محەممەد کەریمەکان، مینبەرییەکان و.. سەلماندیان زۆر لەوە زیاتریان لە توانادایە و هێزەکانی ڕێژیمیان زەلیل و داماو کرد و سەلماندیان هێزەکانی ڕێژیم چەندە بێ ورە و داماون و بێجگە لەو عەمەلیاتانە کە بەڕێوەیان برد و ئامارەکەی لە چەند دێڕی

دواتردا دەکەوێتە بەرچاو، لەو ساڵەدا چەند عەمەلیاتی زیاتریان بەڕێوە برد کە یەکێک لەو چالاکییانە عەمەلیاتێک بوو بۆ تۆڵەی شــەهیدکرانی شــەهید «ســەروان ئیقباڵ کەریم نژاد» کە لەو چالاکییەدا ١٣ کەس لە هێزەکانی ڕێژیم کوژران.

| | |
|---|---|
| ئاماری کوژراوانی هێزەکانی ڕێژیم: | ٧٤٠ کەس |
| بریندارى دوژمن: | ٥٧٠ کەس |
| بەدیلگیراوی ڕێژیم: | ١٣٢ کەس |
| ماشینی سووتاو: | ٦٨ دەستگا |
| دەسکەوتی چەکی قورس و نیوە قورس: | ١١ دەستگا |
| تفەنگی جوراوجۆر: | ٤٩٩ قەبزە |
| فیشەکی جۆراوجۆر: | ٦٣٣٤٠ فیشەک |

پێویســت بە گوتنە لە ســەرجەمی ئەو عەمەلیاتانەدا ١٧ پێشــمەرگە شەهید و ٢٢ پێشمەرگەش بریندار بوون.



*ئــەم ئامارە لە لایەن بەڕێز «عەلی ئەشــرەف مەجیدیان» ئامادە کــراوە کە ئەو کات یەکێک لە ٣ فەرماندە لکی هێزی بێســتوون بوو کە بۆ خۆی لە بەشێک لە عەمەلیاتەکاندا بەشدار بووە.

## ■ ٤١: ڕاگەیەنــدراوی دەفتــەری سیاســی حیزبــی دێموکراتــی کوردستانی ئێران

لــە ســەر کردەوەکانی کۆماری ئیســلامی دژ بــە حیزبی توودەی ئێران (١٣٦٢)

هاونیشتمانانی بەڕێز!

خەڵکی خەباتگێڕی کوردستان!

گەلانی بەشەرەفی ئێران!

هــەروەک ئاگادارن ڕێژیمی کۆنەپەرســتی خومەینــی لە ماوەیەک لەمەو پێشــەوە هێرشــێکی بەربلاوی دژی کادری ڕێبەری و ئەندام و لایەنگرانــی حیزبی توودەی ئێران لە سەرانســەری وڵات دەســت پێکردووە. بە دوای ئەو پەلامارە کە چەند مانگە درێژەی هەیە، زۆر لە ئەندامان و زۆربەی کادری ڕێبەری ئەو حیزبە گیراون و زیندانی کــراون. لــە حەوتووی ڕابــردوودا چەند کــەس لە ڕێبــەران لەوانە سکرتێری یەکەمی ئەو حیزبە، زەعفێکی بێوێنەیان لە خۆیان نیشان دا. ئەوان لە وتووێژی تەلەفزیۆنیدا ئیعترافاتی زۆر سەرسووڕهێنەریان کــرد و ئــەو تاوانەیان تەئید کرد کە لە لایــەن ڕێژیمی خومەینییەوە حیزبی توودەی پێ تاوانبار کرابوو.

لە ڕۆژی ١٤ی ڕەشەمەی ١٣٦٢دا، دادســتانی کۆماری ئیســلامی، حیزبــی توودەی ئێرانی بە هەڵوەشــاوە ڕاگەیاند و داوای لە هەموو ئەندامانی ئەو حیزبە کرد کە خۆیان بە ســوپای پاســداران بناسێنن و هەڕەشــەی کرد کــە ئەگەر خۆیان نەناســێنن، بە ناوی»محارب« دەناسرێن و تەسلیمی دادگاکانی شۆڕش دەکرێن.

هاوکات لەگەڵ ئەو ئیقداماتە، وەزارەتی دەرەوەی کۆماری ئیسلامی داوای لــە ١٨ نەفــەر لە ئەندامانی ســەفارەتی یەکیەتیی ســۆڤیێتی لە تاران کرد کە خاکی ئێران بەجێ بێڵن.

ئەگەرچــی لە چەنــد مانگ لەمەو بــەرەوە چاوەڕوانی هێرشــێکی

ئەوتۆ بۆ سەر حیزبی توودەی ئێران دەکرا و ڕێبەریی حیزبی ئێمە زۆر جار رایگەیاندبوو کە ویلایەتی فەقیهی خومەینی نەک تەنیا هەر جۆرە دژایەتییەکی سیاسی بە توندی سەرکوت دەکا، بەڵکوو بیروڕای جیاوازی ئەو گرووپە نۆکەرسیفەتانەش کە لە ڕێژیم و تەنانەت جینایەتەکانی ئەو پشتیوانی دەکەن بەڵام لە هێندێک مەسەلەدا لەگەڵ کاربەدەستانی ڕێژیم بیروڕایان جیاوازە، تەحەممول ناکەن. لەگەڵ ئەوەش بە غەیرەقانوونی ناسینی حیزبی توودەی ئێران و تەعقیب و گرتنی ئەندامانی ئەو ئاخر لاپەڕەی ڕێڕەوی ڕێژیمی کۆماری ئیسلامییە بەرەو ئیستیبدادی بێئەملاوئەولای چەرخەکانی نێوەڕاست.

.. خومەینی بۆ خۆی هاتە مەیدان و لە پەیامی خۆیدا ڕێبەرانی حیزبی توودەی بە جینایەتکارانێک ناو هێنا کە «.. وەک ماری پڕخەتو خاڵ لە لەنێوبردنی ئیسلامدا بە شێوەیەکی مونافیقانە تێکۆشاون.» ئێستا ئیدی بە تەواوی روونە کە تاقیبی ئەندامانی حیزبی توودە و هەڵوەشاندنەوەی ئەو حیزبە، هەروەک هەنگاوەکانی سەرکوتکەرانەی دیکەی ڕێژیم کە لە سەرەتای شۆڕشەوە تا ئێستا هەڵگیراون، کاری «حجتیە» یان بەشێک لە دەسەڵاتی حاکم نیە، بەڵکوو کاری شەخسی خومەینییە و بە دەستووری ئەو ئەنجام دراون.

گومان لەوەدا نیە کە کارنامەی تێکۆشانی ڕێبەرانی حیزبی توودەی ئێران لە ساڵەکانی پاش شۆڕشدا رەشە و سیاسەتێک کە لەو ماوەیەدا پەیڕەوییان لێ دەکرد، لە لایەن خەڵکی ئێرانەوە مەحکوومە. پشتیوانیی بێئەملاوئەولا لە تەواوی کردەوەکانی کۆنەپەرستانە و دژی گەلیی ڕێژیمی خومەینی، دەنگدان بە نیزامی چەرخەکانی نیوەڕاستی ویلایەتی فەقیهی، پەسند کردنی جینایەتەکانی ڕێژیم دژی تەواوی خەباتگێڕانی ڕێگای ئازادی، هەوڵدان بۆ دروستکردنی دووبەرەکی لە

نێوان هێزە شۆڕشـگێڕەکاندا، هەوڵدان بۆ لێک بڵاوکردنی ڕێکخراوە دیموکراتیکەکان و لادانی بیروڕای لاوانی وڵات، بەشێک لە کارنامەی ڕەشی تێکۆشـانی ڕێبەرانی حیزبی توودەی ئێرانە. هاندانی ڕێژیمی خوێنمـژی خومەینـی بۆ درێژەپێدانی شـەڕ لە کوردسـتاندا هەوڵی سـەرنەکەوتوو بۆ پێکهێنانی دوودەستەیی»انشعاب« لە نێو حیزبی دێموکراتی کوردستاندا، وەپاڵدانی تۆمەتی ناڕەوا بە ڕێبەرانی حیزبی ئێمە، جاسووسـی کردنی ئەندامان و هەوادارانی حیزبی توودە دژی تێکۆشەرانی حیزب و پێشـمەرگە قارەمانەکان لە نێو شارەکانیشدا، بەشـێک لـە کارنامەی ڕەشـی ڕێبەرانی حیزبی توودە بە حیسـاب دێ.

لـە هەمووی سـەیرتر ئەوە بوو کە تەواوی ئـەو کردەوانە لە ژێر سەرپۆشـی خەبـات دژی ئیمپریالیزمـی ئەمریکادا دەکـرا. ڕێژیمی خومەینـی بە نـاوی ڕێژیمێکـی دژە ئیمپریالیسـتی بـە کۆمەڵانی خەڵـک دەناسـێنرا، هـەر ئەو ڕێژیمـەی کە شـێلگیرانە هێـزە دژە ئیمپریالیستییەکانی بە تەواوی هێزەوە سەرکوت دەکرد، بەسترانەوەی ئابووریـی وڵاتی ئێمەی بە وڵاتەکانی ئیمپریالیسـتییەوە پەرە پێدەدا و بـەم جۆرە ڕێگا بۆ هاتنە سـەر کاری ڕێژیمێکی بەتەواوی سـەر بـە ئیمپریالیزمـی خۆش دەکرد. هـەر ئەو ڕێژیمەیە کە هەر ئێسـتا دیسـانیش ڕەنگـە بە ناوی خەباتـی دژی ئیمپریالیزمـی ئەمریکا بە تاوانی جاسووسـی دانەپاڵ دیپلۆماتەکانی شوورەوی و وەدەرنانی ئەوان لـە ئێران دەبێتە ئاڵاهەڵگری خەبات دژی کۆمۆنیزمی جیهانی لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا.

ڕێبەرانـی حیزبـی توودە بەو هەمـوو تاقیکردنـەوە و ڕابردووی سیاسـییەوە ئەو ڕاستییە سادەیان دەرک نەکرد کە هەر حیزبێک کە بە نرخی ڕۆژ نان دەخوا، ئوسوول فیدای تاکتیک دەکا، ئۆپۆرتۆنیسم و هەلپەرەستی دەکاتە بناغەی سیاسەتی خۆی و ماکیاولیزم تا ڕادەی

سیاسەتی رەسمیی خۆی بەرز دەکاتەوە، داهاتوویەکی بێجگە لە تێکشکان و لە دەست دانی نفووز و ئیمتیازی خۆی لە نێو کۆمەلانی خەلکدا نابێ. رێبەرانی حیزبی توودە بۆ خۆیان هەر لەو داوە کەوتوون کە بۆ خەلکی دیکەیان دانابوو و ئێستا بەرامبەر بە مێژوو، گەلانی ئێران و ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی خۆیان مەحکووم و سەرشۆڕن. ئیعترافاتی هێندێک لە رێبەران و ئەو زەعفەی کە لە خۆیان نیشانیان دا، ئەوانی لە بەر چاوی کۆمەلانی خەلکی ئێران بە تەواوی بێئابڕوو کرد و ئیمان و باوەڕی ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی بە تەواوی لەوان سەلب کرد.

گوتنی ئەو راستییە زەروورەتی هەیە کە رێبەرانی حیزبی توودە نەک تەنیا نیسبەت بە خەلکی ئێران، بەلکوو نیسبەت بە ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی خۆشیان خەیانەتیان کرد و لەم بارەوە مەسئوولییەتێکی گەورەیان بەرامبەر بەوان لەسەر شانە، چوونکە ئەندامانی حیزبیان بەرەو لاڕێ کێشا و پاشان بە دەستی بەستراو تەسلیمی رێژیمی خومەینیان کردن.

بە بێشک کردەوەکانی رێژیمی خومەینی دژی حیزبی توودەی ئێران شوێنەوارێکی بەربلاوی لە نێوخۆ و دەرەوەدا دەبێ. ئەوەی هەر ئێستا ئاشکرایە ئەوەیە کە ئەم ئیقداماتە لە چوارچێوەی ولاتدا نوختەی کۆتایی رەوەندی دواکەوتووانەی رێژیمێکە کە نەک تەنیا بچووکترین موخالەفەت، بگرە هیچ چەشنە بیرکردنەوەیەکی جیاوازیش قبوول ناکا. ئیستا ئیستیبدادی بێ ئەملاوئەولای چەرخەکانی نێوەڕاست بە تەواوی کاملاً بووە و گەشەکردنی نیزامی ویلایەتی فەقیهی لە نوختەی لووتکەی خۆی نیزیک بووەتەوە.

لە سەتحی دەرەوەدا، ئالوگۆڕی قوولتر چاوەڕوان دەکرێ، قەیرانی ئابووری و درێژەپێدانی شەڕ، رێژیمی خستوەتە تەنگانەوە و لە هەر بارێکەوە نیازی بە یارمەتیی مالی و نیزامی دەرەوە هەیە. ئاخوندە

دەسەڵاتدارەکان بەرامبەر بە هەڵوێستی خۆیان دژی یەکیەتی سۆڤیێتی، چاوەڕوانی خەلات لە ئیمپریالیزمی ئەمریکان.

لە راستیدا ئیمپریالیزمی ئەمریکا کە بۆ خۆی لە دنەدانی رێژیمی خومەینیدا بۆ ئیقداماتی دژی شووروەوی بێتەئسیر نەبووە، زۆر لەمێژە چاوەڕوانی هەلێکی ئەوتۆ دەکا و بە بێشک باشترین کەڵکی لێ وەردەگرێ. بەم جۆرە بەسترانەوەی کۆماری ئیسلامی بە ئیمپریالیزمی ئەمریکاوە زیاد دەکا و بیهەوێ و نەیهەوێ رێژیمی خومەینی بۆ زیندووکردنەوەی دووبارەی ئیمپریالیزم لە ولاتی ئێمەدا و لە کۆتاییدا هێنانە سەرکاری رێژیمێک کار دەکا کە دروستکراوی واشینگتۆن بێ.

بۆ حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، کردەوەکانی ئەم دواییەی رێژیمی خومەینی دژی حیزبی توودەی ئێران و یەکیەتیی سۆڤیێتی سەرسووڕهێنەر نیە. حیزبی توودە پاش چەند ساڵ پەیڕەوی لە سیاسەتی هەلپەرستانە نەیدەتوانی داهاتوویەکی هەبێ، بێجگە لەوەی بە چاوی خۆمان دیتمان. بە پێچەوانە، ئیقداماتی رێژیم لە دژی حیزبی توودە، هەروەک حیزبی ئێمە زۆر جار پێشبینیی کردبوو، لە چوارچێوەی سیاسەتی چەرخەکانی نێوەڕاستی ویلایەتی فەقیهیدا بە تەواوی دەگونجێ.

## ■ ٤٢: سەبارەت بە شوورای نیشتمانیی بەرگری

لە ٣٠ی جۆزەردانی ١٣٦٠ بەنی سەدر و رەجەوی لە تاران بە فڕۆکەیەک هەڵاتن و لە پاریس نیشتنەوە و پاش ماوەیەک رێککەوتنێکیان بڵاو کردەوە کە لەو چوارچێوەیەدا هەوڵ بۆ رووخانی رێژیمی خومەینی بدەن و داوایان لە حیزبی دێموکرات کرد کە بۆ رووخانی رێژیم بچێتە نێو بەرەیەکەوە کە پێکی دێنن. حیزبی دێموکراتیش لەگەڵ ئەوەی کە تێبینیی زۆری لە سەر بەرنامەی

ڕاگەیەندراو و تەنانەت پێکهێنەرانی ئەو بەرەیە هەبوو کە یەک لەوان بەنی سەدر بوو کە لە سەردەمی سەرکۆماریدا بڕیاری هێرش بۆ سەر کوردستان و سەرکوتی خەڵکی کوردی دابوو، بەو حاڵەش لە ساڵی ١٣٦٠دا حیزب چووە نێو شوورای نیشتمانیی بەرگری (شورای ملی مقاومت). لە ماوەی ئەندامەتیی حیزب لەو شوورایەدا بە هەوڵ و ماندووبونێکی زۆر و مشتومڕێکی زۆر لەگەڵ ئەندامانی دیکەی شوورا بە تایبەتی موجاهیدینی خەڵک، چەند سەنەدێکی زۆر گرینگ بە تەسویب گەیشتن کە گرینگترینیان لە روانگەی مافەکانی خەڵکی کوردستانەوە، گەلاڵەی خودموختاریی کوردستان بوو. لە دێڕەکانی داهاتوودا بە وردی دەپەرژێینە سەر نێوەڕۆکی ئەو سەنەدانە و بە تایبەتی گەلاڵەی خودموختاریی کوردستان.

پەسەندکردنی سێ سەنەدی گرینگ لە لایەن شوورای نیشتمانیی بەرگرییەوە

«شووڕای نیشتمانیی بەرگری» لە مانگەکانی ڕێبەندان و ڕەشەمەی ساڵی ١٣٦٠ی هەتاویدا یەکەمین دەورەی کۆبوونەوەکانی خۆی بە بەشداریی شەخسیەتەکان و نوێنەرانی ڕێکخراوەکانی ئەندامی شووڕا و بە سەرۆکایەتیی مەسعوود ڕەجەوی، بەرپرسی شووڕای نیشتمانیی بەرگری پێک هێنا.

ئەندامانی شووڕا پاش باس و وتووێژی پێویست سێ سەنەدی گرینگیان پەسەند و ئیمزا کرد.

- سەنەدی ژمارە (١) مادده ئیلحاقی و ئیسلامییەکانی فەسڵی یەکەمی بەرنامەی دەوڵەتی کاتیی کۆماری دێموکراتیکی ئیسلامیی ئێران لە بارەی ئەرکەکانی سەردەمی گوازتنەوە.
- سەنەدی ژمارە(٢) پێڕەوی نێوخۆیی شووڕای نیشتمانیی بەرگری بۆ سەربەخۆیی و ئازادیی کۆماری دێموکراتیکی ئیسلامیی ئێران.
- سەنەدی ژمارە(٣) ئەرکە فەورییەکانی دەوڵەتی کاتی.

لێرەدادەقی سەنەدی ژمارە ٣ بۆ ئاگاداریی هاونیشتمانە خۆشەویستەکان بڵاو دەکەینەوە.

سەنەدی ژمارە ٣: ئەرکە فەورییەکانی دەوڵەتی کاتی

شووڕای نیشتمانیی بەرگری لە سەر بناغەی بەرنامەی شووڕای نیشتمانیی بەرگری و دەوڵەتی کاتیی کۆماری دێموکراتیکی ئیسلامیی ئێران ئەم ئەرکانەی خوارەوە بە ئەرکی فەوریی دەوڵەتی کاتی دەناسێ.. :

١. پشتیوانی لە بنەماڵەی شەهیدان و ئازادیی تەواوی زیندانییانی سیاسی، سڕینەوەی هەموو شوێنەوارەکانی پاشکۆی زوڵم و زۆری ڕێژیمی سەرەڕۆی خومەینی دژی ئەوان و دابینکردنی خزمەت و پێداویستییە فەورییەکانیان.

٢. کۆتایی هێنانی دەستبەجێ بە شەڕی ئێران و عێراق و بەرقەرارکردنی ئاشتییەکی عادلانە لە سەر بناخەی تەواوەتیی خاک و وەدیهێنانی مافەکانی خەڵکی ئێران، هەنگاونان بۆ چارەسەری گیروگرفتەکانی ئاوارەکانی شەڕ.

٣. کۆتایی هێنان بە شەڕی دژی گەلی لە دژی خەڵکی کوردستان، بە ڕاگەیاندنی خودموختاری لە چوارچێوەی تەواوەتیی خاکی ئێراندا. تێکۆشان بۆ سڕینەوەی شوێنەوارەکانی ئەم شەڕە.

٤. چەککردن و هەڵوەشاندنەوەی هەموو نەهادە کۆنەپەرستەکان و دەزگاکانی سەرکوتکردن، جاسووسی، پشکنینی بیروباوەڕ و سانسۆری ڕێژیمی خومەینی وەک بەناو دادگا و دادسەراکانی شۆڕشی ئیسلامی، دادگاکانی شەرع، دایرەکانی سیاسی ـ ئیدئۆلۆژیک، کۆمیتەکان، پاسداران، ئەنجوومەنە بە ناو ئیسلامییەکان، بەسیجی دژی خەڵکی، شووڕای شۆڕشی فەرهەنگی، جیهادی زانستگەیی، کاروباری پەروەردەیی و نیهادە سەرکوتکەرەکانی دژی جووتیاری و دژی کرێکاری.

٥. راگەیشتن بە تاوانەکانی بەرپرسانی ڕێژیمی خومەینی و دەستووردەران و بەجێهێنەرانی ئەشکەنجە و کوشتار و دەستدرێژی بۆ سەر مافەکانی خەڵک لە دادگاکانی ئاشکرادا بە ئامادەیی هەیئەتی مونسیفە و قبووڵکردنی چاوەدێرانی نێونەتەوەیی. دابینکردنی ئەسڵی ئازادیی دیفاع و مافی تێکۆشانی کانوونەکانی وەکیلان. بەرپرسانی تاوانەکانی ڕێژیمی شا وە بەر ئەم پێراگەیشتنە دەکەون.

٦. پێکهێنانی هەلومەرجی پێویست بۆ هەڵوەشاندنی هەرچی خێراتری سیستمی کۆپۆنی بە لە بەرچاو گرتنی پێداویستییەکانی چینە بێبەشەکان.

٧. هەق ئەستاندنەوەی تەواوی ئەو کەسانەی کە لە ڕێژیمی خومەینیدا بە ناحەق دەرکراون، پاکسازی کراون و نارەحەتییان بۆ پێک هێنراوە، بە تایبەتی کارمەندان، دەبیران، مامۆستایان، کرێکاران و هەروەها خانەنشینکراوەکان. داوای کار کردن لە هەموو عونسورە پاکەکان و پسپۆرە نیشتمانپەروەرەکان لە ژوورەوە و دەرەوەی وڵات.

٨. هەڵوەشاندنەوە و لەنێوبردنی هەموو زوڵم و زۆر و ناچارکردن و جیاوازیدانانێکی ڕێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی لە بارەی ژنانی وڵاتەوە، وەک هەڵوەشاندنەوەی بێ بەشی لە مافی هەڵبژاردنی کار و جلوبەرگ لە سەر بناخەی وەک یەک بوونی تەواوی مافە کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی و ئابوورییەکانی ژن و پیاو.

٩. کردنەوەی فەوریی هەموو ناوەندە زانستی و فێرکارییەکانی وڵات. دابینکردنی سەربەخۆیی زانستگەکان و فێرگە بەرزەکان و بەڕیوەبردنیان لە ژێر چاوەدێری شووراکانی زانستگەییدا.

١٠. بەرەسمی ناسینی مافەکانی فەردی و کۆمەڵایەتیی خەڵک کە لە راگەیەندراوی جیهانیی مافی مرۆڤدا هاتوون و هەروەها هەموو ئازادییە گشتییەکان وەک ئازادیی کۆبوونەوەکان، عەقیدە

دەربڕین، چاپەمەنی، حیزبەکان، سەندیکاکان، شووراکان، ئایینەکان و مەزهەبەکان و ئازادیی هەڵبژاردنی کار و پێشگیری لە هەر چەشنە دەستدرێژییەک بۆ سەر مافەکانی فەردی و کۆمەڵایەتی و ئازادییە گشتییەکان. کردنی رادیۆ و تەلەڤیزیۆن بە جێگایەک بۆ بڵاوکردنەوەی بێسانسۆری دەنگوباس و ئاگاداری و باسی ئازاد بەرەو رێککەوتنی سالمی بیر و باوەڕ و عەقیدەکان و بە گشتی کردنی دێموکراسی و ئازادیی بەیان و برەوپێدانی فەرهەنگ و هونەر.

■ گەڵالەی شووراى نیشتمانیی بەرگری بۆ خودموختاریی کوردستان

لە بەر ئەوەی خەڵکی ئێران بە شۆڕشی خۆیان «ئازادی و سەربەخۆیی»یان وەکوو دوو ئەسڵی گشتی و لێکدانەبڕاو هێناوەتە گۆڕێ، شووراى نیشتمانیی بەرگری رووخاندنی رێژیمی خومەینی و دامەزراندنی سیستمێکی سیاسیی لە سەر بناغەی ئیرادە و حاکمیەتی خەڵک لە بەر خۆی رۆناوە.

لەبەر ئەوەی پێویستیی دامەزراندنی حکوومەتێک لە سەر بناغەی ئیرادە و حاکمییەتی خەڵک لە ئێران، دابین کردن و دەستەبەر کردنی هەرچی زیاتری ئامراز، ئیمکانات و رێگای دەخاڵەت و بەشداریی تەواوی خەڵک لە بڕیاردان و بەڕێوەبردنی ئەم بڕیارانەدایە، لە بەر ئەوەی دەخاڵەت و بەشداریی خەڵک لە بڕیاردان و بەڕێوەبردنی بڕیارە سیاسی، ئابووری، فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەکاندا مەرجی پێویست بۆ وەدیهاتنی دێموکراسی لە وڵاتێکدایە.

شووراى نیشتمانیی بەرگری بە مەبەستی دابینکردن و بەهێزکردنی هەرچی زیاتری حاکمییەتی خەڵک و تەواویەتی ئەرزی و یەکپارچەیی و یەکیەتیی نیشتمانیی وڵات و بە لە بەرچاوگرتنی خەباتی عادڵانەی خەڵکی کوردستان بۆ دابینکردنی دێموکراسی لە ئێران و خودموختاری لە کوردستاندا و بە مەبەستی لابردنی

ستەمی دوژمنانە لە سەر نەتەوەی زۆرلێکراوی کورد، ئەم گەلالەیەی ئێستا بۆ دابینکردنی خودموختاریی کوردستان رادەگەیەنێ. ئەم گەلاڵەیە لە چوارچێوەی بەرنامەی شووڕای نیشتمانیی بەرگری و حکوومەتی کاتیی کۆماری دێموکراتیکی ئیسلامیی ئێران و ئەرکە فەورییەکانی حکوومەتی کاتیدا شایانی جێبەجێ بوونە و راست بە گوێرەی ماددەی ٣ی ئەرکە فەورییەکانی حکوومەتی کاتی « کۆتاییهێنان بە شەڕی دژی گەلی دژ بە خەڵکی کوردستان» لەگەڵ راگەیاندنی خودموختاری لە چوارچێوەی تەواویەتی ئەرزی رێک خراوە و پەسەند کراوە و رێنوێنی کردەوەی داهاتووی حکوومەتی کاتی لەمەڕ خودموختاریی کوردستان دەبێ، چۆنایەتی و شێوەی بەڕێوەچوونی ئەم گەلاڵەیە لە لایەن حکوومەتی کاتیی کۆماری دێموکراتیکی ئیسلامیی ئێرانەوە دیاری دەکرێ. ئەرکی سەرشانی حکوومەتی کاتییە کە بۆ جێبەجێکردنی ئەم گەلالەیە هەوڵی پێویست بدات.

١. ناوچەی خودموختار، هەموو کوردستانی ئێران دەگرێتەوە، سنوور و سەراوردی جوغرافیایی ئەو ناوچەیە لە رێگای پرسیار لە بیروڕای گشتیی خەڵکی ناوچەی کوردنشینی ولاتەوە دیاری دەکرێ.

٢. ئۆرگانی یاسادانان لە کاروباری نیوخۆیی ناوچەی خودموختاردا، ئەنجومەنی بالای کوردستانە کە نوێنەرەکانی لە رێگای هەڵبژاردنی ئازادەوە بە دەنگی گشتی، راستەوخۆ، وەک یەک و نهێنی هەڵدەبژێردرێن.

٣. بەڕێوەبردنی گشت کاروباری ناوچەی خودموختاری کوردستان جگە لەم کاروبارانەی کە لە خوارەوە وەک دەسەلاتی حکوومەتی ناوەندی ناسراون، لە سەلاحیەتی ئۆرگانی خودموختاریدایە.

دیاریکردنی بەرزترین ئۆرگان بۆ بەڕێوەبردنی ئەم کاروبارانە و

چاوەدێری بەسەر کار و تێکۆشانیاندا لە ئەستۆی ئەنجومەنی باڵای کوردستانە.

٤. پاراستنی هێمنی نێوخۆیی ناوچەی خودموختار لە ئەستۆی ئۆرگانی خودموختارییە کە هێزی گونجاو بۆ ئەم کارە بە لە بەرچاوگرتنی مادەی دووهەمی ئەم گەڵاڵەیە ڕێک دەخات.

٥. کاروباری پێوەندیدار بە سیاسەتی دەرەوە و پێوەندیی دەرەوە، ئەمنیەتی سەرانسەریی کۆمار و بەرگریی نیشتمانی وەک ( پاریزگاریی سنوورەکان، پاراستنی تەواویەتی ئەرزی و یەکیەتیی کۆمار) لە دەسەڵاتی حکوومەتی ناوەندیدایە. ئەرتەش لە ناوچەی خودموختاری کوردستانیشدا وەک شوێنەکانی دیکەی ئێران مافی دەستێوەردان لە کاروباری ئاسایشی نێوخۆییدا نیە.

٦. کارووباری پێوەندیدار بە بازرگانیی نیوخۆیی و گومرکات، دیاریکردنی سیستمی دراو و دارایی وڵات، جێبەجێکردنی ئەرکەکانی سەر بە بانکی ناوەندی، دانانی بوودجەی گشتی و بەرنامە ئابوورییەکان کە گرینگیی سەرانسەرییان هەیە، یان پیویستیان بە سەرمایە وەکارخستنی قورس هەیە لە سەلاحیەتی حکوومەتی ناوەندیدان. بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دیکەی ئابووریی ناوچەی خودموختار لە سەلاحیەتی ئۆرگانەکانی خودموختاریدایە.

کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوە سروشتیەکان و سامانە گشتیەکانی وڵات کە گرینگیی سەرانسەرییان هەیە، لە سەلاحیەتی حکوومەتی ناوەندیدایە کە بە قازانجی گشتیی خەڵکی ئیران کەڵکیان لێ وەردەگیرێ. لە ناوچەی خودموختاری کوردستاندا ئۆرگانەکانی خودموختاری بۆ کەڵک وەرگرتن لەم کانگا و سامانانە یارمەتیی حکوومەتی ناوەندی دەدەن.

٧. زمانی کوردی، زمانی خوێندن و نامەنووسینی نێوخۆیی لە ناوچەی خودمختاردایە و لە گشت پلەکانی خوێندندا، مافی فێربوونی

زمانی کوردی بۆ دانیشتوانی ناوچە بە رەسمییەت دەناسرێ. زمانی فارسی، لە ناوچەی خودموختاریشدا وەکوو شوێنەکانی دیکەی ئێران زمانی رەسمییە و لە قوتابخانەکاندا لەگەڵ زمانی کوردی دەخوێنرێت. نامەنووسینی ئیدارەکانی ناوچەی خودموختاری کوردستان بۆ ناوەند و شوێنەکانی دیکەی ئێران و هەروەها بۆ ئیدارەکانی سەر بە حکوومەتی ناوەندی لە ناوچەی خودموختاردا بە زمانی فارسی دەبێ. گشت دانیشتوانی غەیرە کورد لە کوردستانی خودموختاردا بۆ پەرەپێدانی فەرهەنگی خۆیان ئازادن و مافی خوێندنیان بە زمانی خۆیان هەیە.

٨. گشت ئەو ماف و ئازادییانەی لە بەیاننامەی جیهانیی مافی مرۆڤ و پەیماننامە نێونەتەوەییەکانی سەر بەم بەیاننامەیەدا هاتوون، وەکوو ئازادیی بیروڕا و دەربڕین، ئازادیی چاپەمەنی. ئازادیی پێکهێنان و تێکۆشانی حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکان، یەکێتییەکان و شوورا کرێکاری و جووتیاری و سینفییەکان، ئەنجومەنە دێموکراتیکەکان، ئازادیی هەڵبژاردن و کار و پیشە و جێگای ژیان و ئازادیی مەزهەب لە کوردستانی خودموختاردا وەکوو هەموو ناوچەکانی دیکەی ئێران دەستەبەر دەکرێن. گشت دانیشتوانی کوردستان بە ژن و پیاوەوە وەکوو دانیشتوانی ناوچەکانی دیکە بەبێ هیچ جۆرە جیاوازی دانانێکی جنسی، ئێتنیکی، رەگەزی و مەزهەبی لە مافی کۆمەلایەتی، ئابووری، سیاسی و فەرهەنگی وەک یەک کەڵک وەردەگرن.

٩. سیستەمی دادوەریی کۆمار یەکە و لە ناوچەی خودموختاردا، دادگاکان بە گوێرەی یاساکانی کۆمار و هەروەها ئەو یاسایانەی کە لە لایەن ئەنجومەنی باڵای کوردستانەوە پەسەند کراون بە سکاڵای «خەڵک» رادەگەن.

هێزە ئەمنییەکانی کوردستانی خودموختار، وەکو هێزە ئەمنییەکانی ناوچەی دیکەی وڵات لە بەر دەستی دادگوستەریدان و دەبێ حوکم

و فەرمان و بڕیارەکانی دادگاکان و کاربەدەستانی قەزایی جێبەجی بکەن.

١٠. ئەرکی سەرشانی ئۆرگانەکانی خودموختارییە کە لە دەستێوەردان لە کاروبارێکدا کە خراوەتە بەر دەسەڵاتی تایبەتی حکوومەتی ناوەندی، خۆ بپارێزن و یارمەتیی حکوومەتی ناوەندی بدەن بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی خۆی لە ناوچەدا. هەر بەم شێوەیە حکوومەتی ناوەندی و ئۆرگانە بەڕێوەبەرییەکانی ئەو نابێ دەست لە کاروبارێک وەردەن کە خراوەتە بەر دەسەڵاتی تایبەتی ئۆرگانەکانی خودموختاری و دەبێ یارمەتیی ئۆرگانەکانی خودموختاری بدەن بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانی.

١١. حکوومەتی ناوەندی لە بەجێ هێنانی ئەرکی خۆیدا لەمەڕ دابینکردنی خێرای پێشکەوتن و پەرەسەندنی گشت ناوچە دواکەوتووەکانی وڵات لە سەر شانیەتی کە لە داهاتی گشتیی وڵات بەشێکی زۆرتر بۆ نەهێشتنی دواکەوتوویی ناوچەی خودموختاری کوردستانیش تەرخان بکا.

١٢. خەڵکی ناوچەی خودموختاری کوردستان وەکوو هاونیشتمانانی دیکەیان لە سەرانسەری ئێراندا لە ڕێگای یاساییەوە بەبێ هیچ جۆرە فەرق و جیاوازییەک لەبەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتدا بەشدار دەبن.

ئەم گەڵالەیە لە سەرەتایەک و ١٢ مادەدا لە ڕێکەوتی ١٧ی خەزەڵوەری ١٣٦٢ی هەتاوی بە تێکڕای دەنگ لە شوورای نیشتمانیی بەرگریدا پەسەند کرا.

بەرپرسی شوورای نیشتمانیی بەرگری

مەسعوود رەجەوی

کێشە و ململانێ لە نێو شوورای نیشتمانیی بەرگریدا

کێشمەکێش لە نێو شوورای نیشتمانیی بەرگریدا و پێداگریی حزب لە سەر مافەکانی گەلی کورد و پرەنسیپە دێموکراتیکەکانی خۆی

لەگەڵ ئەندامانی دیکەی شـووورا بە تایبەتـی «موجاهیدینی خەڵک» لە ماوەی ئەندامەتیی حیزب لەو شوورایەدا بەردەوام بوو. دەتوانین بڵێین کە حیزب لە ڕۆژی چوونییەوە بۆ نێو شوورا تا ڕۆژی هاتنەدەر یان دەرکرانی، سـەبارەت بە چۆنیەتیی بەڕێوەبردنی شـوورا لەگەڵ بەڕێوەبەرانی لە کێشـەدا بوو کە بەشێک لەو باسانە لێرەدا دەخەینە بەر چاوی خوێنەران:

ساڵی ١٣٦٢، جموجۆڵێک بۆ زیندووکردنەوەی فیرقەی دێموکراتی ئازەربایجان، بەلام لە سەر بنچینەیەکی تازە و بە چەشنی سەربەخۆ لە حیزبی توودە، وە بەرچاو کەوت. حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێـران بە تێگەیشـتنی لە نەقشـی بەرچـاوی گەلـی ئازەربایجان لە بزووتنەوەی سەرانسـەریی گەلانی ئێرانـدا و هەروەها بە ئاگاداری لەو واقعیەتە کە بوونی ڕێکخراوێکی سـەربەخۆی ئازەربایجانی کە لە نێو خەڵکی ئازەربایجاندا هەڵقولابێ، یارمەتی بە بزواندنی هەستی نەتەوایەتی بکا و کارساز بێ، هەربۆیە لە پێشوازیی ئەم هەوڵەدا لە ڕۆژنامەی «کوردسـتان»ی ژمارە ٩٢دا وێڕای کورتەیەک لە سـەر گرینگیـی هاوخەباتیی گەلی کورد و ئازەربایجـان وەبیرهێنانەوەی هاوپەیمانی و دۆسـتایەتیی لەمێژینـەی دوو گەلی کورد و ئازەری، بەشـێکی کورت لە بەرنامەی فیرقـەی دێموکراتی ئازەربایجانی لەو ژمارەیە لە ڕۆژنامەی کوردستان بڵاو کردەوە.

بڵاوکردنەوەی بەرنامە و پێڕەوی فیرقەی دێموکرات لە ڕۆژنامەی «کوردستان»دا بووە هۆی دژکردەوەی زۆر لە ڕێکخراوە ئێرانییەکان و دروسـتبوونی ڕێکخراوێکی لەم چەشـنەیان بە مەترسی بۆ سەر یەکپارچەیی و تەواوەتیی خاکی ئێران دانا کە یەکێک لەو ڕێکخراوانە سـازمانی موجاهیدینی خەڵکی ئێـران بوو کە زۆر قەڵس بوو و لەو پـەڕی قەڵسـیدا وێڕای هێرش بۆ سـەر ڕۆژنامەی کوردسـتان، لە ڕۆژنامـەی «موجاهیـد» وتارێکی بڵاو کردەوە کە وێڕای هێرش بۆ

سەر ڕۆژنامەی «کوردستان» نووسرابوو لە بەر ئەوەی کە «مووسا خیابانـی»و چەنـد ڕێبەرێکـی دیکـەی موجاهیدیـن ئازەربایجانین، کەوابوو پێویسـت ناکا لە ئازەربایجان ڕێکخراوی دیکە و بەتایبەتی ڕێکخراوی نەتەوەیی پێک بێت. ئەمە نیشانەی نەبوونی بڕوا بە مافی نەتەوایەتی لە ئێراندا بوو و ئەگەریش موجاهیدین گەلاڵەی شوورای نیشـتمانیی بەرگری بۆ خودموختاریی کوردستانی پەسەند کردبوو، دەرکەوت لە ڕووی بڕواوە نەبووە.

پلینۆمـی کومیتـەی ناوەندیـی حیـزب لـە کۆبوونـەوەی مانگـی گەلاوێـژی سـاڵی ١٣٦٣ی خۆیـدا، نامەیەکی بە پەسـەند گەیاند کە رووی لـە بەرپرسـان و ئەندامەکانـی «شـوورای ملـی مقاومت» بوو و لە مانگی ڕەزبەری هەر ئەو سـاڵەدا بۆ شـوورای نارد. لەم نامەیەدا گەلاڵەیەکی بۆ دێموکراتیزەکردنی شـوورا و دانی شوناسی سـەربەخۆی جیا لە موجاهیدین و دیاریکردنی ئیستراتیژیی شوورا و بوونی «ماهنامە»یەک و رادیۆیەک کە بە ناوی شووراوە کار بکا، بۆ شوورا نارد.

ڕەجەوی بەرپرسی یەکەمی موجاهیدین هەر لە یەکەم کۆبوونەوەدا بەبێ ئەوەی کە باسێک سەبارەت بە پێشنیارەکانی حیزبەکەمان بێتە ئاراوە، ڕاشـکاوانە گوتی کـە: «قبوولکردنی ئەو جۆرە پێشـنیارانە دەبێتە هۆی هەڵوەشـانەوەی شوورا، موجاهیدین بە هیچ شێوەیەک ئامادەیی وەرگرتنی وەها پێشنیارگەلێکی نیە».

ئامانج لە وەها پێشنیارگەلێک دانی شوناسی سەربەخۆ بە شوورا جیـا لـە شوناسـی موجاهیدیـن بـوو، دێموکراتیزەکردنی شـوورا بـە تایبەت دیاریکردنی شـێوەی خەبات لە شـوورادا بە مەبەسـتی ڕووخاندنی ڕێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی بوو.

لە دانیشـتن و کۆبوونەوەی دواتردا بینرا کە بەرپرسـانی شوورا پێشـنیارەکانی حیزبیان لـە دەسـتووری کاری کۆبوونەوەکە لابرد

و بـە جێگەی ئەو، مـزاری چاوپێکەوتنی نوێنـەری حیزبیان دەگەڵ نوێنەرەکانـی ڕێژیمـی خومەینـی خسـتە نێـو دەسـتووری کاری کۆبوونەوەکـە. بـە مەبەسـتی کۆتاییهێنان بە بیانوو داتاشـینەکانی ڕێکخراوی موجاهیدین لە ڕێکەوتی ٣٠ی مانگی ... ساڵی ١٣٦٣ لە لایەن سـکرتاریای کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتەوە ڕاگەیەندراوێک دەرکـرا کـە تێیـدا هاتبوو: «لـە هەلومەرجی ئێسـتادا هـەر جۆرە وتووێژێکی سیاسـی دەگەڵ ڕێژیمی خومەینی کارێکی بێسەمەرە». هـەر چەند بە ڕواڵەت موجاهیدین پێشـوازیی لـە ڕاگەیەندراوەکەی دەفتەری سیاسـیی حیزب کرد، چونکە ئامانجی ئەوان لە ئەساسـدا ڕوونکردنەوەی مەسـەلەی وتوویژ نەبوو، بەڵکوو دەیانەویست ئەو مەسـەلەیە بە مەبەسـتی بێکەڵک کردنی پێشـنیارەکانی حیزب وەک دەسـتەچیلە دابنێـن. ئەوان بە پێچەوانەی ڕاسـتییەکان بانگەشـەی ئەوەیـان دەکـرد کە حیزبی دێموکـرات بە ئیمـزای نوێنەرەکانی لە هەمبـەر شـووورادا «متعهد»ە کـە لە مافی وتوویـژ لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی چاوپۆشـیی کردووە. بەڵام لە هیچ یـەک لە بەڵگەنامەکانی شوورای نیشتمانیی بەرگریدا کە نوێنەرانی حیزب ئیمزایان کردبێت، بچووکترین بابەتێک لە مەڕ نەبوونی حەق و سەلاحییەتی وتوویژ بۆ حیزب، وە بەرچاو ناکەوێ.

بـەڵام حیـزب بـە هیـچ شـێوەیەک ئامادە نیـە کە چاوپۆشـی لە سـەربەخۆیی و سـەلاحییەتی بڕیاردان سـەبارەت بە چارەنووسی جووڵانەوەی کورد بکات و بە دەستی کەسانێکی دیکەی بسپێرێ.

دیسـان موجاهیدین لە ڕێکەوتی ٢٠ی خاکەلێوەی سـاڵی ١٣٦٤دا بڕیارنامەیەکـی بـە بـێ بەشـداریی نوێنـەری حیزبـی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران و چەند ئەندامێکی دیکەی شـوورا، بەسـەر باقی ئەندامانی شـوورادا سـەپاند و ئەوەیان وەک بڕیارنامەی شوورای نیشـتمانیی بەرگـری» بڵاوکـردەوە. حیزبـی دێموکـرات کونتاکتی

غەیرە ئوسـوولی و نادێموکراتیکی بەرپرسی شوورا و موجاهیدینی خسـتە بەر رەخنـە و بەناو بڕیارنامەی باقی ئەندامانی شووراشـی رەد کردەوە و خوازیاری پێکهێنانی ئەسڵی شـوورا بە بەشـداریی نوێنەری حیزبی دێموکرات بوو، بەڵام بەرپرسـی شـوورا حازر بە وەهـا دانوسـتان و کۆبوونەوەیەک نەبوو. بەرپرسـانی رێکخراوی موجاهیدیـن نیشـانیان دا کـە نـەک تەنیا بۆنیـان لە دێموکراسـی نەکـردووە، بەڵکـوو بچووکترین رێـزو حورمەتیش بـۆ ئایینامە و ئەساسـنامەکانی کە بۆ خۆیان ئیمزایان کـردووە دانانێن. هەر بۆیە رۆژی ١٠ی بانەمـەڕی ١٣٦٤ی هەتاوی دەفتەری سیاسـیی حیزبی دێموکـرات راگەیەندراوێکـی دەر کرد و بە رەسـمی لـە ئەندامەتیی شوورای نیشتمانیی بەرگری هاتەدەرێ.

موجاهیدیـن پێشـنیاری دووبـارە پێداچوونـەوە بـە بەرنامـە و ئەساسـنامەی شـوورای بـە جیـددی رەد کـردەوە و بـە هیـچ جۆرێـک گوێیـان بە گەلاڵـە و پێشـنیارەکانی ئێمە (حیـزب) لەمەڕ دێموکراتیزەکردنی پێوەندییەکانی ناوخۆی شوورا نە دەدا. هەر بۆیە حیـزب بۆی دەرکەوت کە موجاهیدین دژی بەرین بوونەوەو پەلوپۆ هاویشتنی شوورایە و تەنیا لە کاتێکدا «موافقەت» دەکەن کە ئەندامە نوێیەکانی شوورا لە سیاسەتەکانی موجاهیدین پەیڕەوی بکەن.

لە کاتێکدا کە هێنانەگۆڕ و ناسـاندنی مافـە نەتەوەییەکانی گەلانی ژێرسـتەم و زوڵملێکـراوی ئێران بـە تایبەتـی «خودموختاری» لە لایەن شـووراوە دەهاتە بەرباس، ئەوان زۆر جاران لەنێو شـوورادا شـێلگیرانە رایانگەیانـد کـە: «ئەگەر رۆژێک شـوورای نیشـتمانیی بەرگـری لەگـەڵ مافی خودموختاریی گەلی کـورد و گەلانی دیکەی زوڵملێکراوی ئێران وەک: ئازەربایجان، بەلووچسـتان و.. رازی بێ، موجاهیدین شوورا بەجێ دێڵن».

بـۆ مـاوەی چوار سـاڵان حیزب لەگەڵ شـوورا هەوڵـی دا کە لە

ســەپاندنی ئیدئۆلۆژییەکــی دیاریکراو لــە لایــەن موجاهیدینەوە بە ســەر شوورادا پێشگیری بکا. کاتێک کە لە لایەن زۆربەی ئەندامانی شووراوە پێشنیار کرا کە بە مەبەستی پەرەپێدانی شوناسی سەربەخۆ، شــوورا دەبێ ئۆرگانی چاپەمەنی بڵاو بکاتەوە، موجاهیدین دیســان ئەو پێشنیارەشیان بە دواوە خست.

نوێنەری موجاهیدین لە پاییزی ســاڵی ١٣٦٢دا پێشــنیاری کرد کە شــوورای نیشتمانیی بەرگری بە ناوی خۆیەوە ئیمتیازی ئیزگەیەکی رادیۆیی لە یەکێک لە وڵاتەکانی جیران وە دەســت بێنێ، بەڵام ئەبێ تەواووەخــت لە ئیختیــار و پاوانی رێکخــراوی موجاهیدیندا بیت. لە شــووڕادا لە نوێنەری موجاهیدین پرسیار کرا، ئەگەر رادیۆیەکی وا رۆژێ دوو کاتژمێر بەرنامەی بڵاو کردەوە و نیوەی ئەو کاتە بدرێ بە موجاهیدین، ئایا ئێوە قبووڵی دەکەن؟ وەڵامەکەی «نا» بوو! دیسان هەر لەو بارەوە پرســیار کرا، ئەگەر وای دابنێین کە رادیۆی شــوورا لە شەو و رۆژدا ١٢ کاتژمێر کاتی بۆ بڵاوکردنەوە لە ئیختیاردا بێ، ١١ کاتژمێر بۆ موجاهیدین و کاتژمێرێک بە شوورا بدرێ، ئایا ئەوان پێشــنیارێکی ئەوتۆ قبووڵ دەکەن؟ نوێنــەری موجاهیدین لە وەڵامدا دەڵێ: «نەخێر».

تەواوی کاتەکەیان دەوێ یانی هەر دوازدە کاتژمێرەکەمان دەوێ. حیزبــی دێموکــرات ســەرەڕای هەڵســوکەوتە نادێموکراتیکەکانــی موجاهیدیــن ســەرەتا رایگەیاند کە نایهەوێ لە شــوورا بێتە دەرێ. هەوڵــی دا کــە شــوورا دژی بڕیــاری موجاهیدین راوەســتێ، بەڵام موجاهیدیــن بڕیاری خۆی دابوو و نەیدەویســت هاوپەیمانی دەگەڵ حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بکەن.

بەشێک لە نامەی کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

■ بۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی بەرگری (١٣٦٣)

کومیتـەی ناوەندی لە کۆبوونەوەی خۆیـدا لە ڕۆژەکانی ١٥ هەتا ٢٤ی مانگـی گەلاوێژی سـاڵی ١٣٦٣ دوای لێکدانـەوەی بارودۆخی سیاسیی وڵات و پێداچوونەوەیەکی ورد و دەقیق بە سەر چالاکییەکانی شـوورا لە رابردوودا، بە سەرنجدان بە ڕۆڵ و نەخشێک کە شوورا لـە هەلومەرجی هەسـتیاری وڵاتەکەماندا دەبێ وە ئەسـتۆی بگرێ، بڕیاری دا کە نەزەر و بۆچوونەکانی خۆی لە دووتوێی نامەیەکدا بە بەرپرس و ئەندامانی شوورا بگەیەنێ.

نامـەی کومیتـەی ناوەندیی حیزب بـۆ بەرپرسـی موجاهیدین و ئەندامانـی شـوورا هەڵگری ئەو بۆچوون و پێشـنیارانەی خوارەوە بوو:

١. چاو بە بەرنامە و ئەساسنامەی شوورادا بخشێنرێتەوە و مۆری «بەنی سـەدر»و شـێوە و ڕێچکـەی بیری بەنی سـەدری تێدا پاک بکرێتەوە.

٢. پێوەندییەکانـی ناوخۆی شـوورا زیاتر لە جـاران دێموکراتیزە بکرێ و تەواوی ئوسـوول و قاعیدە و چوارچێوە نادێموکراتیکەکان لە نێو بچن.

٣. لەگەڵ تەواوی ئەو ڕێکخراو و کەسایەتییانەی کە بوونی ئاغای بەنـی سـەدریان وەک کۆسـپێکی هاوکاریی خۆیان لەگەڵ شـوورا دەزانی، جودا لەوەی کە لە بانگەشـەی خۆیاندا راسـتو دروست بن یان نا، پێوەندی بگیرێ و بۆ راکێشانیان دەرگای وتوویژ و دانوستان ئاوەڵا بێ (جودا لە سەڵتەنەتخوازەکان و لایەنگرانی ڕێژیم).

٤. دانپێدانان و ناسـاندنی مافـە نەتەوایەتییەکانی گەلانی ئێران (چ لـە شـکڵی خودموختاری چ لە شـێوەی فیدراڵیدا) جـودا لەوەی کە

ئـەم گەلانــە خەباتی بۆ دەکەن یان نا، کە ئەوە ئیعتیباری شــوورای میللیی مقاومەت دەباتە سەرەوە. ئەو هەنگاوە لە لایەک دەبێتە هۆی پتەوبوونــی بنەمای یەکپارچەیی وڵات و پاراســتنی خاکی ئێران. لە لایەکی دیکەشەوە وەدیهێنانی ئامانجی گرینگی دێموکراتیکی شوورا پێشــگیری لە کۆبوونەوەی دەسەڵات لە دەستی دەوڵەتی ناوەندیداو سپاردنی بە خەڵکە و یارمەتیدەرێک دەبێ بۆ بەشە دواکەوتووەکانی وڵات.

٥. ســەبارەت بە جێگە و پێگە و نەخشــی شــوورا تاکوو ئێستاش لەنێوان ئەندامەکانی شــوورادا ناکۆکیی بیروبۆچوون هەیە. هەندێک رۆڵــی شــوورا بە پارلەمــان دەزانن و هێندێکی دیکەش بە شــێوەی بــەرەی دادەنێــن. هەنووکە کاتی ئــەوە هاتووە کە پێگە و نەخشــو هەڵوێستی شوورا دیاری بکرێ.

٦. بــە پێچەوانەی ویســتی زۆربــەی ئەندامەکانی شــوورا، رەنگە هەموویانیــش، ئێســتاش شــوێنەواری داســەپاندنی ئیدئۆلۆژیــی دیاریکراو لە ناو شــوورادا هەســتی پێ دەکرێ. بە رۆیشتنی ئاغای بەنی ســەدر زەمینەی باش دەرەخســێ بۆ ئەوەی کە ئەو شــێوە لە خەبات و بەربەرەکانێ لە راستای بەرژەوەندیی گشتیی ئەو هێزانەدا کە لە دەوری شوورای نیشتمانیی بەرگری کۆ بوونەتەوە بۆ خەبات دژی هێڵەکانی کۆنەپەرســتی و رێژیمی سەدە نێوەڕاستیی خومەینی کەڵکی لێ وەربگیرێت.

٧. شــوورا دەبێ نوێنەری گشــت رێکخراو و کەسایەتییەکانی تێدا ئەنــدام بێ. تەنانەت ئەولاتــر لە نوێنەرانی حیــزب و رێکخراوەکان، دەبــێ نوێنــەری چین و توێژەکانی کۆمەڵگاشــی تێدا بــێ کە لە نێو شــوورادا نوێنەریان نیە، نــەک نوێنەری دوو ـ ســێ رێکخراو. هەر بۆیە شــوورا دەبێ پێگە و شوناســی تایبەتی بۆ هــەر رێکخراوێکی سەربەخۆ هەبێ.

٨. بۆ ئەوەی کە شـــوورا خاوەنی شوناسێکی تایبەت بە خۆی بێ، پێشـــنیار دەکەین لە داهاتوویەکی نزیکدا هەم ئۆرگانی شوورا چاپو بڵاو بکرێتەوە، هەمیش رادیۆی شوورا کاری خۆی دەست پێ بکا.
٩. بـــۆ ئەوەی شـــوورا بە شوناســـی تایبەتی خۆی بـــگات تەواوی رێکخراو و کەســـایەتییەکان لە چالاکییەکانی شـــوورادا بە شـــێوەی جیدی بەشداری بکەن و، وەک پێشوو تەنیا کارەکانی شوورا نەدرێنە رێکخـــراوی موجاهیدین. حیزبی ئێمـــە ئامادەیە ئیمکاناتی خۆی هەم لە بواری ماددی، هەم لە بواری پێرســـۆنێلی لە ئیختیاری شـــوورای نیشتمانیی بەرگری دابنێ.
١٠. شـــوورا بۆ چالاکییەکانی خۆی لـــە نێوخۆی وڵات دا دەبێ بە کردەوە بەرنامەکانی رێک بخا. لەوەیرا کە «رەســـالەت»ی شـــوورا رووخاندنـــی رێژیمـــی خومەینـــی و هێنانـــە ســـەرکاری رێژیمێکـــی دێموکراتیکە، شوورا دەبێ رێگەی گەیشتن بەو ئامانج و ستراتیژییەی دیاری بکا.
مانـــەوە لـــە چوارچێوەی دروشـــمەکانی وەک: «مەرگـــو نەمان بۆ خومەینی» یان خەباتی چەکدارانە، شـــکڵ و شـــێوە و «میحوەری» خەبـــات کـــە بە حەق لـــە لایـــەن رێکخراوەکانی ئەندام لە شـــووراوە دەدرا، بە تەنیا بەس نیە.
١١. پێشـــنیار دەکەیـــن کە شـــوورا کۆبوونەوەکانـــی داهاتووی لە چوارچێوە و راســـتای کێشـــە باســـکراوەکانی ســـەرەوەدا بگرێ. بە مەبەســـتی بەرەوپێشـــبردنی کارو ئەرکەکانی شـــووراو وەدیهێنانی ئارمانو ئامانجەکانی کە لە سەرەوە ئاماژەیان پێکرا. نوێنەری حیزبی ئێمە پێشنیارگەلی دیاریکراوی هەیە کە پێشکەشی شوورایان دەکا.

■ شیکردنەوەیەک لەمەڕ پێشنیارەکانی کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکرات بۆ بەرپرس و ئەندامانی شوورای نیشتمانیی بەرگری

پێشنیاری یەکەم سەبارەت بە پێداچوونەوە بە بەرنامە و ئەساسنامەی شوورایە. هەموومان باشمان لە بیرە کە ئاغای بەنی سەدر پێداگر بوو کە شوورا بڕیارەکانی ناوبراو بکاتە بەرنامەی کاری خۆی. حیزبیش هەر ئەوکات بە فەرمی رایگەیاند کە بە هیچ شێوەیەک ناچێتە ژێر باری بڕیارەکانی بەنی سەدرەوە. ئەو بەرنامەیەی کە لە لایەن موجاهیدینەوە ئامادە کراون، دەکرێ بە بەرنامەی شوورا پێشنیار بکرێ و حیزب بەپێی قانوون و ئوسوول قبووڵی بکا، بەڵام حازر نابێ لە هەمبەر نووسراوە و ماددەکانی ئەو بەرنامەدا وەڵامدەر بێ. حیزب لەسەر ئەو باوەڕەیە کە بەرنامەی شوورا دەبێ رەنگدانەوەی بیروڕای هاوبەشی هەموو ئەندامەکانی شوورا بێ. بەڵام بەرنامەی ئێستا تەنیا رەنگدانەوەی بیروڕای موجاهیدینە و ئەندامەکانی دیکەی شوورا نە لە ئامادەکردن و نووسینی بەشدار بوون و نە دوای ئامادەکردنی لە لایەن موجاهیدینەوە بیروڕای خۆیان لە نێو بەرنامەکەدا گونجاندووە.

پاش پەسندکرانی ئەرکە پێسپێراوەکان، دەوڵەتی کاتی بە کردەوە بەرنامەی پێشووی هەڵوەشاندەوە. بەڵام رێکخراوی موجاهیدین لە راستای ئەم بەرنامەیەدا وەکوو بەرنامەی شوورا هەر وا پێی دادەگرت. بەرنامە لەگەڵ ئەرکەکانی بەردەوامی دەوڵەتی کاتی لە دوولاوە لە دژایەتیدان:

- شووراو دەوڵەتی کاتی بۆ پیادەکردنی بەرنامەکانیان تەنیا شەش مانگ کاتیان هەیە، لە کاتێکدا پیادەکردنی مادەکانیی کە لە بەرنامەکەی پێشوودا هاتووە ساڵانێکی دوور و درێژی پێویستە.

جەوهەر و ناوەڕۆکی ئەرکە پایەدارەکانی دەوڵەتی کاتی لەگەڵ جەوهەر و ناوەڕۆکی بەرنامەی پێشوو جیاوازیی هەیە. لە حاڵێکدا کە

بەرنامەکە بە تەواوی مۆرکی مەزهەبیی پێوەیە، ئەرکە پایەدارەکانی دەوڵەتــی کاتی بەرنامەیەکی لائیک و غەیرە مەزهەبییە و هیچ جۆرە ئیدئۆلۆژییەکی دیاریکراو بە سەریدا زاڵ نیە. ئەو فاکتەرانە بەتایبەت لەمــەڕ ماددەکانی ٨و ١٠ی ئەرکە پێشــپێردراوەکانی دەوڵەتی کاتی روون و ئاشکرایە.

لــە چەندین بابەتــدا (لاپەڕەکانــی ٣٩،٣١،٢٠،١٨،١٦،١٣) بە واتا، بە باوەڕی موســڵمانە راســتەقینەکان، بە باوەڕی ئێمە موســڵمانەکان. دووپاتبوونــەوەی ئەم واتایــە رەنگی ئیدئۆلۆژییەکــی دیاریکراو بە بەرنامەی شــوورا دەدا، لە لایەکی دیکەشەوە ئەو رامانە دێنێتە پێش کە ئەندامەکانی دیکەی شوورا شوناسی شوورایی ئەو بەرنامەیەیان جــودا نەکردۆتەوە، کە وایــە چۆن نوێنەرانــی رێکخراوەکانی وەک: «شوورای یەکگرتووی چەپ». دەکرێ وەک موسڵمانانی راستەقینە سەیریان بکرێ؟

ئــەو کاتــە واژە و زاراوەی موســڵمانانی راســتەقینەش بۆ خۆی جێگــەی باس و تێڕامانە. بۆ نموونە رێژیمی خومەینی خۆی بە نماد و کانگای ئیســلامی راستەقینە دادەنێ و بەناوی ئیسلامی راستەقینە ئەو هەموو جینایەتە ئەنجام دەدات. رێکخراوی موجاهیدینیش خۆی بە نوێنەری موسوڵمانانی راستەقینە و شۆڕشگێڕ دەزانێ و ئیسلامی خومەینی و ویلایەتی فەقیە رەد دەکاتەوە.

خەڵکــی ســوننی مەزهەبی کوردســتان نە ویلایەتــی فەقیهی بە ئیسلامیی راســتەقینە دەزانن، نە ئیســلامی رێکخراوی موجاهیدین. هەڵبــەت هــەر رێکخراو و ســازمانێک مافــی هەیە کــە پەیڕەوی لە ئیدئۆلۆژییەکــی دیاریکــراو بکا، بەڵام ئەو ئیدئۆلۆژییە نابێ بەســەر ئەندامەکانــی دیکــەی شــوورادا بســەپێت، بەرنامــەی شــوورا ئەو ئەســڵەی لە بەرچاو نەگرتوە. لە یەکێک لــە لاپەڕەکانی بەرنامەکەدا هاتوە کە دەبێ زۆر بە جیددی ئاماژەی پێ بدرێ کە بە باوەڕی ئێمە

موسـڵمانان مەسەلە و کێشە سیاسـی و کۆمەڵایەتییەکان، لە نێوان تەواوی چین و توێژەکانی نەتەوەکاندا، بە هیچ شێوەیەک چاوپۆشین لە حەقانییەتی ئیسلامی راستەقینەی «ناب محمدی» نیە.

بـە واتەیەکـی دیکە ئێمە قەلبەن و عەقڵەن لە سـەر ئەم باوەڕەین کە شـکۆفایی ئیسـلام لە دەخاڵـەت نەدانی هەر جـۆرە هەڵاواردن ئیمتیـاز و کاروبارێکـی ئیجبـاری سیاسـی و کۆمەڵایەتیدایـە. لـە لاپـەڕەی ٣٩ی بەرنامەکەدا ئاوا نووسـراوە کە: «بـە باوەڕی ئێمە موسـڵمانان، خومەینـی مەزنتریـن زەرەر و زیانـی لـە فەرهەنگی راستەقینەی «ئیسـلامی نابی محەممەدی» و شیعەی عەلەوی داوە کە دەبێ وردەوردە راسـتییەکانی ئیسلامی ئینقلابی زۆر بە زوویی کە شـوێنەواری کاولکاری و خەیانەتی خومەینی لە نێو موسڵمانانی جیهانـی پێـوە دیارە، لابچێ. پێداگریی ئەوندە لە سـەر ئوسـووڵ و بنەماکانـی ئیسـلام، لەگـەڵ ئەو هەمـوو رێز و حورمەتـەی کە بۆ ئیسـلاممان هەیـە، وەکـوو ئاییني زۆرینـەی خەڵکی ئێـران، ئایا بە غەیـری داسـەپاندنی ئیدئۆلۆژییەکی دیاریکراو هیـچ مانایەکی دیکە دەگەیەنێ؟

بە باوەڕی ئێمە، بەو ئەزموونە تاڵەی کە خەڵکی ئێران لە کۆماری ئیسـلامییان هەیە، شـوورا دەبێ ئاشـکرا و بە بێپـەردە خوازیاری جودایـی دین لە دەوڵەت بـێ. هەر ئاڵترناتیڤێک کە رەنگی مەزهەبیی پێوە بێ «موشـکل»ە کە زۆرینەی خەڵکی ئێـران تەئییدی بکەن. لە لایەکی دیکەشەوە ئەگەر وەها ئاڵترناتیڤێک لە وڵاتەکەماندا قودرەت و هێز لەدەست خۆیدا قەبزە بکا، کێشەیەکی یەکجار زۆر دەخوڵقێنێ.

سەبارەت بە ئەرتەش، لە بەرنامەی شووراڕادا گوتراوە کە: «شوورا خوازیاری نۆژەنکردنەوەی رێکخراوی خەڵکی (ئەرتەش)ە. (لاپەڕەی ٢٣) ئێمـە وەک حیزبـی دێموکراتی کوردسـتانی ئێـران خوازیاری هەڵوەشـانەوەی ئەرتەشی کۆماری ئیسـلامی و سپای پاسداران و

هەموو هێزە چەکدارەکانی ڕێژیمی ئێستاین. هەبوونی پێرسۆنێلی پێشکەوتوو و نیشتمانپەروەر لە ریزەکانی ئەرتەشی ڕێژیمدا جەوهەر و ناوەڕۆکی کۆنەپەرستانە و دواکەوتووانەی ئەو ئەرتەشە ناگۆڕێ، چونکە هەر ئەو ئەرتەشەیە کە چەندین ساڵە دژی خەڵکی بێدیفاعی کوردستان بێبەزەییانە شەڕ دەکات.

لە لاپەڕەی ٣٢دا قسە لە مافی نەتەوەکان کراوە. نە مەفهوومی ئەوەی کە گوتراوە و نە زاراوەگەلێکی کە بە کار هێنراوە (بۆ نموونە: ئێتنیکە خۆجێییەکان ناتوانێ پەسندی حیزبی ئێمە و شایەدیش زۆربەی ئەندامەکانی شوورا بێ. شوورا دەبێ بوێرانە و دلێرانە لەمەڕ دابینکردنی مافی هەموو گەلانی ئێران پێشقەدەم بێ و مافی خودموختاری جیاواز لەوەی کە خەباتی ئەم گەلانە لە کام قۆناغدایە، بۆ هەموویان بە ڕەوا بزانێ.

هەموو ئەو ئەرکە پێسپێراوانەی دەوڵەتی کاتی کە سەبارەت بە ژنان هاتووە، دەبێ جێگەی قبوول و تەئییدی هەموو ئەندامانی شوورا بێ، نەک بەپێی «موازین»ی ئیسلام کە لە بەرنامەکەدا پشتی پێبەستراوە و بتهەوێ و نەتهەوێ مافەکانی ژنان لە نێو کۆمەڵگا و نێو بنەماڵەدا سنووردار دەکا.

لەو بەرنامەکەدا زۆرجاران چەمکی «میللەتی ئێران» بەکار هێنراوە (لاپەڕەکانی ١٣، ١٠٣، ٣٢) کە جێگەی پەسندی حیزبی ئێمە نیە. بە جێگەی ئەو «چەمکانە» خەڵکی ئێران یان گەلانی ئێران دەبێ بگوترێ. دیسان لە نێو بەرنامەکەدا پشت بە قسەکانی «تاڵەقانی» بەستراوە (لاپەڕەکانی ١٤و ٢٩). بە سەرنجدان بە نەخشێک کە ئایەتوڵلا تاڵەقانی لە هەلایسانی شەڕی کوردستاندا گێڕای و بە ئاشکرا لە کاناڵی ڕاگەیەنە گشتییەکاندا تەوهین و سووکایەتیی بە حیزب و پێشمەرگەکانی کوردستان کرد، حیزبی ئێمە بە هیچ جۆرێک پشت ئەستووربوون بە قسەکانی ناوبراو لە بەرنامەی شوورادا

تەئییـد ناکا. هەروەها پێشـنیار دەکرێ کە گەلاڵـەی خودموختاریی پارێزراو لە شـووورادا چاوی پێدا بخشـێندرێتەوە و ئەوە کە تەنیا بە پێداگریی بەنی سەدر لە گەلاڵەی ئەو دواییەی شوورادا گونجێندراوە، لا ببرێت.

■ وەڵامی دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکرات

بـە بۆچوونەکانـی ئەندامانـی شـوورای نیشـتمانیی بەرگری لە کۆبوونەوەی ١٧ی بەفرانباری ١٣٦٣دا

هێندێک لە قسـە و باسـەکانی ئەندامەکانی شوورا لەو پێوەندییەدا کـە لە بڵاوکراوەی کوردسـتان، ژمارە ٩٩دا نووسـراوە، ئەوەی کە سـکرتێری گشـتیی ئێمە دوکتور قاسـملوو لە نێو شـووورادا شـیی کردۆتـەوە مەحکوومیـان کـردووە کـە جێگەی داخ و کەسـەرێکی زۆرە. ئێمـەش بـە نۆرەی خۆمان ئەو قسـانەی ئەندامانی شـوورا بـە نامەسـئوولانە لە قەڵەم دەدەیـن و زۆر بە تونـدی مەحکوومی دەکەین و بە تەوهین و سـووکایەتی بە هێزی ئەسـڵیی رێبەرایەتی و بزووتنـەوەی دێموکراتیکی کوردسـتانی دەزانین و بەبێ ئەمەگی و چاونووقانـدن لـە فیداکارییەکانی گەلی کـورد و خوێنی پیرۆزی شەهیدانی کوردستانی دێنینە ئەژمار.

لە «کوردسـتان»دا هاتووە کە تەنیا چاوپێکەوتن لەگەڵ نوێنەرانی رێژیم ئەنجام دراوە و هیچ کێشە و مەسەلەیەکی جیدیی دیکەی لە پشـتەوە نەبووە و وتووێژیش ئەنجام نەدراوە. سەرەڕای ئەوەی کە لە بەندی ٥ی پێشنیارەکانی ئاغای «رەجەوی»دا هاتووە کە مەبەست لـە وتووێژ و دانوسـتان راگوێزتنـی نهێنی و زانیارییـەکان نیە! لە کۆتاییدا دەمانهەوێ جارێکی دیکە روانگەی حیزبەکەمان لە پێوەندی بە ئەگەری مەسەلەی وتووێژ لەگەڵ رێژیم وە بیر بخەینەوە:

١. حیزبـی دێموکرات بەرپرسـایەتیی رێبەریی بزووتنەوەیەکی لە سـەر شـانە و حەقی وتووێژ لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی وەکوو شێوە

و قۆناغێـک لــە خەباتی هەڵبژاردووە و لە داهاتووشــدا ئەو مافە بە ڕەوا دەزانێ.

٢. حیــزب بــە بێ ئاگاداریی شــوورا و بە بــێ هاوئاهەنگی لەگەڵ شــوورا هیچ جـۆرە وتووێژێکی سیاســی لەگــەڵ نوێنەرانی ڕێژیم ئەنجام نادا.

٣. لە بەندی ســێهەمی پێشنیارەکانی ئاغای ڕەجەویدا بەم شێوەیە هاتووە کە: لە ئایەندەدا هەر ئەندامێکی شــوورا ئەگەر بیهەوێ وەها وتووێژێک ئەنجام بدا، جودابوونەوەی خۆی لە پێشدا قبووڵ بکات.

٤. بە خوێندنەوەی سێ کۆبوونەوەی ئەو دواییەی شوورا هەست دەکــرێ کــە گەلاڵــەی مەســەلەی وتوویــژ و گەورەکردنــەوەی بە ئەنقەســت و بە مەبەســتی بێدەنگکردنی باس سەبارەت بە پێشنیارە بنەڕەتییەکانــی ئێمە بە بەشــداریی ســکرتێری گشــتیی حیزب بووە کــە لــە کۆبوونەوەکانی شــوورادا چەندین جار لە لایــەن نوێنەرانی موجاهیدینــەوە ئامــاژە بەو بابەتــە کراوە کە حیزبــی دێموکرات لە ئەندامەتی لە نێو شوورادا کەڵکی وەرگرتووە، بە بێ ئەوەی کارێکی بۆ شوورا ئەنجام دابێ. تەنانەت ٩٠٪ی لە شوورا کەڵکی وەرگرتووە و ١٠٪ی بۆ شوورا مایە داناوە.

هەروەها گوتراوە کە حیزبی دێموکرات خودموختاریی لە شــوورا وەرگرتــووە، بەلام کارێکی ئەنجام نــەداوە. بەڵام دەبێ ئەو ئیدیعایە بکەن کە شــوورا هیچ کارێکی بۆ حیزب نەکردووە. ئەگەر مەبەســت ئەو کارە بێ کە شوورا بۆ حیزبی دێموکراتی کردووە، دەنگدانەوەی خەباتی خەڵکی کوردستان بە ڕێبەریی حیزب لە دەرەوەی وڵاتە، ئەو دەنگدانەوە بۆ هەموو ئەندامەکانی شــوورا بووە، ئەوەی کە شوورا بۆ دەنگدانەوەی خەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا کردوویە، بــە هیچ شــێوەیەک وڵامــدەری تونــدی و بەرینیی خەباتــی خەڵکی کوردســتان و پێشمەرگە گیان لە سەر دەستەکانی کورد نەبووە. بە

پێچەوانــە لە بەڵگە و دیکۆمێنتەکانی شــووڕادا خەباتی خەڵکی کورد و نەخشــی حیزبەکەمان بچووکتر لە پشــکی واقیعیی خۆی نیشــان دراوە، لــە حاڵێکــدا کە رۆڵــی موجاهیدینی زیاتر لە بــەش و حەقی خۆی بەرجەســتە کردۆتەوە! لە نێوخۆی وڵات کە گۆڕەپانی ئەسڵیی خەباتە، بچووکترین هاوکارییەک لە لایەن شووڕاوە بە بزووتنەوەی کوردستان و حیزبی دێموکرات نەکراوە.

ئەگــەر مەســەلەی بەهرەبەرداریــش لە ئارادا بــێ، بەهۆی ئەوەی کــە ئەو دووانە (شــووڕا و موجاهیدین) هاونــاون، زۆرترین بەهرە رێکخراوی موجاهیدین بردوویە.

ئامانجی سەرەکیی شووڕا رووخانی رێژیمی کۆماری ئیسلامییە و لە رێگەی وەدیهێنانی ئەم ئامانجەوە هیچ کام لە ئەندامانی شووڕا بە هاوسەنگیی هێزەکەیان بەرادەی حیزبی دێموکرات بەشدار و چالاک نەبوون و فیداکارییان نەکردووە. ئێمە لە پێوەندی لەگەڵ چالاکییەکانی شووڕا لە دەرەوەدا، دەبێ بڵێین کە نوێنەرەکانی حیزبی ئێمە هەمیشە لــە کۆبوونەوەکانی شــووڕادا چالاکانە بەشــدارییان کــردوە. بەڵام ئیمکاناتــی ماددی و پێرســۆنێلیی حیزب لــە دەرەوەی وڵات کەمە، سەرەڕای ئەوەش حیزبی دێموکرات بە دەیان جار رایگەیاندووە کە ئامادەیە بە نیسبەتی پشکی خۆی لە دابینکردنی ئیمکاناتدا بەشداری بــکا. بەو مەرجــە کە پێشــنیارەکانی ئێمە لەمــەڕ دێموکراتیزەکردن زۆرتر و زیاتر لە جاران لە لایەن شــووڕاوە سەرنجی پێ بدرێ، بە تایبەتی شووڕا شێناسی سەربەخۆی خۆی وەدەست بێنێتەوە.

ســەبارەت بە پەسندکردنی گەڵاڵەی خودموختاری، دەبێ بڵێین کە ئــەو هەنگاوە پێش هەموو شــتێک بە قازانجی شــووڕا تەواو بووە. چونکە ئەو کردەوەیە بۆتە هۆی پشتیوانی کردنی خەڵکی کوردستان لە شــووڕا. شــووڕا بەو هەنــگاوە ئەرکێکی مێژوویــی ئەنجام داوە و بــۆی نیە منەت بە ســەر خەڵکــدا بکا. تازە ئەگــەر بێت و خەڵکی

کورد خودموختاری وە دەست بێنن، ئاکامی راستەوخۆی موبارزەی خەڵکی کوردستانە، شوورا بە پەسندکردنی گەلاڵەی خودموختاری لە سەر کاغەز خۆ بە کردەوە خودموختاریی بە کەس نەداوە. هەنووکە شوورا بە تایبەت ڕێکخراوی موجاهیدین حازر بە دانی مافی خودموختاری بۆ ئازەربایجان و بەلووچستان و گەلانی دیکەی ئێران نین. شایەد ئەگەر خەڵکی کوردستانیش بە ڕێبەرایەتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ساڵانێکی دوور و درێژ خەبات و فیداکارییان نەکردبایە و بە دەیان هەزار شەهیدیان لەو ڕێگایەدا نەدابایە، بە دڵنیاییەوە شوورا دەگەڵ گەلاڵەی خودموختاری بۆ کوردستان موافقەتی نەدەکرد.

لە کۆتاییدا سپاسی قسەکانی ڕەجەوی سەبارەت بە نەخشی حیزبی دێموکرات و بانگهێشتنی ناوبراو لە ئەندامانی دەفتەری سیاسی بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەی شوورادا دەکەین و بە ئاگاداریی ئەندامەکانی شوورا دەگەیەنین بەو بەرپرسایەتییەی کە دەفتەری سیاسیی حیزب لە سەر شانیەتی، زیاتر لە یەک یان دوو کەس لە ئەندامەکانی ناتوانن کوردستان بەجێ بهێڵن. لەو راستایەدا پێشنیار دەکەین کە بەرپرسی شوورا لە راستای وەفدێک لە ئەندامەکانی شوورا سەردانی کوردستان بکەن، هەتاکوو هەم لە نزیکەوە لەگەڵ بارودۆخی ناوچەکە ئاشنا بن و هەمیش بە بەشداریی تەواوی ئەندامەکانی دەفتەری سیاسیی حیزب مەسەلەکان بێنە ئاراوە.

■ ڕاگەیەندراوی دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران سەبارەت بە هاتنەدەری حیزب لە شووورای نیشتمانیی بەرگری (١٣٦٤/٢/١٠)

کاتێک کە لە ساڵی ١٣٦٠ی هەتاویدا بەرنامەی شوورا بە ئیمزای ئەبولحەسەنی بەنی سەدر، سەرکۆمار و مەسعوود ڕەجەوی، بەرپرسی یەکەمی موجاهیدین گەیشت، حیزبی دێموکرات سەبارەت

بە کەموکوڕییەکانی پێکهاتەی شوورا، هەم لە ئاستی نەزمی بەرنامەکە ئـاگادار بوو. هـەر بۆیە بە هەسـتکردن بـە پێویسـتیی دامەزرانی ڕێکخراوێکی سیاسـیی پێکهاتوو لە ڕێکخراو و کەسایەتییەکانی نێو ئۆپۆزیسیۆن، بەو هیوایە کە بتوانێ شووڕای لە ناوەوە کامڵتر و پڕ ناوەڕۆکتر بکا، بە قبووڵکردنی ئوسوول و بنەما گشتییەکانی بەرنامە چووە ناو شـووراوە. لە ماوەی چوار ساڵ ئەندامەتیی حیزب لە نێو شـووڕادا، پێوەندیی حیزب دەگەڵ شـوورا و موجاهیدین، هەوراز و نشـیوێکی زۆری بڕی. لەو ماوەیەیدا زۆربەی هەرەزۆری کاتەکانی خۆی بۆ دێموکراتیزەکردنی شوورا و دانی شۆناسی سەربەخۆ بەو ڕێکخراوەیـە، ڕێکوپێک کـردن و پێداچوونەوە بـە بەرنامەکانی ئەو شـوورایە تەرخـان کردبوو. هەتاکوو ببێتە هۆی پەلوپۆ هاویشـتنی شوورا و...

پەسـندکردنی بەڵگە سێگانەیەکانی شووڕای نیشـتمانیی بەرگری لە مانگی ڕەشـەمەی سـاڵی ١٣٦٠و بەدوای ئەویشدا، پەسند کردنی گەڵاڵەی «خودموختاریی کوردسـتان»، لـە هاوفیکری و هاوکاریی بەردەوامی حیزب لەگەڵ ڕێکخراو و کەسایەتییەکانی ئەندامی شوورا دێنە ئەژمار. لەوەیڕا کە هەندێک لە ئەندامەکانی شوورا نەیاندەویست هەڵوێستی مەزنیخوازانەی زاڵ بە سەریاندا قبووڵ بکەن، هیوابڕاوانە لە دێموکراتیزەبوونی شـوورا لە ئەندامەتی ئێسـتێعفایان دا. دوایین ڕێکخراویـان شـووڕای یەکگرتووی چەپو ئاغای ناسـری پاکدامەن بوون.

بە کورتی بیروبۆچوونـی موجاهیدین بریتی بوو لە: «هەر چەندە بەرپرسـایەتی و ڕێبەریـی بزووتنـەوەی کوردسـتان لە ئەسـتۆی حیزبی دێموکراتە، بەڵام سـەلاحییەتی بڕیاردان لەمەڕ چارەنووسی بزووتنەوەکە لەوان سەلب بکرێ».

حیزبـی دێموکـرات ناتوانێ نە لـە سـەربەخۆیی بڕیاردانی خۆی

چاوپۆشی بکا و نە سەلاحییەتی خەباتیش کە چەندین دەیەیە خەڵکی کوردستان خستوویانەتە سەر شانی، بیداتە دەستی کەسانێکی دیکە. هەتا ڕۆژی ٢٠ی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٦٤ کە لەگەڵ بەناو بڕیارنامەی شوورا ڕووبەڕوو بۆوە.

سکرتاریەتی کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە ڕاگەیەندراوی ٢٨ی خاکەلێوەدا ڕەسمییەت و مەوزووعییەتی بڕیارنامەی ناوبراوی ج لە بواری ناوەڕۆک و ج بەهۆی ئەساسنامە و ئاییننامەوە بردە ژێر پرسیار و خوازیاری پێکهاتنی کۆبوونەوەی شوورا بە بەشداریی هەر هەموو ئەندامەکانی بوو. بەڵام پاش تێپەڕینی دوو حەوتوو ئێستاش هیچ وەڵامێک بەو داخوازییە نەدراوەتەوە؟ ..

حیزبی دێموکرات بە پێچەوانەی مەیلی دەروونیی خۆی بە ئەندامەتی لە نێو شووورادا کۆتایی دێنێ. بەرپرسایەتیی هەوڵنەدانی شوورا ڕاستەوخۆ دەخاتە سەر شانی موجاهیدین و بە پێچەوانەی بیروڕای موجاهیدین، لە سەر ئەو باوەڕەیە کە پاش چوونەدەری حیزبی دێموکرات لە شوورا وەک یەکێک لە پایە و کۆڵەکە سەرەکییەکانی، نەک تەنیا شوورا هێز ناگرێ، بەڵکوو ئیدی شوورایەک بە مانا واقیعییەکەی نامێنێ. دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکرات لە عەینی ئامادەیی حیزبدا بۆ هاوکاریی دێموکراتیک و ئوسووولیی تەواوی حیزبەکان، ڕێکخراوەکان و کەسایەتییە دێموکرات و پێشکەوتنخوازەکانی ئێران کە پێویستی بە خەباتێکی شێلگیرانە و بە کردەوەیە بۆ ڕووخاندنی ڕێژیمی دژی گەلیی کۆماری ئیسلامی و هێنانە سەرکاری ڕێژیمێکی دێموکراتیک قۆڵیان هەڵماڵیوە، ڕادەگەیەنێ.

بەهیوای ئەو ڕۆژە کە لە داهاتوویەکی نزیکدا شاهیدی وەدیهێنانی ڕێکخراوێکی بەرینی سیاسی لە هێزە دێموکرات و سەربەخۆ و کۆماریخوازەکانی ئێران بین.

## ■ ٤٢: مانگـی دیفـاع لە ئـازادی و مانگی هێرش بۆ سـەر دوژمن (١٣٦١)

ڕێژیمـی کوردکـوژی کۆمـاری ئیسـلامی لـە نیـوەی دووهەمی مانگـی جۆزەردانی ١٣٦١دا هێرشـێکی بەرفراوانی بۆ سـەر ناوچە رزگارکراوەکان دەست پێ کرد کە قورسایی ئەو هێرشە و مەبەستی سـەرەکیی ڕێژیم گرتنەوەی جادەی پیرانشـار ـ سەردەشت بوو کە لـە هەر دوو پادگانی سەردەشـت و پیرانشـار هێزێکـی زۆریان لە سەرتاسـەری ئێرانەوە مۆڵ دابوو، و هێرشـەکەی دەسـت پێ کرد. لەو پێوەندییەدا دوکتور قاسملوو، سکرتێری گشتیی حیزب پەیامێکی ئاراسـتەی هەموو خەڵکی کوردسـتان کرد و داوای لە هەموو چین و توێژەکانی خەڵکی کوردسـتان، کادر و پێشمەرگەکانی حیزب کرد کـە بە هەموو هێزێکەوە بەشـداری لە بەربەرەکانـێ دژ بە ڕێژیمدا بکـەن و هەر کەس بە هەر شـێوەیەک دەتوانێ یارمەتی بەو دیفاعە رەوایە بکا، ڕۆژی ٢٠ی خەرمانانی سـاڵی ١٣٦١ی هەتاوی تا ٢٠ی ڕەزبەری هەمان ساڵ وەک «مانگی دیفاع لە ئازادی و مەوجوودیەتی گەلی کورد» ڕاگەیەنرا و دروشـمی «هەموو شتێک بۆ جبهە،هەموو ئیمکاناتێک بۆ سەنگەر» بوو بە دروشمی سەرتاسەری کوردستان.

لـە درێژەی بەیاننامەدا داوا لە کۆمەڵە و سـازمانی موجاهیدین و هەموو ڕێکخراوە سیاسـییەکان کە لە بەرەنگاری و شەڕی کۆماری ئیسلامیدا بەشدار بوون، کرابوو کە ئەوانیش بەشداریی ئەو بەرگرییە بکەن و بە وەشـاندنی زەبر لە بنکەکانی ڕێژیم لە ناوچەکانی دیکەی ئێراندا، یارمەتیی ئەو بەرەنگاربوونەوەیە بدەن.

لە ماوەی ئەم مانگەدا هێزەکانی ڕێژیم لە دوو میحوەری پیرانشار ـ سەردەشت هێرشی خۆیان بۆ گرتنی جادەی سەردەشت ـ پیرانشار کە ٧٠ کیلوومیترە، دەست پێ کرد و لە بەرەنگارییەکی قارەمانانەی هێـزی پێشـمەرگەی حیزبـی دێموکرات و هێـزی بەرگریدا چەندین

جـار توشـی شـکان بـوون، دەوری ژنانـی خەباتگێڕ لـە گەیاندنی خواردەمەنـی و پێداویسـتییەکانی بەرەکانـی شـەڕدا جێگای ڕێزی تایبـەت بـوو. هەروەها کـە داوا کرابوو، هەموو چین و توێژەکانی لە لاوان و مامۆسـتا ئایینییەکان و مامۆسـتاکانی شۆڕش و ژنان و جووتیاران هەر کام بە شێوەیەک بەشدار بوون.

لـە مانگی ڕەزبەردا بۆ جارێکی دیکە دوکتور قاسـملوو پەیامێکی دیکەی ئاراسـتەی خەڵکی کوردسـتان کرد و لە ڕۆژی ١٢ی مانگی ڕەزبەر تا ٢٠ی مانگی خەزەڵوەر بە «مانگی هێرش بۆ سەر دوژمن» ناودێـر کـرا و ڕایگەیاند ئەگەر چی لە مانگـی دیفاعدا توانراوە زور زەربەی کاریگەر لە دوژمن بوەشێنرێ و پێش بە هێرشەکانی گیراوە، بەڵام دەبێ لەم مانگەدا هێرش بکرێتە سەر هێزەکانی ڕێژیم بۆ ئەوەی پیلانەکانی پووچەڵ بکرێتەوە و دروشـم هەر ئەو دروشـمە بوو کە لە مانگی پێشدا بەرز کرابوو و داوا لە ڕێکخراوەکانی حیزبی کرابوو ئەولەویەتی کارەکەیان بکەن بە هاوکاری لە بەرەکانی شەڕدا.

ئاکامی شەڕی جادەی سەردەشت ـ پیرانشار بەم چەشنە بوو:

٦١٩٧ پاسدار و بەسیجی و ئەرتەشی کوژران، ٨٢٧٢ نەفەر بریندار بـوون، ٢٦٧ چەکداری ڕێژیم بە دیل گیران، ٤٨٠ دەزگا ئۆتۆمۆبیلی دوژمن لە نێو چوون، ٤٨ دەزگا ئۆتۆمبیل بە سـاغی کەوتە دەسـتی هێزی پێشمەرگە، ١٧ هێلیکوپتێر تەقەیان لێ کرا کە زوربەیان کەوتنە خـوارەوە، ٣٩ پێگـەی نیزامیی ڕێژیم گیران، ١١٣٠٠٠ دانە فیشـەک و ٦١٨ قەبـزە تفەنـگ و ٩ دەزگا بێسـیم و ١٤ قەبزە چەکی قورس و ١٠٠ ئاڕ.پی.جـی و زۆر کەلوپەلی دیکەی دوژمن کەوتنە دەسـتی هێزی پێشـمەرگە. لە بەرانبەردا ٢٦٨ پێشـمەرگەی قارەمان شەهید بوون کە لە بەرانبەر هەر شـەهیدێکدا ٢٣ کەس لە هێزەکانی ڕێژیم کوژرابوون.

لـەم ماوەیـەدا ژمارەیەک لە گونـدەکان کەوتنە بـەر بومباران و

تۆپبارانی ڕێژیم و دانیشتوانی ئاوارە بوون و زەرەر و زیانی ماڵیی زۆر لە گوندنشینەکان کەوت.

لەم شەڕەدا ستابێکی فەرماندەهی بۆ بەرێوەبردنی ئەو شەڕە پێک هاتبـوو و لـە ئاکامی ئەو دوو مانگەدا ئەگـەر چی ڕێژیم بە ڕواڵەت دەسەڵاتی بە سەر ناوچەکەدا هەبوو، بەڵام دەسەڵاتی بە سەر بستێک لە جادەکەدا نەبوو و هێزەکەی بێجگە لە جادەی سـەرەکی، تەنانەت دەسەڵاتیان بە سەر گوندێکی زۆر نزیکی جادەکەشدا نەبووە.

لـە درێـژەی ئەم شـەڕانەدا بـوو کە هێـزی یەکێتیی نیشـتمانیی کوردستان بەشداریی لەم شەڕانەدا کرد. ئەم هێزە بە ناوی «هێزی پشـتیوان» ناودێر کرا و بەشـداریکردنیان لەو شەڕەدا بوو بە هۆی نارەزایەتیـی موجاهدینـی خەڵـق و ڕخنەیـان ئەوە بـوو کە بۆ چی هێزەکانی یەکێتی بەشـداریی شـەڕیان لە دژی ئێران و شانبەشانی پێشـمەرگەکانی حیزب کردووە. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە موجاهیدین بـە ئەرکی هەموو ڕێکخـراوە ئازدیخوازەکانی دەزانـی کە دیفاع لە خەڵکی فەلەستین بکەن، بەڵام ئەو مافەی بۆ ڕێکخراوێکی کوردی بە ڕەوا نەدەبینی کە لە هێزێکی کوردیی پارچەیەکی دیکەی کوردستان تەنانـەت بـۆ دژایەتیـی کۆمـاری ئیسـلامی ـ کە خۆی بـە دوژمنی سەرەکیی دەزانی ـ کەڵک وەربگرێت.

### ■ ٤٤: کۆنگـرەی ٦، پەسـەندکردنی سۆسـیالیزمی دێموکراتیـک (١٣٦٢)

هێنـان و پەسـەندکردنی سۆسـیالیزمی دێموکراتیـک لـەو کاتەدا کە فەزای چەپ باڵی بە سـەر کوردسـتاندا کێشـابوو، کاری هەموو کەسـێک نەبوو و تەنیا لە ئینسـانیکی ئازای وەک دوکتور قاسملوو دەوەشـایەوە و بە ئیرادەی دوکتور قاسـملوو ئەو ڕێبازە پەسـەند کـرا. زۆر کـەس لەوانەی کە لـە کۆنگرەی ٦ هێنانی سۆسـیالیزمی

دیموکراتیکیــان بــە خەیانەت بــە ڕێبازی حیزب دەزانی، پاشــان کە تێ گەیشــتن دانیان بــە نەزانیی خۆیاندا نا. بەڵام پێویســتیی هێنانی سۆســیالیزمی دیموکراتیک چ بوو؟ بە بــڕوای من لە دوو ڕوانگەوە پێویست بوو:

یەکــەم، ســنووردانان لەگەڵ ڕێبازی توودەئیســتی بوو کە لە نێو حیزبدا هێشــتا نفووزێکی بەرچاوی هەبوو و کەسانێک بە ئەدەبیاتی توودەیی گۆش کرابوون.

دووهــەم، دەرخســتنی ئــەو ڕاســتییە بوو کــە لە سۆســیالیزمی مەوجــووددا دیموکراســی نیە و سۆســیالیزم ئەگەر دیموکراســیی لەگــەڵ نەبێ ناتوانێ ڕۆڵی پێشــڕەوانەی خۆی لە بەرەوپێشــبردنی کومەڵگادا بگێڕێ.

زۆر سەیر بوو لە نێو حیزبی دیموکراتدا کەم نەبوون ئەوانەی کە خولیــا و بیروباوەڕی توودەییان هەبــوو و دیفاعیان لە دیکتاتۆریی پرۆلتاریــا ئەکــرد، مێــژوو دەری خســت کــە سۆســیالیزم بــە بێ دیموکراســی ئەو کەم و کوڕییەی هەبوو کە شەهیدی نەمر دوکتور قاســملوو دەیگوت و ســەربەرزیی هەر بۆ ئەو شــەهیدە نەمرە کە سوننەت شکێن و تابۆشکێن و بوت شکێن بوو.

پاش پەســەند کردنی سۆســیالیزمی دیموکراتیک وەکوو ئامانجی دواڕۆژی حیــزب، کۆمەڵێک کەس کەوتنە دژایەتیکردنی سیاســەتی حیزب و کار گەیشــتە جێگایەک کە پاش پێداگربوونیان لە سەر ئەو کارە، چەند کەســێک لەوانە لە حیزب دەرکــران. لە ڕاگەیەندراوێکی کومیتەی ناوەندیدا کە پاش ئەو مەسەلەیە دەرکرابوو، هاتووەوە کە:

«لە ماوەی نێوان کۆنگرەی شەشەم و ئەم پلینومەدا، هێندێک کــەس لە حیــزب دەرکران کە پێویســتە کومیتەی ناوەندی لە چۆنیەتیی ئەم کارە ئاگادار بکرێ، ئەو کەســانە بو ئەوە دەر نەکــراون کە گۆیا لــە کۆنگرەدا بیروڕایەکــی دیکەیان بێجگە

لـە ڕێبازی پەسـەندکراوی حیزب هەبووە، واتـە دەنگدان بۆ ڕێبازێـک یـا دژایەتیکردن لەگەڵ ئەم ڕێبازە لـە کۆنگرەدا بە هیـچ جۆرێک میعیارێک بۆ دەرکردن یا هێشـتنەوە لە حیزبدا نیـە. ئـەو دەرکراوانە کەسـانێک بـوون کە پـاش کۆنگرەی شەشەم دەستیان کرد بە تێکۆشان دژی حیزب. لە زۆر جێگا کۆبوونەوەیـان دژ بە ڕێبازی حیزب گرت. لە چەندین کۆمیتە شارستان و هێزەوە جار جار ڕاپۆرتیان بۆ دەفتەری سیاسی نـارد کە ئەو کەسـانە لـە هـەر جێگایەکی بۆیـان هەڵکەوێ کۆبوونـەوە لەگەڵ ئەندامانی حیزب و پێشـمەرگەکان وە ڕێ دەخەن، دژی سیاسەتی حیزب قسەیان لە گەڵ دەکەن و دژی ڕێبەرایەتیی حیزب هانیان دەدەن.

ڕێگای دروست ئەوە بوو کە ڕێبەرایەتیی حیزب بانگیان بکا و پێیان بڵێت: «ئێوە هەتا کونگرە نەگیرابوو، هەتا لە کۆنگرەدا بڕیـار نەدرابوو، هەتا دروسـتکردنی کۆمەڵـی دێموکراتیکی سۆسیالیسـتی نەببوو بە مادەیەک لە بەرنامەی حیزبەکەمان، حەقتان هەبوو نەزەری خۆتان بدەن و تەنانەت لە سەریشـی ڕابوەسـتن، بـەڵام ڕێبازی سۆسـیالیزمی دێموکراتی ئێسـتا بەشـێک لـە بەرنامەکەمانە، ئێوەش بەرپرسـن کـە دیفاع لە بەرنامەی حیزب بکەن، بۆیە دەبێ لەمەو بەدوا بە پێی بەرنامە و پێڕەوی نێوخۆیی لە بنەماکانی حیزب دیفاع بکەن».

هێندێک لەوانە لەگەڵ ئەوەی بە ڕاسـتی تێکۆشـانی دژی حیزبیان کردبوو قەولیان دا کە لەمەو بەدوا لە ڕێباز و بەرنامە و ئەساسنامەی حیزب دیفاع بکەن، ئەوانە هەر ئێستاش ئەندامی حیزبن، بەڵام ئەوانی دیکە کە ئامادە نەبوون تەعەهود بدەن (کە خۆی نیشـانەیەکی دیکە بوو بۆ ئەوەی کە دەیانەوێ لە سـەر ئەو ڕێبازەی خۆیان بڕۆن کە لادانە لە ڕێبازی حیزب)، لە لایەن کۆمیسیۆنی تەشکیلاتەوە لە حیزب

دەرکران.

پاش ئەوەی کە لە حیزب دەرکران، بە تەواوی دەرکەوت کە بۆچوونی ڕێبەری دروست بووە، چونکە پاش دەرکردن ئەو کەسانە بە تەواوی نەخشەی خویان ئاشکرا کرد و ڕایانگەیاند کە گۆیا لە بەینی کۆمەڵە و حیزبی دیموکراتدا بۆشاییەک هەیە و سازمانی دیکە دەبێ ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە و گۆیا ئەوان دەیانەوێ سازمانێکی ئەوتۆ دروست بکەن. ئەوانە دەیانەویست بو ئەم مەبەستە لە ئیمکاناتی سازمانە سیاسییەکانی دیکەی کوردستان کەڵک وەرگرن. کاتێک کە یەکێک لە ئەو سازمانانە نەزەری ئێمەیان پرسی وەڵامیانمان وا دایەوە کە ئەگەر بە نێوی حیزبی دێموکراتەوە نەبێ و دژی حیزبی دێموکرات نەجووڵێنەوە و هەوڵ نەدەن ڕاستەوخۆ ریزەکانی حیزبی دێموکرات تێک بدەن، حیزبی ئێمە بە هیچ شێوەیەک دژایەتییان لەگەڵ ناکات، چوونکە گوتبوویان دەیانهەوێ حیزبێکی کۆمۆنیست دابمەرزێنن بە راشکاوی پێمان گوتن با بێن لە سالۆنی کۆنگرەی ئێمەدا کە ئێستاش لە جێگەی خویەتی، کۆ ببنەوە و حیزبی کۆمۆنیستی خویان دابمەرزێنن، لەگەڵ هەر تاقمێکی دیکەش لە کوردستان دژی ڕێژیم هاوکاری بکەن ئازادن، بچنە نێو هەر گرووپێکیشەوە دیسان هەر ئازادن و ڕێگەیان لێ ناگیرێ.

مەبەست ئەوەیە کە بۆ هەموو کەس روون بێ تێکوشانی سیاسی لە کوردستاندا ئازادە و ئازادیی تێکوشان و دێموکراسی لە کوردستاندا دەبێ بپارێزێ و پارێزەری ئەو دێموکراسییە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە.

لە سەر ئەو دەرکراوانە ڕوونکردنەوەیەک پیویستە، ئەوانەی کە دەرکراون سێ بەشن. دوو کەس لەوانە لە نێو حیزبدا جاسووسییان بو جێگای دیکە کرد و ئاشکرایە کە حیزب ناتوانێ جاسووس وەر بگرێ، چەندین کەسی دیکە بۆ ئەوە دەرکراون کە هەروەک گوتمان

حــازر نەبــوون تەعەهود بدەن کە بە دژی حیزب تێ نەکوشــن و لە نێــو حیزب و دەرەوەی حیزبدا بە دژی حیزب ئاژاوە نەنێنەوە، یەک دوو کەســی دیکەش بە بێ ئەوەی مەســەلەیەکی سیاسیی تایبەتیان بــۆ گرینــگ بێ، لە بــەر خۆبەزلزانی لــە هەموو جێگایــەک بە دژی ڕێبەرایەتی قسەیان دەکرد و پێشمەرگەکانیان بۆ مەبەستی شەخسی لە دژی حیزب هان دەدا. ڕێبەرایەتیی حیزب زوری هەوڵ دا بەڵام بێ فایدە بوو، بە راســتی ئێمە ئەگەر لە هەلومەرجی ئێستا دا چونیەتیی تەشــکیلاتی حیزبەکەمــان باش نەکەین یان ریزەکانــی حیزبەکەمان یەکپارچــە و پتەوتر نەکەین و یەکێتیی فیکری و سیاســی لە حیزبدا نەپارێزین، لە گەڵ ئەو هەموو فشــارەی کە لە ســەر حیزبەکەمانە و ئــەو هەموو خەباتــە توندوتیژەی کە لە پێشــمانە، توانای کردەوەی شۆڕشگێرانە لە دەست ئەدەین.

دژی ڕێبەرایەتیــی حیــزب قســە کردن لــە هەلومەرجی ئێســتادا قســەکردن دژی حیزبە. هەموو دوژمنەکانی ئێمەش لەو چەند ســاڵە کاریان هەر ئەوە بوو، مەبەست ئەوەیە کە ئەگەر بمانەوێ چۆنیەتیی کاری تەشــکیلاتی و کاری حیزبیمــان و کاری پێشــمەرگەکانمان لە دواڕۆژدا باشتر بکەین، دەبێ حیزب لەو دوو سێ جورە کەسانە پاک بکەینــەوە. ئەوانەی کە خویان لە حیزب پێ گەورەترە، ئەوانەی دزن و فەســادی ئەخلاقییــان هەیە. ئەوانەی لادەرن و سیاســەتی حیزب بەڕێــوە نابەن. ئەگەر لــە چوارچێوەی بەرنامــەی حیزبدا جیاوازیی بیروبۆچوون هەبێ قەیدی نیە. ئەو جیاوازییە هەیە و دەشبێ. بەڵام نابــێ کەس لە بەرنامەی حیزب دەرچێ، هەر بۆیە ئەو چەند کەســە دەرکران و ئاگاداریشــین قەوارەی حیزب ئەو کارەی زور بە چاکی وەرگرتووە».

## ■ ٤٥: دیاریکردنی ڕۆژی پێشمەرگە (١٣٦٣)

پلینۆمی دووهەمی کومیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی شەشەم ڕۆژانی ١٥ تا ٢٤ی گەلاوێژی ١٣٦٢ پێک هات و لەو کۆبوونەوەیەدا ڕۆژی ٢٦ سەرماوەز وەکوو ڕۆژی پێشمەرگەی کوردستان دیاری کرا.

دیاریکردنی ئەم ڕۆژە ڕێزدانان بو خەباتی بێ وچانی پێشمەرگە بوو کە لە پێناوی ئازادی و بەختەوەریی گەلدا گیانی دەبەخشی، ناوێک کە ناسراوی هەموو دنیای ئازاد و چقڵی چاوی دوژمنانی ئازادی و کونەپەرەستانە.

بۆ دیاریکردنی ڕۆژی پێشمەرگە ئەگەر عەمەلیاتی هێزی پێشمەرگە لە دژی سوپای داگیرکەر وەکوو پێوانە لە بەرچاو گیرابا، هەموو ڕۆژێک دەبوو بە ڕۆژی پێشمەرگە و کومیتەی ناوەندی بۆ ئەو مەبەستە پێویست بوو ڕۆژێک دیاری بکات کە هەم لە باری سیاسی و هەم لە باری مێژووییەوە خاوەنی گرینگی و قورساییەکی زۆر بێت و لە باری نیزامیشەوە سەرکەوتنێکی گەورەی تێدا تومار کرابێ. بەو تێبینییەوە ڕۆژی ٢٦ی سەرماوەز وەکوو ڕۆژی پێشمەرگە دیاری کرا کە لەو ڕۆژەدا لە ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی شارەبانیی مەهاباد وەکوو دوایین بنکەی ڕێژیمی پاشایەتی چەک کرا و دەسەڵاتی سیاسی کەوتە دەستی خەڵک. هەر لەو ڕۆژەشدا بە ڕەسمی سوپای میللی بۆ پاراستنی ئەمنیەت و پارێزگاری لە دەسکەوتەکانی ئەو کات دامەزرا.

هەر لە ئەم شارە و لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا بوو کە ناوی پیرۆزی پێشمەرگە بو چەکداری شۆڕشگێڕ و مافخوازی کورد دیاری کراوە. ئێستا خوشەویستیی پێشمەرگە سنووری بەزاندووە و پێشمەرگە بۆتە هێمای بەرگری لە گەل و ئازادی و هەموو دنیا بە چاوی ڕێزەوە خەباتی پێشمەرگە دەنرخێنن، بۆیە دیاریکردنی ئەو

رۆژە بۆ یادکردنەوە لە خەبات و تێکۆشانی پێشمەرگەکان بڕیارێکی بەجێ و گونجاو بوو.

## ■ ٤٦: پێوەندیی حیزب و کۆمەڵە

بەیاننامەی هاوبەشی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران (١٣٦١)

پاش سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران، حیزبی دێموکرات زۆری هەوڵ دا کە لەگەڵ کۆمەڵە هاوکاری و هاوئاهەنگی بۆ بەڕێوەبردنی ناوچـە ئازادکـراوەکان پێک بێنێ. ئەم بەیاننامەیـە کە لە خوارەوەدا هاتووە، نموونەیەک لەو هەوڵانەی حیزب لەو پێوەندییەدایە:

بەم جۆرە بە ئاگاداریی خەڵکی تێکۆشـەری کوردسـتانی ئێران و هەموو گەلانی ئێرانی دەگەیەنین کە لە رۆژی ٢٧ی پووشپەڕی ١٣٦١ لە نێوان رێبەریی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران و کۆمەڵەی شۆڕشـگێڕی زەحمەتکێشـانی کوردسـتانی ئێراندا کۆبوونەوەیەک پێک هات.

لـەو کۆبوونەوەیـەدا کە بـە گیانی هاوخەباتی لە نێـوان ئەو دوو رێکخراوەیەدا بەسـترا، هەر دوو لا بە درێژی لە سـەر هەلومەرجی سیاسیی ئێستای ئێران و کوردستان گفتوگۆیان کرد. لەو گفتوگۆیەدا هەردوولا رایانگەیاند کە لە سـەر خەباتی شـێلگیر لە دژی رێژیمی جمهوری ئیسلامی و لە پێناوی دابینکردنی رێژیمێکی دێموکراتیک لە ئێراندا و خودموختاری بۆ کوردستان بەردەوامن.

رێژیمی کۆنەپەرستی خومەینی تا ئێستا بێجگە لە بێکاری و گرانی و بێمافی و بێجگە لە خەفەقان و کوشتار و ئیعدامی هەزاران رۆڵەی شۆڕشگێڕی ئێران هیچ بەرهەمی بۆ گەلانی ئێران نەبووە و وڵاتی لە قەیرانێکی ئابووری و سیاسیی چارەنەکراودا نوقم کردووە. هەروەها ئەو رێژیمە جینایەتکارە لە پاش سێ ساڵ پەلاماری دڕندانە بۆ سەر

کوردستان، لەم دواییەدا دەستی داوەتە هێرشێکی تازە بۆ سەر گەلی کورد. ڕێژیم کە لەم سێ ساڵەدا بێجگە لە سەرشۆڕی و ڕیسوایی هیچ بەرهەمێکی لە هێرش بۆ سەر کوردستان وەرنەگرتووە، دەیهەوێ جارێکی دیکە ئیرادەی کۆمەلانی خەڵکی کوردستان تاقی بکاتەوە و بێهودە تێدەکۆشێ تا خەباتی گەلی کورد سەرکوت بکا. ڕێبەریی حیزبی دێموکرات و کۆمەڵە جارێکی دیکەش داوا لە هەموو خەڵکی تێکۆشەری کوردستان دەکەن کە وەک هەمیشە بە ورەیەکی بەرز و بەو پەڕی فیداکارییەوە بە هەموو چەشنێک ئیعتراز و خەباتی خۆیان لە دژی ئەو ڕێژیمە پەرە پێ بدەن و بە هاوکاری لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی قارەمانی کوردستان بەرامبەر بەو هێرشە ڕابوەستن و بەو چەشنە پیلانی ڕێژیم بۆ داگیرکردنەوەی کوردستان پووچەڵ بکەنەوە. ڕێبەریی کۆمەڵە و حیزبی دێموکرات، دڵنیان کە گەلی کورد بە خەباتی یەکگرتووانەی خۆی دەتوانێ کە ئەمجارەش دەرسێکی باش بە بەکرێگیراوانی ڕێژیمی جمهوریی ئیسلامی بدا.

هەر وەها لەو کۆبوونەوەیەدا هەر دوو لا بڕیاریان دا لە پێناوی ڕێککەوتن لە سەر هاوکاری زیاتر و پتەوتر لە باری سیاسی، نیزامیو کۆمەڵایەتییەوە لە نێو خۆیاندا بەو وتوویژانە درێژە بدەن. هەر وەها هەر دوو لا پێیان وایە گەیشتن بەو ڕێککەوتنە دەتوانێ دەورێکی کاریگەری هەبێ لە تێکشکاندنی پەلاماری هێزەکانی ڕێژیمی جینایەتکاری جمهوری ئیسلامی و وەدیهێنانی مافە ڕەواکانی خەڵکی کوردستان.

کۆمیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

کۆمیتەی ناوەندیی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

■ شەڕی حیزبی دێموکرات و کۆمەڵە

حیزبـی دێموکرات بـەردەوام هەوڵی داوە لەگـەڵ کۆمەڵە پێکەوە کوردســتان بەڕێوە ببەن و بۆ ئەم مەبەستە چەند جارێک پێشنیاری پـێ کـردووە کـە پێکەوە هـاوکاری بکـەن. بـەڵام کۆمەڵـە ئامادە نەبـوو واقعییەتی کوردســتان قبووڵ بکا. کاتێـک حیزب دەیگوت بۆ ئیدارەکردنـی کوردســتان، هەڵبژاردنی سـاڵی ٥٩ بکەینە پێوانە، یان ژمـارەی شــەهیدان یان ژمـارەی پێشــمەرگە، لە وەڵامـدا دەیگوت هەڵبـژاردن معیـار نیە، ئەوکات لەگەڵ ئێســتا فەرقـی کردووە و بۆ ژمارەی شــەهیدیش دەیگوت: شــەهیدەکانی ئێوە شــەڕیان نەزانیوە بۆیـە زۆر شــەهید بوون و لە ســەر ژمارەی پێشــمەرگە دەیگوت: پێشــمەرگەی ئێمە بە کەیفییەتن و بە کورتی هیچ پێوانەیەکی قبووڵ نەبوو. حیزب دەیگوت لەو شــوێنانەی کە کۆمەڵە ژمارەیان زۆرترە، بەرپـرس کۆمەڵـە و جێگرەکەی لە حیزب بێ و لەو شــوێنانەی کە حیـزب باڵادەســتە، بەرپرس حیزبـی و جێگر کۆمەڵە بـێ و بە پێی هەرکام لەو معیارانەی ســەرەوە کە پێی باشــە عەمەل بکرێ، بەڵام قەبووڵی نەدەکرد و ڕۆژبە ڕۆژ زەمینەی شــەڕی لە نێوان ئەفرادی خۆیدا بە دژی حیزب پێک هێنابوو.

کۆمەڵە لە کاتی پێکهاتنیەوە، لە مێژووی خۆیدا گۆشەیەکی بە دژی حیزی دێموکرات کردبووەوە و بەردەوام بە دژی حیزبی دێموکرات تەبلیغـی دەکرد و هــەر لە ڕۆژی یەکەمی تێکۆشــانیانەوە نەفەراتی خۆیانیان بــە گیانی دژایەتی لەگەڵ حیزبی دێموکرات بار دەهێنا. بۆ وێنە، لە نامیلکەیەکی نێوخۆیی کە لە ڕێکەوتی ٢٠ی خەرمانانی ١٣٦١ لــە لایــەن ڕێبەرایەتیی کۆمەڵەوە بۆ ئەندامانــی کۆمەڵە چاپ و بڵاو کرایەوە، ڕەســمەن حیزبی دێموکراتیان بە دوژمنی کۆمەڵە لە قەڵەم دابـوو و لە نامیلکەیەکدا کە بە قەڵەمـی یەکێک لە ڕێبەرانی کۆمەڵە، کە یەکێک لە ئەندامانی دەفتەری سیاســیان بوو، نووسرابوو «ئەوە

کـە حیزبی دێموکرات بە سـەر کوردسـتاندا زاڵ بێ یـان کۆماری ئیسـلامی، لـە ماهیەتی ئەمر فـەرق ناکا» و لەم رووەوە نووسـەر بـەو ئەنجامە گەیشـتبوو کە شـەڕ کردن دژ بە حیزبـی دێموکرات، بە بەراورد لەگەڵ شـەڕ کردن دژ بە کۆماری ئیسلامی ئەولەویەتی هەیـە و بە راشـکاوی دەڵێ: «دەبێ بە تـەواوی هێزمانەوە زەربەی هەرچـی توندتـر لە حیزبی دێموکـرات بدەین و لـەم حاڵەتەدا نابێ بـە لە دەسـت دانی یەک یا چەند ناوچەیەک لـە بەرانبەری کۆماری ئیسلامیدا ترسمان هەبێ».

لە ژمارەی ۱۵ی بڵاڤۆکی «کۆمۆنیسـت»دا بە قەڵەمی سـکرتێری حیزبی کۆمۆنیست، «عبدالله مهتدی»، پاش جنێو و بوختانێکی زۆر دەستی داوەتە تیئۆری بافی و هێرش دەکاتە سەر حیزبی دێموکرات و پاش باسـکردن لە نفووز و قودرەتی پرۆلتاریا (کە زاهیرەن دەبێ مەبەسـتیان خۆیـان بێ) کە بـێ چوونو چرا خوازیـاری موجازاتی حیزبی دێموکراتە، دەنووسێ: «لە کوردستاندا لەگەڵ سێگۆشەیەکی سیاسـی ـ چینایەتی بەرەوڕووین، سێگۆشـەیەک کە دوو گووشەی بورژوازی و گۆشەیەکی پرۆلتاریا پێکی دێنێ». لە روانگەی عەبدوڵلا موهتەدییـەوە دوو گووشـەی بورژوازییەکـە کۆماری ئیسـلامی و حیزبی دێموکراتە و گۆشەی پرۆلتاریا بریتییە لە کۆمەڵە!

پاش ئەمە عەبدوڵلا موهتەدی وا لە کۆمەڵە دەکا کە بۆ بەدەستهێنانی رێبەریـی کۆمەڵـە تێبکۆشـن و لێی زیاد دەکا و دەڵـێ: لێرە ئێوە لە بەرانبـەر بورژوازیـی خۆماڵـی (خـودی)، یانی حیزبـی دێموکرات بـەرەوڕوو دەبـن. ناوبـراو لەدرێـژەی وتەکانیـدا دەڵـێ: «حیزبی دێموکرات تورمۆزی رێگای پەرەپێدان و قووڵکردنەوەی جووڵانەوە بە ئەژمار دێ» و لێی زیاد دەکا کە حیزبی دێموکرات خاڵی لاوازی جووڵانەوەیە و بە دەستوپێی جووڵانەوەدا قورسایی دەکا.

لە نێو بەڵگەنامەکانی کۆمەڵەدا کە پاش شەڕی هەورامان کەوتبوونە

دەستی پێشـــمەرگەکانی حیزب، لە دەرســـەکانی یەکێک لە ڕێبەرانی کۆمەڵەدا بەم چەشنە هاتووە: «حیزی دێموکرات حیزبێکی بورژوایی و دژی شۆڕشـــە و دژی شۆڕشـــیش بوون، بە کردەوە لە بەرانبەر شۆڕشدا ڕاوەستانە.»

بارهێنانـــی نەفەراتـــی کۆمەڵە بەم گیانە چەندین شـــەڕی ناوچەیی لـــێ کەوتەوەو کۆمەڵە لە هەر جێگایەک خۆی بەهێز دیتبا، هێرشـــی دەکردە ســـەر حیزبی دێموکرات و بە وتەی ڕێبەرانیان، زەربەیان لە بورژوازی دەوەشـــاند. لە باقی شوێنەکان کە لاواز بوون، دەیانگوت ئەوان کاریان بەو شەڕانەوە نیە. بۆیە بۆ پێشگیری لە شەڕی زیاتری کۆمەڵـــە بـــە دژی حیزبی دێموکرات، ڕێبەرایەتیـــی حیزب بڕیاری دا کـــە ئەگەر جارێکـــی دیکە کۆمەڵە لـــە هەر ناوچەیـــەک هێرش بکاتە سەر پێشـــمەرگەکانی حیزب، لە هەموو شـــوێنێک وڵامی دەدرێتەوە و ئەم بڕیارە زۆرتر مەبەســـتی پێشگیرانەی هەبوو کە لە ڕۆژنامەی کوردستان ژمارەی ٩٩دا ئەم بڕیارە ڕاگەیەندراوە.

دواییـــن تێکهەڵچـــوون لـــە نێـــوان کۆمەڵـــە و حیزبـــی دێموکرات، تێکهەڵچوونی ٢٥ی خەزەڵوەر، لە شاری نەوسوود بوو کە شەڕەکە بەم شـــێوەیە ســـاز بوو کە لە نەوســـوود پاش دەرگیرییەکی لەفزی لـــە نێوان پێشـــمەرگەکانی کۆمەڵە و حیزبـــدا، کۆمەڵە تەقە لە یەکێک لـــە فەرماندە بەوەجەکانی هێزی شـــاهۆ بە ناوی «وەلی عەیوەزی» دەکەن کە ســـەرلکی ئەو لکە لە پێشـــمەرگەکان دەبێ کە لە شـــاری نەوســـوود نیشتەجێن و «وەلی» شـــەهید دەبێ. پاش شەهیدبوونی «وەلـــی» شـــەڕ لە نێوان کۆمەڵە و حیزبدا دەســـت پـــێ دەکات و لە ماوەیەکی کورتدا مەقەڕەکانی کۆمەڵە لە هەورامان کۆ دەکرێنەوە و چەند کەس لە کۆمەڵە دەکوژرێن.

پـــاش ئـــەم ڕووداوە، ڕێبەرایەتیـــی حیزب دەســـتبەجێ بە کۆمەڵە ڕادەگەیەنێ کە ئامادەیە لە مەسەلەکە بکۆڵدرێتەوە و بۆ ئەم مەبەستە

وەفـدی هاوبەش پێک بێنن کـە کۆمەڵەش قبـووڵ دەکا و وەفدێکی هاوبـەش لـە نێوان کۆمەڵە و حیزب بۆ لێکۆڵینەوە لە شـەڕەکە پێک دێ. لـە لایەن حیزبی دێموکراتەوە «مسـتەفا شەڵماشـی»، ئەندامی کۆمیتەی سیاسی و «مامۆستا گۆران (حسن ایوب زادە)»، بەرپرسی قەزایـی حیزب و لە لایەن کۆمەڵـەش «عمر ایلخانی زادە»، ئەندامی دەفتەری سیاسـی و «چاوە شیخ الاسـلام» و هەروەها نوێنەرێکی یەکیەتیی نیشتمانی وەکوو ئەندامی ئەو وەفدە دەستنیشان کران.

وەفدەکـە بـە زووتریـن کات بـۆ لێکۆڵینـەوە لە هـۆی پێکهاتنی دەرگیرییەکە، بـەرەو هەورامان دەکەوێتە ڕێ. بەڵام لەم لاوە رادیۆ کۆمەڵە بە شـانتاژکردن و هەڕەشـە و گوڕەشە جەوەکە ڕۆژبەڕۆژ ئاڵۆزتـر دەکات و ڕێبەرایەتیـی کۆمەڵـە لـە ڕێـگای رادیۆکەیانەوە رادەگەیەنـن کـە کۆمەڵە لە حیزبی دێموکرات تۆڵـە دەکاتەوە و لەم پێوەندییەدا نیگەرانی پەرەگرتنی شەڕ لەگەڵ حیزبی دێموکرات نیە.

وەفدی پێکهاتوو هێشـتا ئاکامـی لێکۆڵینەوەکەی خۆی نەدابوو بە ڕێبەرایەتیی حیزبەکان کە حیزبی دێموکرات بۆ نیشـاندانی حوسنی نیەت بۆ ئاسـایی کردنەوەی وەزعەکە قەبووڵی کرد کە مەقەڕەکانی کۆمەڵە بگەڕێنەوە بۆ نەوسـوود و شـوێن و جێگایان پێ بدرێتەوە. ڕێبەرایەتیـی کۆمەڵەش لەم حوسـنی نیەتەی حیـزب کەڵکی خراپی وەرگرت و بە پێی گەلاڵەیەکی لە پێش دارێژراو دیسـان بە سـوئی ئیسـتیفادەکردن لـە (نێوی شـەو)ی هاوبەش کە لەسـەر ڕێنوێنیی ڕێبەرایەتیی حیزب بە کۆمەڵە درابوو، شەوی ٦ی ڕێبەندانی ١٣٦٣ی هەتـاوی، هێرشـێکی زۆر ناجەوامێرانەیان کردە سـەر مەقەڕەکانی حیزب و ١٨ کەسیان شەهید کرد و ژمارەیەکی زۆرتریشیان بریندار کرد. خەڵکی ناوچە و هێزی بەرگری لەگەڵ هێزی شاهۆ پاش وێکەوتنی ئەم زەربەیە لەو هێرشە ناجەوامێرانەیە، هێرشیان کردە سەر هێزی هێرشـکەری کۆمەڵە و ١٤ کەسیان کوشتن کە جەنازەکەیان بە جێ

ما و کۆمەڵەشـیان راو نا و لە ناوچــە پاکیان کردنەوە. ڕێبەرایەتیی کۆمەڵە ئەم هێرشەی بۆ سەر حیزب بە زەبری پرۆلتاریا لە پەیکەری بورژوازی باس دەکرد و شانازیی پێوە دەکرد.

شەڕی حیزب و کۆمەڵــە چەند ساڵ درێژەی کێشا و لــەو شــەڕانەدا سەد مەخابن ســەدان نەفەر لە هەر دوو لا شەهید بوون و ژمارەیەکــی زۆرتــر وازیــان لە شــۆڕش هێنــا. دیارە پــاش ئەم شــەڕە کە کۆمەڵە خۆی بە ســەرکەوتوو دەزانــی، داوای وتووێژی بێقەیدوشــەرتی دەکرد. حیزبــی دێموکراتیش دەیگوت وتووێژ دەبێ تەزمینێکی هەبێ، دەبێ زەمینەیەک ساز بکرێ کە جارێکی دیکە شەڕ ســەر هەڵ نەداتەوە و بۆ ئەم مەبەســتە پێویستە کۆمەڵە بۆچوونی خــۆی کە دوژمنایەتی لەگەڵ حیزبــی دێموکراتە، بگۆڕێ تا جارێکی دیکە زەمینەی شــەڕێکی نوێتر ســاز نەبێتەوە. بەڵام کۆمەڵە ئەمەی قبــووڵ نەبــوو و ئەو شــەڕانە ئەوەندەیان درێژە کێشــا کە کۆمەڵە لــە «سێگووشــەی شــلێر» کــۆ کرانــەوە و ئیتــر نەیاندەتوانی لەو سێگووشــەیەدا دەرکەون و دەرکەوت ئەوەی کە ئەوان حیســابیان بۆ کردبوو کە بە دوو زەربە حیزبی دێموکرات لە مەیدان دەر بکەن و خۆیان بە ســەر جووڵانەوەدا زاڵ بن، دروست لە ئاو دەر نەهات. لەم نێوانەدا کاســەیەکی داختر لە ئاشیش پەیدا ببوو کە لەو شەڕەدا خۆیــان بە بێلایــەن دەزانی، بــەڵام مەوازعی کۆمەڵەیــان گرتبوو و ناوی خۆیان نابوو ٦ جەرەیانی سیاســی و ئەوانیش داوایان دەکرد ئاگربەســتی بێقەیدوشــەرت رابگەیەنرێ. ئەو شەش جەریانە بریتی بوون لە «شێخ عیزەدین حسەینی»، چریکە فیداییەکانی گەلی ئێران، شۆڕشی رزگاریدەری گەلانی ئێران(ئارخا) و...

پێویســت بــە گوتنــە، لــە پــاش دەرچوونــی بڕیارنامــەی ٥٩٨ و راوەســتانی شــەڕی ئێران و عێراق، حیزب لە بەیاننامەیەکدا داوای لە حیزبە سیاســییەکان کــرد کە بۆ رووخاندنــی ڕێژیمی خومەینی

هاوکاری بکەن و یەک بگرن و لەوە بەدوا دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکرات بە هێزی پێشمەرگەی خۆی ڕاگەیاند کە هێرش نەکرێتە سەر کۆمەڵە و تەنیا لە بەرانبەر هێرشی کۆمەڵەدا دیفاع لە خۆ بکرێ تا سەرەنجام لە ڕێکەوتی ١٧ی بانەمەڕی ساڵی ٦٩دا حیزب یەکلایەنە شەڕی لەگەڵ کۆمەڵە ڕاگرت و بەدوای ئەوەدا کۆمەڵەش شەڕی ڕاگرت و کۆتایی بە شەڕ هات.

■ ڕاگەیەندراوی هاوبەشی حیزبی دێموکرات و کۆمەڵە

لە درێژەی دیدار و دانیشتنە هاوبەشەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران بۆ باس و لێکدانەوە و تاوتوێکردنی پرسە گرینگەکانی ناوچە و پێوەندیدار بە مەسەلەی ئێران بە گشتی و کوردستان بەتایبەتی، هەروەها لە درێژەی باسەکان بۆ گەڵاڵە کردنی ڕێککەوتنامەیەکی هاوبەش بۆ هاوکاری و هاودەنگی نێوانیان کە ماوەیەک بوو لە لایەن هەیئەتی ڕاسپێردراوی هەر دوو لاوە کاری بۆ دەکرا، ڕۆژی سێشەممە ڕێکەوتی ٣١ی گەلاوێژی ١٣٩١ی هەتاوی بەرامبەر بە ٢١ی ئووتی ٢٠١٢ی زایینی، هەیئەتێکی ڕێبەریی هەر دوو لا لە بنکەی دەفتەری سیاسیی حیزبی دێمۆکرات بە سەرپەرەستیی بەڕێزان عەبدوڵڵای موهتەدی سکرتێری گشتیی کۆمەڵە و مستەفای هیجری سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکرات کۆ بوونەوە.

دوو هەیئەت لە دانیشتنێکی ٥ سەعاتی دا وێڕای باس لە پرسە گرینگەکان، بارودۆخی ئێران و ناوچە و کوردستان، باسەکانی پێشوویان لە سەر گەڵاڵەی ڕێککەوتننامە بۆ هاوکاریی نێوانیان درێژە دا و بەم شێوەیە ئەو ڕەوتەیان بە ئاکامی کۆتایی گەیاند و ڕێککەوتننامەکە لە لایەن بەڕێز کاک مستەفای هیجری و بەڕێز کاک عەبدوڵڵای موهتەدییەوە واژۆ کرا.

هەروەها هەر دوو لا هیوایان خواست کە نێوەرۆکی ئەو ڕێککەوتننامەیە زەمینەخۆشکەر بێ بۆ هاوکاریی بەرینتری هێزە سیاسییەکانی کوردستانی ئێران.

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران

١٣٩١/٥/٣١ی هەتاوی

٢٠١٢/٨/٢١ی زایینی

دەقی ڕێککەوتننامەی نێوان کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بەم شێوەیە:

ڕێککەوتننامەی هاوبەش

ئەم ڕێکەوتننامە لە نێوان حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران ئیمزا دەکرێ و لەوە بەدواوە لە هەر جێگایەکی ئەم ڕێکەوتننامەیەدا کۆمەڵە و حیزبی دێموکرات دێ، مەبەست لەو دوو ڕێکخراوەیە.

پێشەکی:

بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران، سالانێکی زۆرە کە قۆناغە جیاوازەکانی خەباتی پڕ هەوراز و نشێوی خۆی تێپەڕ کردووە. بەرەنگاریی نەتەوەیی و قوربانیدان و شەهیدبوونی هەزاران ڕۆڵەی فیداکار لە پێناو سەلماندنی شوناس و مافە سیاسییەکانی نەتەوەی کورد کە لە سەرووی هەموویانەوە دەستەبەر کردنی مافی دیاریکردنی چارەنووسە، ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە.

بۆ خەباتی گەلی کورد لە سەردەمی ئێستا و لەم بارودۆخەدا، هەم ئاڵوگۆڕە جیاوازەکانی جیهان و هەم ئاڵوگۆڕەکانی ئەم دواییانەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، هەروەها هاوسەنگیی هێزەکان و هاوکێشە

نوێیەکانی ئەم پانتاییە، زیاتر لە هەمیشە بواری بۆ هێنانە ئارای ویستە نەتەوەییەکانی گەلی کورد و پێداگریی زیاتر لەسەر مافەکانی لە ئاستی جیهانیدا رەخساندووە.

باهۆزی گۆڕانخوازی و دێموکراسیخوازیی جەماوەری لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەهێزتر لە هەر کاتێک، کۆڵەکەی دیکتاتۆرییەکانی بەرەو رووخان پاڵناوە. درەنگ یان زوو دیکتاتۆریی کۆماری ئیسلامی، بە بەردەوامبوونی خەباتی کۆمەڵانی خەڵک و ئیرادەی قایمی تێکۆشەرانی رێگای ئازادی، لە وڵاتی ئێرانیش ئاسۆیەکی جگە لە پەرەسەندنی قەیرانی فرە رەهەندی ئابووری و سیاسی و رۆیشتنی بەرەو رووخانی یەکجارەکی بۆ بەدی ناکرێت.

ئۆپۆزیسیۆنی ئێران و گرووپ و لایەنە نەیارەکانی کۆماری ئیسلامی لە دەرەوەی وڵات، لە دوو سێ ساڵی رابردوودا، بەدوای سەرهەڵدان و شکستی بزووتنەوەی سەوز لە ئێران، دەورێکی نوێ لە دیالۆگ و دانیشتنی هاوبەش و چالاکییان دەست پێ کردووە. لەم نێوەدا سەرەڕای جیاوازیی روانگە و بیروڕا، هەندێک لێک تێگەیشتنی زیاتر و نزیکبوونەوە تێیاندا لە چاو رابردوو هاتۆتە ئاراوە و بیرۆکەی یەکگرتن و چەشنێک هەوڵدان بۆ پێکهێنانی بەرەی دێمۆکراسیخوازی بە دروشمی گۆڕانی رژێم زیاتر لە پێشوو لایەنگری پەیدا کردووە.

حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، وەک دوو هێزی بە ئەزموون کە لەم ماوەدا لەسەر کۆمەڵێک پرسی گرینگ هاوکاری و کاری هاوبەشیان بە ئەنجام گەیاندووە، لە درێژەی رەوتی روو لەگەشەی ئەم لێکنزیکبوون و هاوکارییانەدا هەر دوو لا لە سەر ئەو بڕوایەن کە لە هەلومەرجێکی وەهادا، رێککەوتن لەسەر کۆمەڵێک خاڵی بنەرەتیی هاوبەش لە دووتوێی ئەم گەڵاڵەیەدا پێویستییەکی حاشاهەڵنەگرە.

ئەم پلاتفۆرمە هاوبەشـە وەک سـەرەکیترین ئەجێندای سیاسـی لە هەمبەر ئاڵوگۆڕە سیاسـییەکانی ئەم سەردەمە لە راستیدا گوزارش لە چەشنێک هاوپەیمانی لە نێوان ئەم دوو هێزەدا دەکات.

ئەم رێککەوتننامە هاوبەشە کە لە لایەن رێبەریی هەر دوو حیزبەوە پەسـەند کـراوە، بناغەیەک بۆ کاری هاوبەشـی هـەر دوو لایەن لە بوارەکانی سیاسـی، دیپلۆماسـی، راگەیاندن و هتـد.. دادەرێژێ. لە هەمـان کاتدا بنەمایەکە بۆ تێکۆشـانی هاوبەش بـۆ پەرەپێدانی ئەم رێککەوتننامەیـە و بەدیهێنانـی هاوکاریـی زیاتـر لـە نێـوان باقیی هێزەکانی کوردستانی ئێران.

■ الف) بنەما گشتییەکان:

١. هەر دوو لایەن لە سـەر ئەو باوەڕەن بە بێ رووخانی رێژیمی کۆماری ئیسـلامی بە دیهاتنی دێموکراسـی و مافـە نەتەوەییەکانی گەلانی ئێران و بە تایبەت گەلی کورد دەستەبەر نابێ. هەروەها لەو بڕوایەدان کە نیزامی سیاسـیی داهاتووی ئێران پێویستە سیستمێکی سـیکۆلاری دیموکراتیکی فیدراڵ بێت، بۆیە پێویستە هەر دوو لایەن لە کـۆڕو کۆبوونەوەکان لەگەڵ ئۆپۆزیسـیۆنی ئێرانی و دەرەوە لە سەر ئەم خاڵانە پێداگر بن.

٢. کۆمەڵـە و حیزبـی دێمۆکرات بڕوای تەواویان بـە هەڵبژاردنی ئازادانـەی سیاسـی لە لایەن خەڵکی کوردسـتانەوە هەیە و لە وەها هەڵبژاردنێکـدا بێشـک سـندووقەکانی دەنگـدان بـە سـەرەکیترین سـەرچاوەی مەشـروعییەتی هەموو هێزێکی سیاسی لە کوردستان و بـە بنەمایەکی سـەرەکیی دێمۆکراتیزە کردنـی کۆمەڵگای ئازاد و سەربەستی دەزانن.

٣. هـەر دوو لا بـڕوای تەواویان بە جیایی دین لـە دەوڵەت هەیە و لـەو بڕوایـەدان کە حوکمڕانیی دوارۆژی کوردسـتان و یاسـای بنەڕەتیـی وڵات لـە سـەر بنەمـای پرەنسـیپەکانی دێموکراسـی و

جاڕنامـــەی جیهانیـی مافی مرۆڤ و مافە سیاســی و نەتەوەییەکانی خەڵکی کوردســتان دابنرێت. هەروەها ئازادیــی ئایین و بیروباوەڕە جیاوازەکان لە کوردستان بە مافێکی ڕەوا و حاشاهەڵنەگری هەموو دانیشتوانی کوردستان دەزانن.

٤. هەر دوو لا پێداگری لە سەر یەکسانیی تەواوی مافەکانی ژنان لەگـەڵ پیاوان لە هەموو بوارەکانی سیاســی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، فەرهەنگی، بنەماڵەیی و هتد لە کۆمەڵگادا دەکەن و خۆیان بە پارێزەری یاسای پێشکەوتنخوازانە و مودێڕن و ئینسانی لەو بوارەدا دەزانن و بۆ چەسپاندنی تێدەکۆشن.

٥. کۆمەڵــە و حیزبــی دیموکــرات خۆیــان بە پارێــزەری ئازادیی رادەربڕیــن، ئازادیی نووســین، ئازادیی رۆژنامەگەریی ســەربەخۆ، ئازادیی دروســتکردنی رێکخراوی سیاســی، ئازادیــی دامەزراندنی رێکخراوەگەلــی مەدەنــی و ســینفی وەکوو رێکخــراوەی کرێکاران، ژنــان، خوێنــدکاران، لاوان، موعەلیمان و هتد دەزانن و پشــتگیریی تەواوی یاسایی لە کۆمەڵگادا لێ دەکەن.

٦. هەر دوو لا پشــتگیری و پابەندبوونــی خۆیان بە دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و پاراستنی ژینگەی کوردستان و گونجاندنی ئەو بابەتانە لە یاسای بنەڕەتیدا رادەگەیەنن.

٧. هەر دوو لا پابەندبوونی خۆیان بە چارەســەرکردنی کێشــە و گرفتە سیاسییەکانی نێوانیان لە رێگەی دیالۆگ و بە شێوەی سیاسی و هێمنانە و دوور لە هەر چەشنە توندوتیژییەک دەردەبڕن. هەر وەها ئەم شێوازەش لە نێوان ســەرجەمی هێزە سیاسییەکانی کوردستان بە پێویست دەزانن و بۆ چەسپاندنی ئەو پرەنسیپە لە پانتایی هەموو کوردستان تێدەکۆشن.

٨. حیزبــی دیموکــرات و کۆمەڵــە فێدرالیزمــی نەتەوەیــی ـ جوغرافیایی وەک دروشــمی سەرەکی و بەرنامەی سیاسیی خۆیان

بۆ چارەسەرکردنی ستەمی نەتەوەیی لە کوردستان هەڵبژاردووە و خۆیان بە ئالاهەڵگری ئەم دروشمە دەزانن و کاری هاوبەش بۆ چەسپاندنی دەکەن.

٩. ئەم ڕێککەوتنە پرەنسیپی سەربەخۆیی سیاسی، ڕێکخراوەیی، دیپلۆماسی و ڕاگەیاندنی هیچکام لەم دوو لایەنە خەوشدار ناکات، بەڵکوو هەولاْ دەدات کە هاودەنگی و هاوئاهەنگی لە نێوانیاندا لە پێناو ئامانجە هاوبەشەکان کە لەم پلاتفۆرمەدا هاتووە دەستەبەر بکات.

■ ب) ئەرکەکانی پێش ئاڵوگۆڕی سیاسی و ڕووخانی ڕێژیم

١. ناساندنی کێشەکان و خواستەکانی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران بە کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی و دەستەبەرکردنی پشتیوانیی سیاسی بۆ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورد، بۆ وێنە ڕێکخستنی چالاکیی دیپلۆماتیکی هاوبەش لە ئاستی جیهانی و سەردانی ناوەندە نێونەتەوەییەکان بەم مەبەستە.

٢. بەشداریکردن یان نەکردنی هاوبەش لەگەڵ هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی بە هەماهەنگی و ڕاوێژی پێشوو و پێداگری لە سەر ماف و داوکارییەکانی خەڵکی کوردستان بە ئامانجی بەهێزکردنی پێگەی کورد لە ڕێگەی هەڵوێستی هاوبەش لە کۆنفرانس و سمینارە جیاوازەکان و هەماهەنگی لەم بوارەدا. پێداگری کردنی هەر دوو لایەن لە سەر دروشمی فیدرالیزم وەک ڕێگەچارەی پرسی نەتەوەکانی ئێران لە نێو گوتارە جیاوازەکانی ئۆپۆزسیۆنی ئێران و کەسایەتییە نەیارەکانی کۆماری ئیسلامی. بەهێز کردنی هەڵوێستی هاوبەش و گوتاری پێشکەوتنخوازانەی نەتەوەیی لە کۆنگرەی نەتەوەکانی ئێرانی فیدراڵ و پاراستنی ئەم ڕێکخراوە و ناساندنی بە ڕای گشتیی جیهان. هەوڵدان بۆ دارشتنی سیاسەتێکی هاوبەش لە ئاست ئۆپوزیسیۆنی ئێرانی کە دەربڕی پرەنسیپە ئەساسییەکانی جووڵانەوەی میللی ـ دێموکراتیکی خەڵکی کوردستان و .. بێ.

٣. هەر دوو لا پشـتیوانی لە خەباتی رەوای گەلی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان دەکەن و هاوکات لە سەر ئەو بڕوایەن کە هەر چەشـنە دەسـتێوەردانی پارچەیەک لە پارچەکانی دیکە سیاسەتێکی نەگونجاو و زیانبارە. هەر لەم ئاراسـتەیەدا بۆ پتەوکردنی پەیوەندی و دەسـتەبەرکردنی جێگە وپێگەیەکی شیاوتر بۆ کوردی رۆژهەڵات و رەچاوکردنی سیاسـەتێکی هاوبەش، بە پێی پێویسـت دانیشـتنی هاوبـەش لەگەڵ حکومەتی هەرێم و هێزە سیاسـییەکان لە هەرێمی کوردستان بەڕێوە دەبەن.

٤. کۆمەڵـە و حیزبـی دێمۆکـرات تەبایی و یەکڕیزیـی نەتەوەیی لـە کوردسـتانی ئێـران و پتەوکردنـی هاوخەباتـی لە نێـوان هێزە سیاسییەکانی کوردستانی ئێران بە ئەرکی سەرشانی خۆیان دەزانن و بۆ دیتنەوەی ڕێگاچارەی گونجاو بە مەبەستی لابردنی کۆسپەکانی سەر ڕێگای یەکڕیزی هەوڵ دەدەن.

٥. هـەر دوو لا کۆکـن لـە سـەر ئـەوەی هاوکاریـی دوو قۆڵیی نێوانیـان پەرە پێ بدەن و پتەوتـری بکەن. لەم پێناوەدا هاوکاری لە نێـوان ئۆرگانەکانـی پێوەندیداری هەر دوو لا لـە بواری راگەیاندن، بڵاوکردنـەوەی بەیاننامـەی هاوبەش لە سـەر رووداوە سیاسـییە گرینگەکان و کاری هاوبەش بۆ لەقاودانی سیاسەتە دژی گەلییەکانی رێژیمی کۆماری ئیسلامی یان هەر حەرەکەتێکی مەدەنی و سیاسی، بە شێوەیەکی رێکوپێک هەنگاوی بە کردەوە هەڵدەگرن.

| حیزبی دێموکراتی | کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی |
|---|---|
| کوردستانی ئێران | زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران |
| سکرتێری گشتی | سکرتێری گشتی |
| مستەفا هیجری | عبدالله موهتەدی |

گەلاوێژی ١٣٩١ی هەتاوی، ئووتی ٢٠١٢ی زایینی

■ ٤٧: وەرگیرانی حیزب بە ئەندامی ئینترناسیۆنال سۆسیالیست

لـە درێژەی هەوڵە دیپلۆماتیکەکانی ڕێبەری شـەهید د. قاسـملوو بۆ ناسـاندنی بزووتنـەوەی کورد بە بیروڕای جیهانـی، یەکێک لەو تریبۆنانە کە پێویسـت بوو حیزب خۆی لێـک نزیک بکاتەوە و تێیدا ببێ بە ئەندام، ڕێکخراوی ئینترناسیۆنال سۆسیالیست بوو کە زیاتر لـە ١٥٠ ئەندامـی لـە ڕێکخراوە دێموکـرات و سۆسیالیسـتەکان لە سەرتاسـەری دونیادا هەیە کە بەشـێکی بەرچاو لەو ڕێکخراوانە بە تایبەتی لە ئورووپادا دەسەڵاتیان بە دەستەوەیە و ڕۆڵێکی گرینگ لە دیاریکردنی سیاسەتی جیهانیدا دەگێڕن.

د. قاسـملوو بە هەستکردن بەم گرینگییە بوو کە لە ڕێگای دۆستە ئورووپاییەکانەوە لە سـاڵی ١٩٨٦ بەرانبـەر بە ١٣٦٥ی هەتاوی بۆ یەکەمجار لە کۆبوونەوەی ئەم ڕێکخراوە جیهانییەدا بەشـداریی کرد و لەو کاتەوە تا کاتی شەهیدبوونی هەموو ساڵێک لە کۆبوونەوەکانی ئینترناسـیۆنال سۆسیالیسـتدا بانگهێشت دەکرا و بەشـداریی تێیدا دەکرد و لەم پێوەندییەدا سکرتێری گشتیی یەکیەتیی نیشتمانیش هەر بە هەوڵی د. قاسملوو لە کۆبوونەوەکانی ئینترناسیۆنال سۆسیالیست بەشـدار دەبوو و لە ئاکامی ئەم هەوڵ و تێکۆشـانەی د. قاسملوودا بوو کە لە ٢١ی خەرمانانی ١٣٧٥ی هەتاوی لە بیسـتەمین کونگرەی ئینترناسیۆنال سۆسیالیستدا، حیزب بە ڕەسمی بە ئەندامی چاوەدێر لە ئینترناسیۆنال سۆسیالیست هەڵبژێرا و لە گرووپی کاری کوردان لە ئینترناسیۆنال سۆسیالیستدا بوو بە ئەندام.

کونگرەی یازدەهەمی حیزب بە ئەندام بوونی حیزبی لەم ڕێکخراوە جیهانییەدا بە دەسکەوتێکی گەورە لە قەڵەم دا و سوپاسی هەموو ئەو ڕێکخراوانـەی کرد کە بۆ بە ئەندام بوونی حیزب لەم ڕێکخراوەیەدا دەنگیان پێ داوە.

لە ماوەی بەشـداربوونی حیزبدا، هەمیشە لەم ڕێکخراوەیە وەکوو

تریبۆنێک بۆ گەیاندنی دەنگی حەقخوازانەی خەباتی نەتەوەی کورد بە گوێی دنیا کەڵک وەرگیراوە و لە پێوەندی لەگەڵ پشتیوانیکردن لە ویست و داخوازییەکانی گەلی کورددا شوێندانەریی زۆری هەبووە و لەم پێوەندییەدا ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیست لە پێوەندی لەگەڵ پشتیوانیکردن لە خەباتی نەتەوەی کورددا چەند بڕیارێکی دەرکردوون، بۆ وێنە:

لە رۆژەکانی ٢و ٣ی مانگی دیسامبری ساڵی ١٩٩٤دا کۆبوونەوەی شووورای ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیست لە شاری «بوودابست» پێتەختی «مەجارستان» پێک هات کە هەیئەتێکی حیزبی دێموکراتیش بە سەرپەرەستیی نوێنەری حیزب لە دەرەوەی وڵات لەو کۆبوونەوەیەدا بەشداریی کرد. لەو کۆبوونەوەیەدا شووورای ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیست بڕیارنامەیەکی لەسەر وەزعی کوردستانی ئێران پەسند کرد کە پوختەکەی بەم چەشنەی خوارەوەیە:

«.. ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیست جارێکی دیکە بێزاری و ئیعترازی خۆی سەبارەت بە سەرکوتکردنی بەردەوامی خەڵکی کورد لە کوردستانی ئێران و سەرکوتکردنی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران دەربڕی».

کوژرانی رێبەرانی حیزبی دێموکرات «دوکتور قاسملوو» ١٩٨٩ و «دوکتور شەرەفکەندی» لە ساڵی ١٩٩٢، دروست ماوەیەکی کورت دوای بەشداربوونیان لە کونگرەی ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیستدا نیشانەی ئەو راستییەیە کە مەسەلەی کوردەکانی ئێران لە لایەن ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیستەوە پشتیوانیی لێ دەکرێ.

ئێمە پاکتاوی ئێتنیکی، تۆپباران و ئیقداماتی دوژمنکارانەی دیکە کە لە مانگی مارسی ساڵی ١٩٩٣ بەم لاوە بە درێژایی ناوچە سنوورییەکانی عێراق و ئێران بەڕێوە دەچێ و خەڵکی کوردی ناوچەکەی مەجبوور کردووە بۆ پاراستنی گیانی خۆیان بەرەو

کوردســتانی عێـراق بڕۆن و لەوێـش ســەرەڕای پێکهاتنی هەرێمی ئەمنــی هەوایــی لە لایەن دەوڵەتــە هاوپەیمانەکانــەوە، دەکەونە بەر هێرشــی هێزە نیزامییەکان و فڕۆکە شــەڕکەرەکانی ئێران، مەحکوم دەکەین.

ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیست بە مەسەلەی پێشێلکرانی مافی مرۆڤی خەڵکــی کوردســتان و نوێنەرانــی خەڵــک یانی حیزبــی دێموکراتی کوردســتانی ئێـران، کە لە لایــەن ڕێژیمی ئێرانــەوە بەڕێوە دەچێ، ئیعتراز دەکات. (ماهنامەی راه ازادی، ژمارە ٣٨)

■ مەسەلەی کورد لە «ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیست»دا

لە ڕۆژەکانی ٦و ٧ی دیسامبردا (١٥و ١٦ی سەرماوەز)، شوورای « ئینترناســیۆناڵ سۆسیالیســت» کۆبوونەوەیەکی لە شاری پاریس پێــک هێنا. لەو کۆبوونەوەیــەدا پتر لە ٧٠ دەســتەی نوێنەرایەتی لە هەمــوو ناوچەکانــی جیهان بەشــدارییان هەبوو. هــاوڕێ «دوکتور عەبدولڕەحمان قاســملوو» سکرتێری گشــتیی حیزبی دێموکراتیش کە بە ڕەســمی وەک میوان بۆ ئەو کۆبوونەوەیە بانگهێشت کرابوو، بەشداریی تێدا کرد.

لە کۆبوونەوەی شــوورای ئینترناسیۆناڵ لە پاریسدا، پاش ئەوەی هێندێک بڕیار لەسەر پێوەندیی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و هەروەها وەزعی ئەمریکای لاتین، ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و ئەفریقای باشوور درا، لە سەر پێشنیارێک باس کرا کە لەبارەی وەزعی نەتەوەی کورد پاش وەســتانی تەقە لە نێوان ئێران و عێراقدا خرابووە بەر نەزەری شــوورا و ســەرەنجام پێشــنیارەکە یەکدەنگ پەســند کــرا. دوکتور قاســملوو لە جەرەیانی ئەم باســەدا لەسەر هەلومەرجی گەلی کورد وتارێکی پێشکەش کرد کە لە لایەن بەشدارانی کۆبوونەوەکەوە زۆر بە گەرمی پێشوازیی لێ کرا.

هاوڕێی تێکۆشــەر، کاک دوکتور قاســملوو لــە وتارەکەیدا گوتی:

«گەلی کورد لە مافەکانی دێموکراتیک، نەتەوەیی و ئینسانیی خۆی بێبەشە، یەکێک لە زۆرلێکراوترین گەلانی جیهانە». لە دواییدا ئیشارەی بە قسەکانی سەرۆک کۆماری فەرانسە «میتران» لە کۆبوونەوەی گشتیی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر گەلی کورد کرد و پاش سوپاس گوتی: «گەلی کورد پێویستی بە هاودەردی و پشتیوانیی ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیست و وەهەموو هێز و شەخسییەتە دێموکرات و ئازادیخوازەکانی جیهان هەیە».

«ویلی برانت» سەدری ئەعزەمی پێشووی ئەڵمان و سەرۆکی ئەو کاتی ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیست زۆر بە گەرمی تەئییدی قسەکانی دوکتور قاسملووی کرد و گوتی: «هەلومەرجی خەباتی گەلی کورد سەختە و رێگا دوورە. بەڵام ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیست لە داهاتوودا بە دیفاع لە مافە رەواکانی گەلی کورد ئامادەی هەموو چەشنە هاودەردی و هاوکارییەکە».

ئەمە یەکەم جار بوو رێکخراوێکی بەرینی نێونەتەوەیی کە زیاتر لە ١٠٠ حیزبی سۆسیالیست و دێموکرات لە سەرانسەری جیهان تێیدا ئەندامن و هەر ئێستا چەندین حیزبی سۆسیالیستی ئەندامی ئەم رێکخراوە لە وڵاتی خۆیاندا حکوومەتیان بە دەستەوەیە، پشتیوانیی خۆی لە خەباتی رەوای گەلی کورد بە راشکاوی دەردەبڕێ.

دەقی پێشنیاری پەسندکراو لە لایەن شووورای ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیستەوە بەم جۆرەیە:

ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیست رەزایەتی خۆی لە بەرەوپێشچوونێک کە لە رەوتی ئاشتی لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا پەیدا بووە دەردەبڕێ. تەقە وەستان لە نێوان ئێران و عێراق، لەم بوارەدا جێگای هیواداربیە. ئینترناسیۆناڵ سۆسیالیست لە سەر ئەم باوەڕەیە کە تەواوی گەلانی ناوچە دەبێ لە دەسکەوتەکانی ئاشتی بەهرەمەند بن. سوڵح نابێ

بــە زەرەری گەلان و یەکێک لەوان گەلــی ٢٥ میلیۆنیی کورد تــەواو بێ. بــە لە بەرچاو گرتنی وەزعێک کە پاش وەســتانی تەقــە لە نێوان ئێــران و عێراقدا پێک هاتووە، ئینترناســیۆناڵ سۆسیالیست خوازیاری ئەوەیە کە:

١. مەنشــووری ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان سەبارەت بە مافی مرۆڤ لە کوردستاندا بە ڕێوە بچێ.

٢. مافــی نەتەوەیــی و کەســایەتیی میللیی گەلــی کورد لەو ولاتانــەی کوردیان تێدا دەژی بە ڕەســمییەت بناســرێ و لە بەرچاو بگیرێ.

٣. مەســەلەی کورد ڕێگەچارەی نیزامیی نیە. ئەم مەسەلەیە دەبێ لە ڕێگای ئاشــتیخوازانە و سیاسییەوە چارەسەر بکرێ. بۆیە بەجێیە کە حکوومەتەکان و جوولانەوەی نەتەوەی کورد بۆ چارەســەرکردنی کێشــەی نێو خۆیان و حەللی مەسەلەی کورد ڕێگای وتوویژ بگرنە بەر.

٤. دابینکردنــی دێموکراســی و ئازادیــی تێکۆشــانی حیزبە سیاســییەکان لــەو ولاتانە کــە کوردیان تێــدا دەژی دەتوانێ بە شــێوەیەکی کاریگەر یارمەتی بە چارەســەرکردنی گەلێک گیروگرفت و یەک لەوان مەسەلەی کورد بدا.

پێویستە بگوترێ کە هەر لەم بارەوە ڕادیۆی بی.بی.سی (BBC) لە لەندەن وتوویژێکی لەگەڵ هاوڕێ دوکتور قاســملوو کرد کە شەوی ١٧ی مانگ بڵاو بووەوە.

## ■ ٤٨: بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگری تیرۆریست بوونی ڕێژیمی خومەینی (١٣٦٦)

ڕۆژی ١٦ی سەرماوەزی ساڵی ١٣٦٦، بۆ لەنێوبردنی هاوڕێی تێکۆشەر کاک مەلاحەسەن شێوەسەڵی، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و فەرماندەی هێزی گیارەنگی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، دەزگای جاسووسی و تیرۆری ڕێژیمی ئاخوندی لە شاری سەردەشت بەهۆی چەند بەکرێگیراوی خۆفرۆشی خۆولاتییەوە بۆمبێکی بە هێزی لە شکڵی کتێبێکدا بۆ ناوبراو نارد کە بە داخەوە ئەو بۆمبە لە دەستیدا تەقیەوە و بوو بە هۆی ئەوەی کە هەر دوو چاو و هەر دوو دەستی خۆی لە دەست بدا. چوار کەس کە گومانی بەشداربوون لە هێنانی ئەو بۆمبەیان لێ دەکرا لە لایەن پێشمەرگە ئازا و بەدەستوبردەکانی هێزی گیارەنگەوە گیران و درانە دەستی عەداڵەت کە پاش لێکۆڵینەوە لە کەلێن و قوژبنی کارەساتەکە دوو کەسیان شتێکیان نەکەوتە پێ و ئازادکران. بەڵام دوو کەسەکی دیکە تاوانەکەیان لە سەر سابیت کرا و لە نەتیجەدا بە حوکمی دادگای شۆڕش ئێعدام کران.

جێگای خۆشحاڵییە کە حەسەن شێوەسەڵی گیانی لەو پیلانە تیرۆریستییە دەربرد و ئێستاش لە مەیدانی سیاسی و فیکریدا یەکێک لە تێکۆشەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران و جێگای ڕێز و شانازیی هەموو دڵسۆزانی کورد و ئۆگرانی ئازادی و دادپەروەریی کۆمەلایەتی لە کوردستان و سەرانسەری ئێراندایە.

کردەوەی تاوانبارانەی ڕێژیمی خومەینی و پیلانگێڕانی بۆ تیرۆری کاک حەسەن شێوەسەڵی و تێکۆشەرانی دیکەی حیزبەکەمان هەر لەو کاتەدا کە نیشانەی تیرۆریست بوون و تیرۆریست پەروەربوونی ڕێژیمی خومەینی و دەستوپێوەندییەکانیەتی، بەڵگەیەکی ئاشکراشە

بـۆ دامـاوی و لێقەوماویی ئەو ڕێژیمە دژیگەلییە و نیشـان دەدا کە سـەرباری وەکارخسـتنی هەمـوو ئیمکاناتی ماڵـی و نیزامیی خۆی نەیتوانیـوە و ناتوانـێ لـە بەربەرەکانێی بـەرەوڕوودا خەباتکارانی ڕێـگای ڕزگاریی کوردسـتان بـە چۆکدا بێنێ و بۆیـە ئامادەیە پەنا بۆ هەموو ڕەفتارێکی ناجوامێرانە و هەموو ئاکارێکی دژی ئینسـانی بەرێ.

بەڵام ئەگەر ڕێژیمی تاریکی و نەزانی پێی وایە بە پیلانی تیرۆریستی دژی کاک حەسـەن شێوەسەڵی و هاوسەنگەرەکانی دیکەی دەتوانێ بە ئاواتە چەپەڵەکانی بگا، دەبێ بڵێین خراپ تێ گەیشتووە. گرینگی و بایەخی ڕۆڵە هەڵکەوتووەکانی وەک کاک حەسـەن شێوەسەڵی هەر لـەوەدا نیە کە بۆ خۆیان وەک پێشـمەرگەیەکی کارامە مەیدانیان بە دوژمنانی ئازادی و ئینسـانیەت بەرتەسـک کردۆتەوە، بەڵکوو زیاتر لەوەدایە کە ڕێچکەی خەباتێکی شارەزایانەیان بۆ هاوڕێیانی خۆیان کێشـاوە و لە بەر دەسـتی خۆیاندا بە دەیان و سەدان پێشمەرگەی کارامە و کارزانیان پێگەیاندوە. گەلان هیچ کاتێک ئەستیور و وەجاغ کوێـر نابن و ڕێـگای تێکۆشـەرانی ڕێـگای ڕزگاری هەرگیز کوێر نابێتـەوە و چەکی قارەمانانی وەک حەسـەن شێوەسـەڵی ناکەوێتە زەوی. گەلی کورد و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران زۆری وەک کاک حەسـەن شێوەسـەڵییان لە باوەش خۆیاندا پەروەردە کردووە و زۆری دیکـەش پەروەردە دەکەن. ئەوەندە کـە بۆ کۆتاییهێنان بە حکوومەتـی زۆر و زۆرداری بـەس بن و بتوانـن ئاواتی لەمێژینەی گەلەکەمان وە دی بێنن.

## ■ ٤٩: کۆنگرەی هەشتەم (١٣٦٦)

کۆنگـرەی هەشـتەمی حیزبی دێموکـرات ڕۆژی ٢٨ی بەفرانباری ١٣٦٦ی هەتـاوی لـە شـاری سلێمانی بـە بەشـداریی ١٠١ ئەندام

دەستی بە کارەکانی کرد. دەستووری کاری کۆنگرە لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی ئاسایی بەڕێوە چوو تا نۆرە گەیشتە هەڵبژاردن و دوکتور قاسملوو پێشنیاری هەڵبژاردن بە شێوەی لیستەی فیکسی هێنایە ئاراوە. لێرەدا بوو کە کۆنگرە بە سەر دوو لایەنی «موافق» و «موخالیف»دا دابەش بوو. پاش ئەوەی کە بە شێوەیەکی دێموکراتیک ئەو میکانیزمی هەڵبژاردنە بە پەسەندی کۆنگرە گەیشت، بەشێک لە کادر و پێشمەرگەکانی حیزب کەوتنە دژایەتیکردنی بڕیاری کۆنگرە و بە نادێموکراتیکیان لە قەڵەم دا. ئەم گرووپە هەر ئەو کەسانە بوون کە دواتر لە یەکەم ڕۆژی ساڵی ١٣٦٧ی هەتاویدا بە دەرکردنی بەیاننامەیەک جیابوونەوەی خۆیان لە حیزب ڕاگەیاند و لە نێو خەڵکی کوردستاندا بە «لادەر» ناسران. کۆنگرە هەروەها لە ڕەوتی کاری خۆیدا بڕیارنامەیەکی دەرکرد کە سەرنجی خوێنەران بۆ دەقی ئەو بڕیارنامەیە رادەکێشین:

■ الف: سەبارەت بە باسە نێونەتەوەییەکان

١. درێژەی شەڕی ماڵوێرانکەری ئێرانو عێراق لە لایەن ڕێژیمی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە، مەحکووم دەکەین. حیزبی دێموکرات خوازیاری ئەوەیە کە بڕیارنامەی ژمارە ٥٩٨ی ئەنجومەنی ئاسایش بەڕێوە بچێ و ئاشتیو دۆستایەتیی نێوان گەلانی هەر دوو وڵاتی دراوسێ سەرلەنوێ سەقامگیر بێ.

٢. مافی گەلی فەلەستین لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆی و دامەزرانی وڵاتێکی سەربەخۆ لە خاکی خۆیدا، مافێکی دادپەروەرانە و دێموکراتیکە. لەم پێوەندییەدا بزووتنەوەی کۆمەڵانی خەڵکی فەلەستین لە ناوچە داگیرکراوەکان بە گشتی جێگای هاودەردی و پشتیوانییە. حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ڕێکخراوی ڕزگاریدەری فەلەستین بە نوێنەری ڕاستەقینەی داخوازە ڕەواکانی گەلی فەلەستین دەزانێ.

٣. خەڵکی ئەفغانستان مافی ئەوەیان هەیە سەبارەت بە دیاریکردنی مافــی چارەنووســی خۆیان ئازادانــە بڕیار بدەن. بۆ ئەم مەبەســتە پێویســتە کە هەم ئەرتەشی ســۆڤییەت ئەفغانســتان بەجێ بهێڵێ و هــاوکات دەوڵەتە ســەرمایەدارەکانی ڕۆژئاوا بــە تایبەت ئەمریکا و هەروەها دەوڵەتە دواکەوتووەکانی ناوچە لە یارمەتی و پشتیوانیکردنی تاقمە چەکدارە بەرهەڵستکارەکانی حکوومەت دەست هەڵبگرن.

٤. ڕەوتی چارەسەریی ئاشتیخوازانەی کێشەکانی ئەمریکای لاتین لــە هەر ڕوویەکەوە جێگەی پەســندە و سیاســەتی دەســتێوەردانی دەوڵەتی ئەمریکا لە کاروباری نێوخۆی نیکاراگۆئە و وڵاتانی دیکەی ناوچەکە مەحکوومە.

٥. کۆکردنەوەی هەر جۆرە چەکێکی ناوکی و شیمیایی و لەنێوبردنی یەکجارییان، پێویســتییەکی مێژووییە. لەم پێوەندییەشدا ڕەوتی ڕوو لە گەشەی ئاشتی و ئاسایشی جیهانی لەسەر یەک جێگەی پەسندە.

٦. ڕەوتی دێموکراتیزەبوونی دەســەڵاتی سیاسی کە لە هێندێک لە وڵاتانی جیهانی سێهەم وە بەرچاو دەکەوێ، وەک دیاردەیەکی گرینگی ساڵانی ڕابردووی سەدەی بیستەم جێگەی پەسند و پشتیوانییە.

٧. بێگومان ڕەوتی دێموکراتیزەکردنی یەکیەتیی سۆڤێت و وڵاتانی دیکەی سۆسیالیســتی کاریگەریی باش هەم لە ســەر گەشەکردن و پەرەگرتنی سوســیالیزم و هەم لەســەر ڕەوتی گشــتیی سیاســەتی نێونەتەوەیــی دادەنــێ. لــەم پێوەندییــەدا حیزبــی دێموکــرات کە لە کۆنگرەی شەشــەمی خۆیدا پێ لە ســەر ئەوە دادەگرێ کە ناتوانرێ سۆسیالیزم لە دێموکراسی جیا بکرێتەوە و دەتوانرێ دێموکراسی بە سۆسیالیزم تەواو بکرێ، جارێکی دیکە «سۆسیالیزمی دێموکراتیک» وەک سەنتێزی دێموکراسی و سۆسیالیزم بە تەواوی پەسند دەکا.

■ ب: سەبارەت بە پێوەندییە نێونەتەوەییەکانی حیزب:

٨ بە لە بەرچاو گرتنی سیاســەتی حیزب ســەبارەت بە پێویستیی

پاراستنی سەربەخۆیی بڕیاردان و لەگەڵ پاراستنی هەڵوێستی بنەڕەتی و ڕوانگەی ڕەخنەگرانە، بۆ پەرەپێدان و پتەوکردنی پێوەندیی حیزب لەگەڵ حیزب و ڕێکخراوە پێشکەوتووەکانی جیهان بە گشتی و وڵاتانی سۆسیالیستی بە تایبەتی، هەوڵی بەردەوام بدرێ.

٩. لە پێوەندی لەگەڵ ڕێکخراوە کوردستانییەکان، سیاسەتی پشتیوانیکردن لە بزووتنەوەی میللی ـ دێموکراتیکی نەتەوەی کورد و یارمەتیدانی هێزە دێموکرات و شۆڕشگێڕەکانی کورد جێگەی پەسندە. کۆنگرە ڕێبەرایەتیی حیزب ڕادەسپێرێ کە بە لە بەرچاوگرتنی ئەسڵی دەستێوەرنەدان لە کاروباری نێوخۆیی ئەوان، لەم بوارەدا هەوڵێکی زۆرتر بدا.

■ ج: سەبارەت بە ڕێژیم و شێوەی خەبات کردن لەگەڵی:

١٠. لە چوارچێوەی ڕێژیمی خومەینیدا، هیچ کام لە داخوازە بنەڕەتییەکانی خەڵکی کوردستان، واتە دێموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان وێناچێ دابین بکرێن. هەر بۆیە دروشمی حیزب کە بریتییە لە: «ڕووخانی ئەم ڕێژیمە و دامەزرانی سیستمێکی دێموکراتیک لە جێگەی» هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە.

١١. خەباتی چەکداری شێوەی سەرەکیی خەبات بۆ ڕووخانی ڕێژیمە. بەڵام لە بەرچاوگرتنی شێوەکانی دیکەی خەبات تێکەڵکردنیان لەگەڵ شێوەی خەباتی چەکداری هەلومەرجی ڕووخانی ڕێژیم ئامادەتر دەکا.

■ د: سەبارەت بە پێکهێنانی بەرە:

١٢. پێکهێنانی بەرەیەکی دێموکراتیک ئەرکێکی پێویستی مێژووییە. لەم ڕووەوە پێ لە سەر هەوڵەکانی حیزب کە تا ئێستا دراون دادەگرینەوە و درێژەی ئەم هەوڵانە لە داهاتووشدا بە پێویست زانراوە.

## ■ ۵۰: کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە و دەربازبوونی هێزەکانی حیزب (۱۳۶٦)

لە سەرەتای ساڵی ۱۳٦٦ی هەتاوی و کۆتایی مانگی رەشەمەی ئەو ساڵەدا کۆماری ئیسلامی بە هاوکاریی هێزێ پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی دوای گرتنی زەنجیرە کۆبوونەوەیەک لە کرماشان، بڕیاری هێرش بۆ سەر ناوچەی هەڵەبجە و دەڤەری شارەزوور دا و بۆ تاوتۆێکردنی لایەنی کردەکیی ئەو گەلاڵەیە، بەرەبەرە فەرماندەکانی سپای پاسداران کەوتنە جووڵە و سەردانی بنکەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ئاوایییەکانی «گریانە» و «هاوارە کۆن».

لە لایەکی دیکەوە، ئەندامان و لایەنگرانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە شارە سنوورییەکانی کوردستان و هەڵەبجە و دەڤەری شارەزوور ئەو نهێنییەیان درکاند و دوای پێوەندیگرتنی هاوڕێیانی کۆمیتەی شارستانی هەورامان لەگەڵ بەرپرسانی یەکێتی لەو ناوچەیە، هەواڵی ئەو هێرشەیان پشتڕاست کردەوە.

دوای ئەم دانیشتنە بەرپرسانی کۆمیتەی هەورامانی حیزب، دەفتەری سیاسیی حیزبیان لەم گەلاڵە عەمەلیاتییە ئاگادار کردەوە و کۆمەڵێک رێنوێنییان لە رێبەرایەتیی حیزب وەرگرت. هەر لەو ماوەیەدا رێژیمی ئێران لە سنووری ئاوایییەکانی ناوچەی باینگان و جوانڕۆ، بۆ ئەوەی کە زانیارییەکانی بە ئەرتەشی رێژیمی عێراق نەگاتەوە شەوانە بە نهێنی هێزی هێنابووە شوێنە مەبەستەکانی و کەرەستەی سەربازیشی بۆ ئەو عەمەلیاتە هێنابوو و داپۆشیبوو بۆ کاتی پێویست. هاوکات لەگەڵ ئامادەکارییەکانی فەرماندەرانی سپای پاسدارانی ئێران، لایەنە سیاسییەکانی باشووری کوردستانیش لەگەڵ ئەندامان و دۆستانی خۆیان و چەکدارە کوردەکان کە لەگەڵ رێژیمی عێراق بوون، بە نهێنی پێوەندییان گرتبوو و داوای

هاوکارییان لێ کردبوون. شتێکی دیکەش کە جێی سەرنج بوو، ئەوە بوو کە چەند کەسێک لە بەرپرسانی نیزامی و ئەمنیەتیی عێراقیش لە هەڵەبجە پێوەندییان بە لایەنە ئیسـلامییەکانی نەیاری رێژیمی عێراق و نیشـتەجێ لە ئێران کە بەشـدار لە گەلاڵەی ئەو شەڕەدا بوون، بە تایبەتی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشـی ئیسـلامی (قەرارگای ٩ی بەدر) گرتبوو و ئەوانیش ئاگاداری ئەو هێرشـە بوون و خۆیانیان لێی تێ نەگەیاندبوو و ئامادەکارییان بۆ پێشگرتن بەو هێرشە نەکردبوو.

ئەوە بوو کە شـەوی ٢٣-٢٤ی رەشـەمەی ١٣٦٦ لەم شوێنانەوە هێرشـێکی لـە نـاکاو و بەربـڵاو کرایە سـەر هەڵەبجـە و دەڤەری شـارەزوور و شـەڕێک رووی دا و تاوانێـک خولقا کـە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیـی هەژانـد و زیاتر لە ٥ هەزار کەس لـە خەڵکی هەڵەبجە و شـارەزووری کردە قوربانیـی سیاسـەتەکانی دووژمنانی کورد. لەم عەمەلیاتەدا لەم شـەڕگانەوە هێرشەکانی رێژیمی ئێران بۆ سەر یەکەکانی ئەرتەشی عێراق دەستی پێ کرد.

یەکەم: هێزەکانی رێژیم لە چۆمی سیروان پەڕینەوە و لە ئاواییەکانی «سـازان»، «ریشاو» و «بۆیین» بەرەو بەرزاییەکانی «ملەهومڵە» و «بەفری میری» و «شنروێ» سەرکەوتن.

دووهـەم: لـە رێگـەی ئاوایـی «دڕۆڵـە»وە لـە چۆمی سـیروان پەڕینەوە لە ئاواییەکانی «نەیجەڵە» و «چنار» و «مۆردێن» بەرەو بەرزاییەکانی «مەگرۆ» و «باڵامبۆ» سەرکەوتن.

سـیهەم: لـە ئاواییەکانـی ناوچـەی «تاوگـۆزی» و «ئیمامـی» بـەرەو «قـەڵای شـەمێران» و بەرزاییەکانی زاڵ بە سـەر ناوچەی «دەربەندیخان»دا وەڕێ کەوتن.

چوارەم: لە دڕۆڵەوە، هێزێکی قەرارگای بەدر و سـپای پاسـداران بـەرەو «ئیمامی زامن» و ئاواییەکانـی ناوچەی «نەورۆڵی» وەڕێ کەوتن.

پێنجەم: لە بەرەی مەریوانیشەوە لە بەرزاییەکانی شارۆچکەی «بیارە» و «ئەحمەدئاوا» و چیای «سورین» وەڕێ کەوتن و «پردی زەڵم» کە گەرووی ناوچەی شارەزوور بوو، گیرا.

■شەڕگەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران شەڕگەی بەرگری و بەرخۆدان.

بێجگە لەو شوێنانەی کە ئاماژەمان پێ کردن، شەڕگەی پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکرات بوو کە لە «ئاواییەکانی شێخان» و بەرزاییەکانی «شاخی گاکوژە» و «پەروینی» دەستی پێ کرد. لەم بەرەیەدا بە پێچەوانەی شەڕگەکانی دیکە، پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران زوو لە هێزەکانی دوژمن هاتنە دەست و چەند هێرشی یەک لە دوای یەکیان تێک شکاند و پاشەکشەیان پێ کرد و کەلاکی زیاتر لە چوار سەد کەس لەو هێزانە لە بەرەکانی شەڕدا کەوت و چەکوچۆڵێکی زۆریشیان لێ بە جێ ما، بەڵام لە شەڕگەکانی دیکەدا هێزەکانی رێژیم پێشڕەوییان کرد، بە تایبەتی دوای گیرانی پردی زەڵم و پچڕانی پێوەندیی هێزەکانی عێراق و نەگەیشتنی هێزی یارمەتیدەر، هێزەکانی عێراق بەرگرییەکی ئەوتۆیان پێ نەکرا و لەکارخستنی تۆپخانەی ئەرتەشی عێراق لە ئاوایی «دەڵەمەڕ»یش بە تەواوی ئەو بەرگرییەی لاواز کرد و ورەی یەکینە شەڕکەرەکانی عێراقی دابەزاند و ناوچەکە بە تەواوەتی کەوتە ژێر دەستی هێزەکانی بەرەی کوردستانی و سپای پاسدارانی ئێران. لەو بارودۆخەدا بوو کە رێژیمی عێراق لە بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی ئێران هیوابڕاو بوو و دەستی دایە کیمیابارانی شاری هەڵەبجە و لەو دەڤەرە رۆمەڵخەزایەکی پێک هێنا.

دوای ئەوەی کە هێزەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانیش پشتی بەرەی شەریان لێ گیرا و رەوشی شەڕ لە بەرەکانی دیکە بە زەرەری هێزی پێشمەرگەی حیزب گۆڕا، بەرەو ئاوایی «سەرکەن»

و بەرزاییەکانی «دەرەشێش» پاشەکشەیان کرد و سەر لە نوێ خۆیانیان بە ئامانجی دەربازبوون لەو شەڕە و بەرگریکردن لە ئەگەری هەر هێرشێکی هێزەکانی ئێراندا ڕێک خستەوە. لەو پێوەندییەدا کۆمەڵێک لە بەرپرسانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و حیزبی سۆسیالیستی کوردستان رۆڵێکی زۆر نەتەوەیی و نیشتمانییان گێڕا و چاوساغ و یارمەتیدەرێکی باش بوون.

دوای دەربازبوونی هێزەکانی حیزب کۆمەڵێک بنەماڵە، کادر و پێشمەرگە کەم ئەندامەکانی حیزب لەو ناوچەیە گەڕانەوە بۆ ناوچەی هەورامان و جوانرۆ، چەند بنەماڵەیەکی ناسراویشیان کە پێوەندیی رێکخراوەیی و سیاسییان بە حیزبەوە هەبوو، گیران و رەوانەی زیندانەکانی کرماشان و ورمێ کران و کەوتنە بەر ئازار و ئەشکەنجەی پیاوکوژانی رێژیم. بەڵام رێژیم بە ئەو ئازار و ئەشکەنجەدانەش نەیتوانی بە مەبەستەکانی بگات و کەمترین شوێندانەریی نەرێنیی لە سەر ئیرادەی سیاسی و وەفادارییان بە حیزبی دێموکرات دانەنا. بۆیە دوای ماوەیەک زیندانیکردنیان سەربەرزانە گەڕانەوە نێو بنەماڵە شۆڕشگێڕەکانیان. ئەو پۆلە پێشمەرگە کەم ئەندامەش کە خرانە بەندیخانەی کرماشان، دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر چەند کەسیان ئیعدام کران و گیانی شیرینیان لە رێگەی ئامانجەکانی گەلەکەیاندا بەخت کرد. ئەوانەی دیکەش حوکمی زیندانی درێژخایەنیان بۆ برایەوە، جگە لەو ئازار و مەینەتە کە تووشی ئەندامان و بنەماڵەکان و کادر و پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بوو، لەو شەڕەدا کۆمەڵەش زۆر زیانبار بوو و زیاتر لە ٧٠ کەس لە پێشمەرگەکانی کۆمەڵە بە هۆی ناشارەزایی بە بارودۆخی ناوچەکە و هەڵبژاردنی رێگەیەکی مەترسیدار بۆ دەربازبوون لە ناوچەی «نەورۆلی» و لای «پیرمحەممەد» کەوتنە شەڕ و بە داخەوە شەهید کران. لەو شەڕە نابەرانبەرەدا کە لە شەڕگەی «نەوسوود»

لــە نێوان پێشــمەرگەکانی حیزبــی دیموکراتی کوردســتانی ئێران و هێزەکانی ڕێژیم رووی دا، فەرماندە لکی بەوەجی هێزی شاهۆ، کاک «عێزەت ئەحمەدی» ناســراو بە عێزەتە کوێر شــەهید بوو. لە کاتی دەربازبوونی هێزی پێشمەرگەش لە شارەزوور چەند پێشمەرگەیەک بریندار بوون.

■ ئامانجەکانی شەڕی هەڵەبجە

یەکەم: ئامانجی ڕێژیم بۆ هێرشــکردنە ســەر ناوچەی هەڵەبجە و شــارەزوور بــەو لێکدانــەوە هەڵەیانەی ئەوە بوو کــە ناوچەیەک لە باکــووری عێراق بۆ ئۆپۆزیســیۆنی ئەو کاتی عێراق لە باشــووری کوردستان رزگار بکات و هێزەکانی ئۆپۆزیسیۆنی عێراق لە نێوخۆی عێراقــدا چالاکییەکانیــان پــەرە پێ بــدەن. ئەوەش لە دانیشــتنەکانی بەرپرســانی بەرەی کوردســتانی و ڕێژیمی ئێران لــە کۆبوونەوەی هاوبەشیان لە کرماشان بڕیاری لە سەر درابوو.

دووهەم: لە بارودۆخێکدا کە هێزەکانی ڕێژیمی ئێران لە بەرەکانی شەڕی باشــوور و نێوەڕاســتدا لە بەرانبەر هێرشــە پەیتاپەیتاکانی ئەرتەشــی عێــراق تووشــی تێکشــکان و دامــاوی بــوون، ڕێژیم لە هەوڵی کردنەوەی بەرەیەکی دیکەی شــەڕ لە ناوچە شــاخاوییەکانی کوردستان بە مەبەستی پاشەکشەپێکردنی بەشێک لە هێزەکانی عێراق و سەرقاڵکردنیان بە شەڕی کوردستان و سووککردنی ئەو گوشارە بوو کە لە بەرەکانی باشوور و ناوەڕاستدا لە سەر هێزەکانی بوو.

ســێهەم: هەوڵــی ڕێژیمــی ئێران بــۆ پچڕاندنی ڕێگای ســەرەکیی ســلێمانی ـ بەغدا و پێشــڕەویی هێزەکانی بۆ گرتنی شاخی قەرەداغ و گرتــن و زیــان پێگەیاندنــی چاڵــە نەوتییەکانــی کەرکــووک بوو. هێرشــی هێزەکانی ڕێژیم لە شــەڕی هەلەبجەدا بــۆ گرتنی بەنداوی دەربەندیخــان و پەڕینــەوەی هێزەکانیان لە چۆمی ســیروان بەرەو ئاواییەکانی «ئەحمەد بڕنەو» .. کە دواتر لە لایەن هێزەکانی عێراقەوە

تەفروتوونا کران، هەر بۆ ئەم ئامانجە بوو.

چـوارەم: خاڵێکـی گرینـگ و نهێنـی و رانەگەیەنـدراوی گەلاڵەی هێرش بۆ سەر هەڵەبجە، پێوەندیی بە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە بوو. لە سەرەتای دەستپێکردنی بزووتنەوەی رزگاریخوازیی رۆژهەلاتی کوردسـتانەوە تا ئەو کاتـە ناوچەی هەورامان، جوانرۆ، نەوسـوود و ئاواییەکانی «دەرەتفـێ» و «هاوار» و «هاوارەکۆن» ببوون بە ناوچەیەکی ئازاد و حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران بـۆ راپەڕاندنی کاروباری ئاواییەکانی ئەو ناوچە ئازادە سیسـتمێکی خۆبەڕێوەبەریـی پێـک هێنابـوو، قوتابخانـەی بـە زمانـی کوردی بـۆ قوتابییەکانـی ئەو ناوچەیـە دامەزراند و پۆلێک مامۆسـتای بۆ بەڕێوەبردنـی ئـەو ئەرکـە نەتەوەییە پـەروەردە کـرد، دەرمانگە و خزمەتگوزاریی لەشسـاغیی بۆ دابین کـردن و بازاڕێکی هەنارده و هاوردەی لەگەڵ بازارەکانی هەڵەبجە و.. رێک خسـتبوو و بەرنامەی وەرگرتنـی گومرکـی دانابـوو و ئەمنیەتی ناوچەکە لـە لایەن هێزی پێشـمەرگەوە دابین کرابوو، گرینگییەکی زۆر بە پاراسـتنی ژینگەی ناوچەکە و شوێنی نیشتەجێبوونی بنکە و بارەگەکانی حیزب درابوو، سەرەڕای ئەو هەنگاوە خزمەتگوزارییانە، ئەو ناوچە ببوو بە ناوەندی پێوەندیگرتنـی حیزب لـە بـاری رێکخراوەییەوە لەگەڵ شـارەکانی پارێزگاکانی، سنە، کرماشـان، ئیلام و سەرتاسەری ئێران. بەگشتی ئەو ناوچەیە لەو کاتەدا تەنیا ناوچە لە سەرتاسەری کوردستان بوو کە بە دەستی حیزبی دێموکرات و هێزی پێشمەرگەوە بوو، هەر بۆیە ببوو بە جێی سـەرنجی راگەیەنە گشتییەکان و بەردەوام هەواڵنێران و رۆژنامەنووسـانی بیانی و ئۆپۆزیسـیۆنی ئێرانی سـەردانی ئەو ناوچانەیان دەکرد و باسـی تایبەتمەندییـە دێموکراتیکەکانی حیزبی دێموکرات و شـێوەی ئەو بەڕێوەبەرییە پێشکەوتووەیان دەکرد. ئەم تەبلیغاتـە کە لە راگەیەنەکانـدا بڵاو دەکرایەوە، سـەرەڕای چالاکیە

نیزامییەکانــی هێزی پێشــمەرگە دژی هێزەکانی ڕێژیــم، بە تەواوی ســەرانی ڕێژیمیــان تەنگەتــاو کردبــوو و توانیان لــەم دەرفەتە کە هێزەکانی بەرەی کوردستانیشیان لە هێرشەکەیاندا بۆ سەر هەڵەبجە لەگــەڵ کەوتبوو بۆ گەیشــتن بە ئامانجەکانیان لــەو دەڤەرەدا کەڵک وەرگرن و ئەو هیرشــە بکەن و ناوچەکــە بگرن، حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێرانیش بە ناچــاری لەو قۆناغەدا بەرەو شــوێنەکانی دیکە بنکە و بارەگاکانی بگوازێتەوە و ببێتە لایەنێکی زەرەرمەند لەو شەڕەدا.

خاڵێکی جێی سەرنج لەو بارودۆخە ئاڵۆزەدا ئەوە بوو کە ڕێبەرانی نەمر دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو و دوکتور سەعید شەرەفکەندی لــە ماوەی شــەڕەکەدا لەگەڵ فەرماندەی هێزی پێشــمەرگەی حیزب و بەرپرســانی پلەبەرزی حیزب لەو شــەڕەدا لــە پێوەندیدا بوون و زۆر بە پەرۆشــی چارەنووســی ئەو هێزە بــوون، هەر ئەوەش بوو کە ســەرلەبەیانیی ڕۆژی ١٣٦٧/١/١ی هەتــاوی کاتێک کە ئەو هێزە لــە شــەڕی هەڵەبجە و لەو گەمــارۆ نیزامییە دەرباز بــوو، ڕێبەری مەزن دوکتور قاســملوو بە پیری هێزەکەوە هات و لە کەمپی کوردە ئاوارەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە باریکە، کۆبوونەوەیەکی گەورە و مێژوویــی بــۆ هێزەکە گــرت و پیرۆزبایی ئەو ســەرکەوتنەی کە هــاوکات بــوو لەگەڵ جێژنی نــەورۆز لە خەڵکەکە کردو خۆشــحاڵ بوونــی خۆی و ڕێبەرایەتیــی حیزبی بۆ ئەو ســەرکەوتنە دەربڕی. هــەر لــەو کۆبوونەوەیــەدا هــاودەردی و بــەداخ بوونــی خــۆی لە کیمیابارانــی هەڵەبجــە و شــەهید بوونی زیاتر لە ٥هــەزار کەس لە ڕۆڵە نیشــتمانپەروەرەکانی کورد کە بێبەزەییانە لە لایەن دوژمنانی کوردەوە شــەهید کرابــوون دەربڕی، هــەر لە درێژەی قســەکانیدا ئاماژەی بە شەهیدبوونی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە کرد کە لەو شەڕەدا کەوتنــە کەمینی هێزەکانــی ڕێژیمی ئێران و گیانیان بەخت کرد و بە

بۆنەی ئەم رووداوە زیانبارەشـەوە سەرەخۆشـی و هاودەردیی لە کۆمەڵە کرد.

هـەر لەو رۆژەدا شـتێکی زۆر ناخۆش کـە رووی دا، راگەیاندنی بەیاننامـەی جیابوونـەوەی ئەو کادر و پێشـمەرگانە بـوو کە دژی ئاکامـی کۆنگرەی هەشـتەمی حیـزب بـوون. دوای بڵاوبوونەوەی بەیاننامەی جیابوونەوەکەیان دوکتور قاسملوو وتی ئەو جۆرە کارانە ناتوانێ هەنگاوی تێکۆشەرانی دێموکرات لە خەباتدا شل بکا و کادر و پێشـمەرگەکانی حیزبی دێموکـرات هەر وەک لـە تاقیکارییەکاندا سـەربەرز و سـەرکەوتوو بـوون، لەم بوارەشـدا دەیسـەلمێنن کە ئاڵاهەڵگری راستەقینەی رێبازی دێموکراتن.

لـە دەربازبوونی ئەو هێزەی حیزبدا محەممـەد حاجی مەحموود، سـکرتێری حیزبی سۆسیالیسـتی کوردسـتان، حامیـد حاجی غالی فەرمانـدەی عەمەلیاتـی هەڵەبجە و تێکۆشـەری دێرینی کورد، مەلا فایـق و عومەری بـرای هەڵوێسـتێکی شۆڕشـگێڕانە و نەتەوەییان نواند و تا دوایین ساتەکان هاوکاریی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانیان کرد.

هەر وەها شەهیدی نەمر شەوکەتی حاجی موشیر لە کۆبوونەوەیەکدا لـە «چاوگی باواکۆچـەک» کە رووی کـردە فەرماندەکانی یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان و وتـی: «چیمان پێ دەکرێ بـا بۆ حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بیکەین و شەرمەندەی مێژوو و حیزبی دێموکـرات و کوردی رۆژهەڵات نەبیـن، تەنانەت ئەگەر هەڵەبجەش بە نرخی دەربازبوونی حیزبی دێموکرات لە دەسـت بدەین، بۆ ئێمە سەرکەوتنە».

لە چوار چێـوەی پلانی دەربازبوونی ئەو هێزەدا ناکرێ ئاماژە بە رۆڵـی کادری بەوەجی یەکێتیی نیشـتمانی کاک محەممەد محەممەد ئەمین ناسـراو بە «حەمە سیاسـی» نەکەین کە یەکێک لەو کەسانە

بوو کە تەواوی کاتی بۆ هاوکاریی حیزب تەرخان کرد.

قوربانیدانێکی دیکەی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان لە کاتی بەڕێوەبردنی ئەو ئەرکی نەتەوەیی و نیشتمانییەدا ئەوە بوو کە بە هۆی پێداگریی تێکۆشەری دێرینی گەلی کورد حەمەی حاجی مەحموود، لە کاتی گەڕانەوەیان لە بەڕێکردن و حەوانەوەی کادر و پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتدا لە داوێنی چیای سوورێن لە دەڤەری شارەزوور، دوو پێشمەرگەی قارەمان و بە هەڵمەتی حیزبی سۆسیالیست بە ناوەکانی حاجی عەبدوڵلا سیامێوە، ئامر هەرێمی (٢١)ی حیزبی سۆسیالیستی کوردستان و عوسمان قاینەیجە پێشمەرگەی قارەمانی ئەو حیزبە شەهید بوون کە لە ڕێگای هاوکاری و هاوخەباتی لەگەڵ تێکۆشەرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و ئامانجەکانی گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا گیانی شیرینیان بەخت کرد.

خاڵی دیکە، دەستبەسەرکردنی سیاسەتمەداری گەورەی کورد، دوکتور مەحموود عوسمان بە هۆی هاوکارییەکانی حیزبی سوسیالیست لەگەڵ حیزبی دێموکرات بۆ ماوەی زیاتر لە ٥ ڕۆژ لە لایەن دەزگای ئیتلاعاتی ئێرانەوە بوو کە پێیان ڕاگەیاندبوو حیزبی ئێوە لە هەڵەبجە یارمەتیی حیزبی دێموکراتی داوە، ئەویش بە هۆی سروشتی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری و پێوەندیی لەمێژینەی لەگەڵ دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو و حیزبی دێموکرات، پێی وتبوون من ئاگاداری ئەو مەسەلەیە نیم و ئەگەر شتی واش بووبێ، ئەرکێکی نەتەوەییان ئەنجام داوە. هەر لەو پێوەندییەدا کاتێک کە دوکتور مەحموود چاوی بە بەڕێز حەمەی حاجی مەحموود دەکەوێ، پرسیاری لێ دەکا، ئەویش هەواڵەکە پشتڕاست دەکاتەوە و دوکتور مەحموودیش دەستخۆشییان لێ دەکات.

پێوەندیی سیاسیی هێزەکانی بەرەی کوردستانی و حیزبی

دێموکراتی کوردستانی ئێران، ئەو ئەزموونە بەنرخەی لەو شەڕەدا بە دیاری هێنا، بە دوژمنان و نەیارانی بزووتنەوەی کوردی نیشان دا کە ئەوە هەر ئێوە نین دژی ئێمە یەک دەگرن، ئەگەر کوردیش یەکگرتوو بێ، کە زەروورەتی مێژووییش ئەوەمان لێ دەخوازێ، دەتوانێ پیلانی نەیارانی پووچەڵ بکات و ئێرادەی نەتەوەیی خۆی بنوێنێ، ئەم هاوکارییە و دەیان هاوکاریی دیکە ئەم راستییەی سەلماندووە.

* ئەم وتارە نووسینی بەڕێز محەممەد نەزیف قادری، ئەندامی دەفتەری سیاسیی حیزبە و لە ژمارە ٦٤٩ی ڕۆژنامەی «کوردستان» ئۆرگانی کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێراندا بڵاو بۆتەوە.

## ▪ ٥١: جیابوومنەوەی دوای کونگرەی هەشتەمی حیزب (١٣٦٧)

راگەیەندراوی کۆمیسیۆنی سیاسی ـ نیزامی

لەمەڕ جیابوونەوەی کۆمەڵێک لە ئەندامانی حیزب

رۆژی ١ی خاکەلێوەی ١٣٦٧ چەند کەس لە ئەندامانی حیزب کە پاش کۆنگرەی هەشتەم هیچ چەشنە مەسئوولیەتێکیان لە حیزبدا نەماوە، بەیانیەیەکیان دژی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بڵاوکردۆتەوە و نیشانیان داوە کە ناتوانن لە ریزی حیزبی ئێمەدا بمێننەوە.

بەم بۆنەوە رادەگەیەندرێ کە ئەم چەند کەسەی خوارەوە بەهۆی لەژێر پێنانی پێڕەوی حیزب لەو تاریخەڕا هیچ پێوەندییەکیان بە حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانەوە نەماوە و ئەندامی حیزب نین:

١. حەسەن رەستگار

٢. حوسێن مەدەنی

٣. فەتاح کاویان
٤. نەبی قادری
٥. جەلیل گادانی
٦. سدیق بابایی
٧. عوسمان رەحیمی
٨. ئەبووبەکر راد
٩. عەلی کاشفپوور
١٠. عیسمەت عەبدی
١١. شاپوور فیروزی
١٢. ئیرەج قادری
١٣. کەمالأ کەریمی
١٤. رەحیم محەممەدزادە
١٥. شاپوور شوجاعی فەرد

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران
کۆمیسیۆنی سیاسی ـ نیزامی
١٣٦٧/١/٧

■ هێندێک روونکردنەوە سەبارەت بە ئاکامەکانی کۆنگرەی هەشتەم (١٣٦٧)

١. لە کۆنفرانسەکانی پێش کۆنگرەی هەشتەم، نوێنەرانی کۆنگرە بەشێوەیەکی دێموکراتیک هەڵبژێردرابوون و بە هەق نوێنەری هەموو ئەندامان و کادر و پێشمەرگەکانی حیزب بوون. هیچ کەسیش لە کۆنگرە ئیعتیرازی بە شێوەی هەڵبژاردنی نوێنەران نەکردو مەشرووعیەتی کۆنگرەی نەخستە ژێر پرسیار. کەوابوو کۆنگرە هەم سەلاحییەت و هەم مەشرووعییەتی بڕیاردانی لەسەر هەموو گیروگرفتە سیاسی و تەشکیلاتی و نیزامییەکان و هەروەها لە سەر گۆڕین یا نەگۆڕینی بەرنامە و پێڕەوی نێوخۆ هەبوو.

٢. کۆنگـرە پاش باسـێکی پڕنێوەڕۆک، بە تێکـڕای دەنگ راپۆرتی کۆمیتەی ناوەندیی پەسـند کرد و بڕیاری پێویسـت لە سەر گۆڕینی هێندێـک لـە بەندەکانی بەرنامە و پێڕەوی نێوخـۆی دا و بەم جۆرە یەکیەتیی سیاسیی حیزبەکەمان بە تەواوی دەرکەوت.

٣. لە کۆنگرە پێشـنیار کرا کە بۆ هەڵبژاردنـی کومیتەی ناوەندی، لیسـتی سابیت هەبێ. لە سـەر ئەم پێشـنیارە نوێنەرانی کۆنگرە بە دوورو درێژی وەک موافیق و موخالیف قسـەیان کرد و کۆنگرە بە زۆربەی دەنگ لیستی سابیتی پەسند کرد. چونکە کۆنگرە بەرزترین ئۆرگانی حیزبەکەمانە، بەم شـێوەیە پێشکەشـکردنی لیستی سابیت مەشرووعییەتی تەواوی پەیدا کرد.

٤. شەش کەس لە ئەندامانی پێشووی کۆمیتەی ناوەندیی کە ناویان لە لیسـتی ٢٥ کەسیدا هاتبوو، داوایان کرد ناویان لە لیستەکەدا بێتە دەرێ. ئیستدلالیان ئەوە بوو کە چوونکە دژی شێوەی هەڵبژاردن بە لیستی سابیت دەنگیان داوە، نابێ ناویان لە لیستەکەدا بێ.

٥. لـە ئاکامـدا بە زۆربـەی دەنگ ١٩ کەس بـە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و ٧ کەس بە جێگر هەڵبژێردران.

٦. بـا بزانیـن هـۆی ئەوە کە هێندێک لەو کەسـانە دژی شـێوەی هەڵبژاردن بە لیستی فیکس بوون، چ بوو؟

ئیسـتدلالی ئەم کەسـانە کـە گوایە ئـەم شـێوە هەڵبژاردنە دژی دێموکراسی و دژی پێڕەوی نێوخۆی حیزبە، راست نەبوو. چوونکە لە لایەکەوە لە پێڕەوی نێوخۆدا شـێوەی هەڵبژاردن دیاری نەکراوە و لـە لای دیکـەوە کۆنگرەش وەک بەرزترین ئـۆرگان مافی ئەوەی هەبوو کە پێڕەوی نێوخۆش بگۆڕێ.

ئەوە کۆنگرە بوو کە بڕیاری دەدا ئایا هەڵبژاردن بە لیستی فیکس بێ یان بە شـێوەی تاکەکەس، ئەمە نیشـان دەدا هیچ شـتێکی دژە دێموکراتیک رووی نەداوە و کۆنگرە بە زۆربەی دەنگ بە شێوەیەکی

دیموکراتیک شێوازی هەڵبژاردنی بە لیستی فیکس پەسند کرد.

ڕاستی ئەوەیە زۆربەی ئەوانە دژی لیستەی فیکس وەستان، پێیان وابوو لە لیستەی پێشنیارکراودا ناویان نیە کە بە پێشکەشکردنی لیستەکە چەوتبوونی ئەو بۆچوونە بە تەواوی دەرکەوت.

٧. لیستەکە چۆن ئامادە کرا؟

لە پێشدا کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن لەگەڵ نوێنەرانی هەموو کۆنفرانسەکان کە نوێنەریان بۆ کۆنگرە ناردبوو، پێکەوە دانیشتن و ناوی هاوڕێیانیان بۆ ئەندامەتی و جێگری کۆمیتەی ناوەندی و هەروەها بۆ موشاویر پێشنیار کرد. پاشان ڕاگەیەندرا ئەگەر کەسێک بەشێوەی تاکەکەسی خۆی بۆ کۆمیتەی ناوەندی کاندیدا دەکا، با ناوی خۆی بدا بە کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن، پاش ئەوە کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن بە ڕاوێژکردن لەگەڵ هێندێک لە ئەندامانی بەڕێوەبەری لیستەکەی تەکمیل کرد و لیستێکی ٢٥ کەسیی بۆ کۆمیتەی ناوەندی ئامادە کرد.

پێش تەکمیلکردنی لیستەکە، سکرتێر و چەند کەس لە ئەندامانی دەفتەری سیاسیی حیزب لەگەڵ زیاتر لە ١٠ کەس لە ئەندامانی پێشووی کومیتەی ناوەندی قسەیان کرد بۆ ئەوەی کە ئەندامەتیی کومیتەی ناوەندیی تازە قبووڵ بکەن. بە داخەوە هێندێک لەوانە جەوێکی زۆر نالەباریان ساز کرد و بە سازکردنی تەحریم (ئابستراکسیۆن) ئامادە نەبوون لەگەڵ کومیتەی ناوەندی هاوکاری بکەن. تەنانەت هێندێکیان پاش قبووڵکردن لە سەر فشاری هاوڕێکانیان پەشیمان بوونەوە!

٨. لەگەڵ ئەوەشدا دیسان کۆمیسیۆنی هەڵبژاردن بە دروستی زانی کە ناوی ٦ کەس لەوانە لە لیستەکەدا بۆ ئەندامەتیی کۆمیتەی ناوەندی پێشنیار بکرێن، بەڵام ئەم شەش کەسەش ڕایانگەیاند کە ئامادەی هاوکاری لە لیستەکەدا نین و زۆربەیان سوپاسی کۆمیسیۆنی هەڵبژاردنیشیان کرد.

۹. کۆنگرە بە زۆرینەی دەنگ لیستەکەی پەسند کرد و یەکێک لە هاوڕێیانیش کە بە جیا خۆی کاندیدا کردبوو، وەک جێگر هەڵبژێردرا کە ئەمە خۆی نیشانەیەکی دیکە لە دێموکراتیک بوونی هەڵبژاردنەکە بوو.

۱۰. ئەوانەی دژی شێوەی هەڵبژاردن بە لیستی فیکس بوون، لە ڕاستیدا هیچ ئیستدلالیان نەبوو و نیشانیان نەدا کە بۆچی ئەم شێوەیە باش نیە. تەنیا ئەوەیان دەگوت کە پێشتر لە حیزبی ئێمەدا شێوەی هەڵبژاردنی تاکەکەسی باو بووە و ئەم شێوەیە تازەیە، بەڵام دەبێ بگوترێ حیزبی ئێمە لە هێنانی زۆر شێوەی نوێی تێکۆشانی سیاسی و تەشکیلاتیدا دەستپێشخەر بووە و هەموو جارێکیش پاش ماوەیەک بۆ ئەو کەسانە کە پێشتر قانیع نەببوون، دەرکەوتووە کە ئەوە شێوە تازەیانە چەندە بە قازانجی حیزب بوون. نموونەی ئەم شێوە تازەیانە هێنانی سۆسیالیزمی دێموکراتیک لە کۆنگرەی شەشەمدا بوو کە زۆربەی ئەم کەسانە لە دژی لیستەی سابیت بوون، ئەو کاتیش لە دژی هێنانی سوسیالیزمی دێموکراتیک وەک ئامانجی دوارۆژی حیزب بوون و ئێستا دەردەکەوێ هێنانی سۆسیالیزمی دێموکراتیک لەو هەلومەرجەدا چەندە پێشکەوتوانە و سەردەمی بووە کە ئەودەم لێی تێنەدەگەیشتن.

۱۱. هێنانی لیستەی سابیت لە هەلومەرجێکدا بوو کە ناکۆکی لە کومیتەی ناوەندیدا لە سەر بێکاری و کەمکاری و بێتەفاوتی و نان بە قەرزدان و بێ دیسیپلینی لە لایەک، پرکاری و دڵسۆزی و ئوسوولیبوون و پاراستنی دیسیپلین لە لایەکی دیکەوە بوو لە وەزعی ناسکی ئەوەدەمەدا حیزبێکی شۆڕشگێڕ وەک حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران نەیدەتوانی کە دێموکراسیی دیسیپلینی، نەرمیو ئوسوولیبوون پێکەوە بەرێوە نەچن. ڕاستییەکەی ئەوەیە لەو کاتەدا بەهۆی قوتبێک لە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی کە پێک

هاتبوو و ئەندامانی بێکارە و بێتەفاوت و فورسەت تەڵەبی لە بن باڵی خۆیـدا کۆ دەکردەوە و بووە هۆی بێدیسـیپلینی و دڵسـاردیی زۆر لە هاوڕێیان و هاوکاری زۆر سـەخت و دژوار بوو. هێنانی لیسـتی سابیت لەو هەلومەرجەدا ئەو زەمینەیەی پێک دەهێنا کە لە کۆنگرەدا کەسـانێک بـۆ ئەندامەتیـی کومیتـەی ناوەنـدی هەڵبژێردرێن کە تا ڕادەیەک هەماهەنگیو هاوکارییان هەبێو ئامادە بن بەرپرسایەتییەکان بە ئەسـتۆ بگـرن. دیارە مەبەسـت لـە هەماهەنگی ئـەوە نەبوو کە ئەندامانی کومیتەی ناوەندی لەسەر هەموو گیروگرفتێک یەک نەزەر و یەکدەنگ بن. پێچەوانەوە لە کومیتەی ناوەندیدا نەزەری جیاواز و ناکۆکیی بۆچوون شـتێکی رەوایە. مەبەست ئەوە بوو ناکرێ هێندێ کەس دڵسۆز بن، دیسیپلینیان هەبێ، رۆژ تا ئێوارە کار بکەن، هێندێ کەسـیش بێتەفـاوت، بێ دیسـیپلین بـن و بێکار دابنیشـن. تەنانەت لەوەش زیاتر ببن بە هۆی بڵاوبوونەوەی بێتەفاوەتی و بێدیسیپلینی و بێکاری لە هەموو بەدەنەی حیزبدا.

۱۲. لـە کۆنگـرەی حەوتەمـدا هەرچەنـد ئەندامانـی کومیتـەی ناوەنـدی بەڵێنیان دابوو لە هەر شـوێنێک کاریان بـۆ دیاری بکەن، بەڕێـوەی بەرن. لە یەکەم کۆبوونەوەی پاش کۆنگرەی حەوتەمدا بە بەڵێنییەکەی خۆی پابەند نەبوون. لە ئاکامدا لە ۲۵ ئەندامی کومیتەی ناوەندی ۱۹ کەسیان لە دەوروبەری دەفتەری سیاسی مانەوە. چوار ئەندام و جێگری کومیتەی ناوەندی تەنیا لە فێرگە نیشـتەجێ ببوون کـە زۆربەیان کاریان زۆر کەم بوو. (لـەو کاتەدا حیزب ۱۵ کومیتە شارستانی هەبوو کە پێویسـت بەرپرسەکانیان ئەندامی رێبەرایەتی بـن، هەربۆیە لە کۆنگرە دنگیان پێ درابوو) بوونی لیسـتی سـابیت لەو کاتەدا ئەم گیروگرفتەشـی چارەسەر کردو ئەوانەی کە دەهاتنە ناو لیسـتەکەوە، لە پێشدا دەیانزانی بۆ چ کارێک هەڵبژێردراون و لە ئاکامدا هەرکەس خەریکی کاری دیاریکراوی خۆی دەبوو.

١٣ـ ئەو چەند کەســە بەڵێنیان دا ئەگەرچی نایەنە ناو لیســتەکەوە، بەڵام ئامادەن کار بکەن. بەڵام پاشــان بە قســەکانی خۆیان وەفادار نەمانەوە و دەســتیان دایە تەبلیغات دژی ئاکامەکانی کۆنگرە و ئەو کاتیش سیاســەتی ئێمــە واتە ڕێبەرایەتیی هەڵبژێــردراوی کۆنگرەی هەشتەم بۆ جووڵانەوە لەگەڵ ئەو کەسانە لانی زۆری نەرمی بێلادان لە ئوسوول بوو کە ئەو سیاسەتەشمان بەڕێوە برد.

## ■ ٥٢: بڕیارەکانــی پلینۆمــی حیزب پــاش قبوولکردنی بڕیارنامەی ٥٩٨ لە لایەن خومەینییەوە (١٣٦٧)

پــاش قبووڵــی بڕیارنامــەی ٥٩٨ و خواردنەوەی جامــی ژەهر لە لایەن خومەینییەوە، ئەو مەترسییە هەستی پێ دەکرا کە جووڵانەوەی کورد لە هەموو بەشەکانیدا بکەوێتە تەنگەژە و تەنانەت لەنێوچوون. لــەم هەلومەرجەدا بوو کە ڕێبەرایەتیی حیزبــی دێموکرات، پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندیی خۆی لە ڕەشەمەی ساڵی ١٣٦٧، پێک هێنا و لەو پلینۆمەدا وێڕای لێکدانەوەی هەلومەرجی سیاســیی ئەو دەم و باس لــە ئەگەرەکان و ئەرکەکانی دوارۆژ و پەســەندی بڕیاری درێژەدان بە خەبات لە هەر هەلومەرجێکدا، قەرار درا ئەو باســە بکێشــێتە نێو بەدەنــەی حیزب و پاش وەرگرتنــی ڕای بەدەنە، لە کۆبوونەوەیەکی دیکەدا کە زۆر زوو دەبێ پێک بێت، بڕیاری نەهایی لە سەر شێوەی خەباتی داهاتوو لەو هەلومەرجە دژوارەدا بدرێ.

پاش گەڕانــەوە باس کردنی هەلومەرجەکە کە زۆر زوو کۆمیتەی ناوەندی بۆ کۆبوونەوەی دووهەم کۆبووەوە و پاش باس و نەزەراتی بەدەنە کە لەگەڵ ئەوەی گەلاڵەی حیزب بۆ دوارۆژ لەو کۆبوونەوەدا باس نەکرابوو بەڵام بە خۆشیەوە چەشنە هاوفکرییەک لە نێو بەدەنە و ڕێبەرایەتیدا هەبوو کە بەدەنەش بە بێ ئەوەی گەلاڵەی ڕێبەرایەتی ببینــێ، هەمان نــەزەری ڕێبەرایەتیــی هەبوو. بە کورتــی ئەوەی لە

سەری ساغ بووینەوە ئەوە بوو:

١. لە هەر هەلومەرجێکدا دەبێ خەبات درێژەی هەبێ.

٢. هێزی حیزب بە سێبەش دابەش بکرێت. الف: هێزی ئەکتیڤ لە سنوورەکانی وڵاتدا بمێننەوە و درێژە بە خەباتی چەکداری بە دژی رێژیم بدات. ب: هێزی ژن و منداڵدار و پەککەوتوو لە ئوردوگایەکدا بمێننەوە و خۆیان پێبگەیەنن بۆ هەلومەرجێکی لە داهاتوودا ئەگەر بێتە پێش. ج: ئەندامانی کارای دەفتەری سیاسی برۆنە ئورووپا و دەست بدەنە خەباتی دیپلۆماسی و خولقاندنی هەلومەرجی لەبار بۆ پشتگیری لە خەباتی نێوخۆ.

٣. لەگەڵ هێزە کوردستانییەکانی بەشەکانی دیکە قسە بکرێت لە کاتی یەکگرتنی دوژمنان بە دژی بزووتنەوەی کورد و هێزە کوردستانییەکانیش پێکەوە هاوکاری بکەن.

ئەمە دەقی ئەو بڕیارە بوو کە قەرار بوو بڵاو نەکرێتەوە، بەڵام بە گشتی پاش تەواوبوونی پلینۆم هەندێک خەتی گشتیی لە راگەیەندراوی دەفتەری سیاسی لە ١٨ی رەشەمەی ١٣٦٧دا راگەیەندران.

لە پێوەندی لەگەڵ قبوولی بڕیارنامەی ٥٩٨دا دوکتور قاسملوو دوو نامەی بۆ سکرتێری گشتیی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و بۆ ئێدوارد شواردنادزە ناردووە کە ئەویش لە درێژەی ئەو هەلومەرجەدایە و هەستکردن بەو مەترسییەی پێوە دیارە کە هەڵوێستی حیزبیشی تێدا روون کراوەتەوە.

■ نامە بۆ سکرتێری گشتیی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان (١٣٦٧) ١٩٨٨/٨/٣

نیویورک ـ وڵاتە یەکگرتووەکان

بەڕێز ئاغای پرێز دۆکۆئیلار سکرتێری گشتیی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان!

ئاغای سکرتێر!

نۆ ساڵ پێش ئێستا دەوڵەتی کۆماری ئیسلامیی ئێران شەڕێکی نەخوازراوی بەسەر گەلی کورد لە کوردستانی ئێران داسەپاند کە ئێستاش درێژەی هەیە. ئەم شەڕە کە لە مانگی مارسی ١٩٧٩ بە شێوەی تێکهەڵچوونی ناوچەیی دەستی پێکرابوو لە مانگی ئووتی هەمان ساڵ هەموو کوردستانی ئێرانی کە زیاتر لە ٧ میلیۆن کەسی حەشیمەتە گرتەوە.

لە ماوەی ئەو ٩ ساڵەدا زیاتر لە ٤٠ هەزار کەس لە خەڵکی کوردستان بوونەتە قوربانی و سەدان هەزار کەسیش ئاوارە بوون. هێزە چەکدارەکانی کۆماری ئیسلامی بە کەڵک وەرگرتن لە تازەترین چەک زۆر گوندیان وێران کردووە و بە ماڵ و حاڵی شارنشینەکان و دامەزراوە ئابوورییەکان زیانێکی زۆریان گەیاندووە. دەوڵەتی مەرکەزی بە مەبەستی سەرکوتکردنی خەڵکی کوردستان ٢٠٠ هەزار چەکداری ناردۆتە کوردستان و سێهەزار پایگای نیزامیی لە گوندەکان و شاخ و چیاکانی کوردستان داناوە. هەر ئێستا کوردستانی ئێران بە تەواوی میلیتاریزەیە و بۆتە سەربازخانەیەکی گەورە.

داخوازی خەڵکی کوردستان زۆر سادەیە، ئەوان خوازیاری خودموختاری لە چوارچێوەی ئێراندان و ئەوە مافێکە کە مەنشووری رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بە رەسمییەتی دەناسێ.

کاتێک لە رۆژی ١٨ی ژووئیەدا دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی بڕیارنامەی ژمارە ٥٩٨ی قبووڵ کرد، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران وەک رێبەری بزووتنەوەی کوردستان پێشوازیی لەم کارە کرد. چونکە حیزبی ئێمە هەر لە سەرەتاوە ئەم شەڕەی بە شەڕێکی بێمانا و بێسوود و بە زیان و زەرەری گەلانی ئێران و عێراق دەزانی و لایەنگری کۆتایی پێهاتن و دابینکردنی سوڵح و ئاشتی لەنێوان هەر دوو وڵاتی دراوسێ بوو. بەڵام بە تەواوبوونی شەڕ لە نێوان ئێران و عێراقدا شەڕ لە وڵاتی ئێمە بە یەکجاری کۆتایی پێ نایە. خەباتی

چەکدارانەی خەڵکی کوردستان بە مەبەستی وەدیهێنانی دیموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان هەر وا درێژەی هەیە. ئێمە لەو کاتەدا کە وەک حیزبێکی بەرپرس پشتیوانیی خۆمان لە کۆتایی پێهاتنی کێشەی نێوان ئێران و عێراق رادەگەیەنین و بە راشکاویش دەڵێین کە شەڕ لە وڵاتی ئێمەدا کۆتایی پێنەهاتووە و ئاشتی تەنیا کاتێک هەموو ئێران و سنوورەکانی ئێران و عێراق دەگرێتەوە کە داخوازە رەواکانی خەڵکی کوردستان وە دی بێنن.

ئاغای سکرتێر!

حیزبی ئێمە کە ٤٢ ساڵ رابردووی تێکۆشانی سیاسیی هەیە، هەمیشە دژی رەشەکوژی، بارمتەگرتن، فرۆکە رفاندن و بە گشتی هەموو ئەو کارانە بووە کە ژیانی ئەفرادی غەیرەنیزامی و بێدیفاع بخاتە مەترسییەوە.

حیزبی ئێمە هەمیشە دژی شەڕ و لایەنگری ئاشتی بووە. ئێستا کە دەتانهەوێ ئاشتی و هێمنایەتی باڵ بە سەر سنوورەکانی ئێران و عێراقدا بکێشی، ئەوە ئامانجی ئێمەشە. بەڵام ئەگەر تەنانەت دوو دەوڵەتی ئێران و عێراقیش لە سەری رێک بکەون هەتا کاتێک شەڕ لە کوردستانی ئێران کۆتایی پێنەیە، ئەمە مسۆگەر نابێ. هەر ئێستا بە کیلۆمیتران لە سنووری هاوبەشی ئێران و عێراق لە خاکی ئێران لە ژێر چاوەدێریی پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتدایە. چەند هەزار پێشمەرگە هەمیشە دەتوانن هەرەشە لە ئاشتیی ئەم ناوچەیە بکەن.

ئێوە کە بە ناوی سکرتێری گشتیی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەرکی دیفاع لە مافی مرۆڤ و هەر وەها دیفاع لە مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلانتان لە سەر شانە، بێگومان دەزانن کە شەڕی ئێران و عێراق نابێ لە سەر حیسابی گەلی کورد تەواو بێ. ئێمە رادەگەیەنین کە خەڵکی کوردستان بڕیاریان وایە بە هەموو ئیمکاناتیانەوە لە داخوازە رەواکانیان و مەوجوودییەت و مانی خۆیان دیفاع بکەن.

بـۆ دابینکردنی ئاشـتیی بەردەوام و سـەقامگیرکردنی هێمنایەتی لە ناوچـەدا دەبێ سـەرنج بدرێتـە مەرجەکانی دابینکردنی ئاشـتی لە کوردسـتانیش. هەر بۆیە لـە جێبەجێکردنی بڕیارنامەی ٥٩٨دا دەبێ ئەم مەسەلەش لە دەستووری وتووێژەکاندا بگونجێ.

ئاغای سکرتێر!

مەسەلەی کورد لە ئێراندا مەسەلەیەکی نێوخۆیی نیە. لە کوردستاندا سـەرەتاییترین مافی ئینسانی و میللیی گەلێک پێشێل دەکرێ و ئێوە وەزیفەتانە بە مەبەستی دیفاع لە مافی مرۆڤ و مافی مەوجوودییەتی یەکێـک لە رەسـەنترین و کۆنتریـن گەلانی ئەم ناوچەیـە هەنگاوی پێویست هەڵێننەوە.

ئێمە چاوەڕوانی ئەنجامی کارەکانی ئێوەین و ئامادەیی خۆمان بۆ هاوکاریی تەواو لەم پێناوەدا رادەگەیەنین.

بـەڵام جارێکی دیکە بە راشـکاویی تـەواو رادەگەیەنین کە ئەگەر پێشنیاری ئێمە لە بەرچاو نەگیرێ، حەول و تەقەلای ئاشتیخوازانەی ئێـوە سـەرکەوتنی تەواو وە دەسـت ناهێنێ و بەرپرسـایەتیی ئەم سـەرنەکەوتنەش لە ئەسـتۆی رێکخـراوی نەتـەوە یەکگرتووەکان دەبێ.

بە رێز و حورمەتەوە

عەبدولڕەحمان قاسملوو

سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

■ شـەڕێکی حەماسـیی هێزی پێشـمەرگە پاش کۆتایی شەڕی ٨ ساڵە

پاش کۆتایی هاتنی شـەڕی ئێران و عێـراق زۆر کەس پێی وابوو چالاکییەکانی هێزی پێشـمەرگە دژ بە هێزەکانی رێژیم روو لە کزی و لاوازی دەنێـت و شۆڕشـی کوردسـتانی ئێـران بـە رێبەرایەتیی حیزبـی دێموکـرات کۆتایی پێ دێـت. بەڵام پاش تەنیـا چەند مانگ،

لە شــەڕێکی حەماســیدا لە مەڵبەندی شومالی کوردستان و لە لایەن هێزی ئاگرییەوە ئەو ئەفسانەیە پووچەڵ کرایەوە.

لــە ڕۆژەکانــی ١٧ و ١٨ی ڕەزبــەری ســاڵی ١٣٦٧ چەند مانگێک پــاش خواردنــەوەی جامی ژەهر و قبوولکردنــی بڕیارنامەی ٥٩٨ی ئەنجومەنی ئاسایشــی نەتەوە یەکگرتووەکان لە لایەن خومەینییەوە، لە شەڕێکی حەماســیی ٢ ڕۆژەی پێشمەرگەکانی هێزی «ئاگری»دا لــە ناوچەی ورمێ لەگەڵ هێزێکی چەندهەزار کەســیی ڕێژیم، بە بێ ئــەوەی کە تەنانەت یەک پێشــمەرگەش شــەهید و برینداریش بێت، زیاتر لە ١٢٠ کەس لە هێزەکانی ڕێژیم لە ڕێگای جادەی مەرگەوەر بۆ شــنۆ لە شــوێنێک بە نــاوی «یەک ماڵ» لە نێــوان «ژاراوی» و «ســوورکان» کوژران کە نزیکەی ٣٧ کەســیان لە چەکدارانی سەر بــە گرووهانی جێگیر لە پاســگای گوندی قاســملوو بــوون. مانگێک پاش ئەم چالاکییانە کە ئەو هێزەی پێشمەرگە گەڕایەوە بۆ بنکەکانی حیزب لە کوردســتانی باشــوور، نووســەری ئەم دێڕانە کە ئەودەم بەرپرسی مەڵبەندی شومال بووم، وەکوو نەریتی هەمیشەیی چوومە خزمەت شــەهیدی هەرگیز نەمر دوکتور قاســملوو. لەو بە خزمەت گەیشــتنەدا بوو کە ڕێزێکی زۆری لێ گرتم و دەسخۆشــیی لە کادر و پێشــمەرگەکانی هێزی ئاگــری کرد و فەرمووی ئێوە ئەفســانەی ئاشــبەتاڵتان پووچــەڵ کــردەوە و ئــەم دوو ڕۆژە چالاکییەتــان بە ڕادەی ٢ ســاڵ خەباتی هەموو حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران هەڵدەسەنگێنم.

پاش ئەم چالاکییانە بوو کە ڕەیشەهری، وەزیری ئیتلاعاتی ئەوکات لەگەڵ فەرماندەی ســپای پاســداران هاتنە شــاری ورمــێ و وێڕای ســەرکۆنەکردنی بەرپرسانی پێوەندیدار بەو شەڕەوە لە بەرپرسانی ئیتلاعاتی و ســەربازییەوە بگرە تا بەرپرسانی سیاسی ژمارەیەکیان گۆڕین و بەم شێوەیە دانیان بە شکستی خۆیان و بەهێزبوونی هێزی

پێشمەرگەی حیزبی دێموکراتدا نا.
وێنەی خوارەوە دیمەنێک لە شـایی و هەڵپەڕکێی پێشـمەرگەکانی هێـزی ئاگـری پاش سـەرکەوتن لە شـەڕێکی قارەمانانەدا نیشـان دەدات.



## ■ ٥٣: ڕاگەیەندراوی دەفتەری سیاسی بە بۆنەی پێکهاتنی پلینۆمی کۆمیتەی ناوەندی (١٣٦٧)

هاونیشتمانە بەڕێزەکان!
خەڵکی تێکۆشەری کوردستان!
هاوڕێیانی خۆشەویست!
دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ڕادەگەیەنێ کـە لە ڕۆژەکانی ٩-١٤ی ڕەشـەمەی ١٣٦٧دا پلینـۆم (کۆبوونەوەی بەریـن)ی کۆمیتەی ناوەندی پێک هات و بە سـەرکەوتنەوە کۆتایی بـە کاروباری خۆی هێنا. لە سـەرەتای کۆبوونەوەکەدا پلینۆم گوێی بۆ ڕاپۆرتی دەفتەری سیاسی ڕاگرت کە لەودا هەلومەرجی سیاسیی

ئێستای کوردســتان و ئێران خرابووە بەر لێکۆڵینەوە. پاش باسێکی ورد و بەردرێــژ لــە ســەر ئەو راپۆرتــە پلینۆم راپۆرتــی دەفتەری سیاســیی پەســند کرد و بڕیــاری دا لە ســاڵی ١٣٦٨دا حیزبی ئێمە ئەرکەکانی خۆی لە خاڵە ئەساسییەکاندا بە شێوەی خوارەوە بەڕێوە بەرێ:

١. تێکۆشانی تەشکیلاتی

بایەخدان بە کاروباری تەشــکیلاتی لە ریزی پێشەوەی ئەرکەکانی تێکۆشــەرانی حیزبدایــە و هەر بۆیە پێویســتە بە لــە بەرچاو گرتنی ئەزموونەکانی ساڵانی رابردوو هەوڵ بدرێ کەمو کووڕییەکانی کاری تەشــکیلاتی تا ئەو جێگایەی کە دەگونجێ لە نێو ببرێنو تەشکیلاتێک پێک بهێنرێ کە بتوانێ هەرچی زیاتر وەڵامدەری هەلومەرجی ئێستای خەباتــی حیزبی دێموکرات و گەلی کورد لە کوردســتانی ئێراندا بێ. لــەم بارەوە رێنوێنیی تایبەتی ئامادە کرا کە ئۆرگانە بەرپرســەکانی حیزبی لە جەریانی کاری خۆیاندا بەڕێوەی بەرن.

٢. خەباتی چەکدارانە

درێــژە کێشــانی تێکۆشــانی چەکدارانــەی حیزبەکەمــان دوای تەقەوەســتانی نێــوان ئێران و عێراق نیشــانی دا کە بــە پێچەوانەی پڕوپاگەنــدەی دوژمنــان، جووڵانــەوەی گەلــی کــورد فاکتەرێکــی ســەربەخۆیە و لە هەموو هەلومەرجێکدا توانــای بەردەوام بوون و خەبات لەگەڵ دوژمنی هەیە. بۆیە بڕیار درا تێکۆشــانی چەکدارانەی هێزی پێشــمەرگە لێبڕاوانە درێژەی هەبێ و بۆ ئەم شێوە خەباتەش لە لایەن پلینۆمەوە هێندێک رێنوێنی درا.

٣. تێکۆشانی نێونەتەوەیی

لە ساڵی ١٣٦٧دا دەرەتانێکی باش بۆ ناساندنی داخوازە رەواکانی گەلی کورد بە بیروڕای گشتیی جیهانی پێک هات و دەفتەری سیاسی لەو بوارەدا چالاکییەکی باشی نواند و دەسکەوتی بەنرخی هەبوون.

پلینۆم وێڕای دەربڕینی ڕەزامەندی لە تێکۆشـانی سـاڵی ڕابردووی دەفتـەری سیاسـی داوای کرد کە ئەم چالاکییە لە سـاڵی تازەشـدا بـەردەوام بێ و دەفتەری سیاسـی ئیمکاناتێکی زیاتـر بۆ ئەو کارە تەرخان بکا.

٤. پێوەندی لەگەڵ ڕێکخراو و شەخسیەتەکان

پتەوکردنـی پێوەندیی دۆسـتایەتی و هـاوکاری لەگەڵ ئەو حیزب و ڕێکخراو و شەخسـییەتە ئێرانییانە کە باوەڕیان بە دێموکراسی و خودموختاری هەیە، یەکێک لە ئەرکە گرینگەکانی حیزبە. بۆیە پلینۆم وێڕای پەسـندکردنی سیاسـەتەکانی ڕابردووی حیـزب داوای کرد کـە دەفتەری سیاسـی بۆ پەرەپێدان و پتەوترکردنـی ئەو پێوەندییە هەوڵێکـی زیاتـر بدا و وەک هەمیشـەش پاراسـتنی سـەربەخۆیی بڕیاردانی حیزب و قازانجەکانی گەلی کورد بە مێعیاری سەرەکی لە هەموو پێوەندییەکانیدا دابنێ.

٥. مەسائیلی ماڵی

گیروگرفتەکانی بەشـی ماڵی و مەسـەلەی بوودجەبەندی یەکێکی دیکـە لـە باسـەکانی پلینۆم بـوون. کۆمیتـەی ناوەندی بە گشـتی بوودجەبەندیـی بـە گشـتی بە کارێکی دروسـت و بە کەڵـک دانا و ئامۆژگاریی دا کە ئەم شـێوە کارە لە داهاتووشـدا سـاڵ بە سـاڵ باشـتر و ڕێکوپێکتر بەڕێوە بچێ. لەم بەشـەدا بە پێویسـت زانرا بە پێی ئیمکاناتی حیزب، دابینکردنی پێویسـتییەکانی هێزی پێشـمەرگە سـەرنجێکی تایبەتیـی بدرێتێ. پلینـۆم لەو بارەیـەوە ڕێنوێنییەکانی خۆی دا بە دەفتەری سیاسی.

پاش تەواوبوونی کاروباری پلینۆم بەشداران گەڕانەوە شوێنی کار و تێکۆشانی خۆیان. دەفتەری سیاسی هیواداره هەم بەڕێوەبەرایەتیی حیزب و هەم کادر و ئەندامان و پێشمەرگەکان بە پشتیوانیی بێدرێغی خەڵکی کوردسـتان لـە بەجێگەیاندنی بڕیارەکانـی پلینۆم و هەموو

ئەرکەکانی قۆناخی ئێستای خەبات لە پێناوی وەدیهێنانی دروشمی ئێستای «دێموکراسی بۆ ئێران و خودموختاری بۆ کوردستان»دا سەرکەوتوو بن.

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران
دەفتەری سیاسی
١٨ی رەشەمەی ١٣٦٧

**■ ٥٤: چۆن بوو دوکتور قاسملوو رووی لە وتوویژ کرد و تیرۆر کرا؟ (١٣٦٨)**

یەکەم هۆکاری وتوویژ ئەو سیاسەتە بوو کە حیزبی دێموکرات لە درێژەی تێکۆشانیدا بۆ دەستەبەر کردنی مافەکانی گەلی کورد رەچاوی کردووە و ئەویش چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد لە ئێراندا لە رێگای دانوستانەوە بوو. ئەم دانوستانە کە دوکتور قاسملووی تێدا تیرور کرا، چەندەمین هەوڵی حیزب بۆ چارەسەری مەسەلەی کورد لە رێگای ئاشتییانەوە بوو کە بەداخەوە دەسەڵاتی حاکم ئەقڵیەتی دانوستانی نەبوو.

دووەمین هۆکاری، ئەو بارودۆخە بوو کە کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا لەگەڵی بەرەوڕوو بوو و مەترسیی سات‌وسەودای رێژیمەکان بەتایبەتی رێژیمی کۆماری ئیسلامی و حکوومەتی بەعسی عێراق پاش خواردنەوەی جامی ژەهر لە لایەن خومەینییەوە و قبوولکردنی بڕیارنامەی ٥٩٨ هاتبووە ئاراوە و لەم هەلومەرجەدا دوکتور قاسملوو لە کۆبوونەوەیەکی کومیتەی ناوەندیدا وێڕای لیکدانەوەی بارودۆخەکە پێی وابوو ئێستا کە رێژیم لەگەڵ دوژمنێکی وەک بەعس ئامادە بووە کێشەکانی بە دیالۆگ چارەسەر بکا، هیچ دوور نیە کە بیری لە سەر کوردەکانیش بگۆڕی. هەر لە پێوەندی لەگەڵ ئەم دۆخە هەستیارەدا بوو کە لە کۆبوونەوەی

کومیتــەی ناوەندیدا رایگەیاند زۆرمان هــەوڵ دا بەڵکوو حکوومەتی عێراق لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە تەوافوق بگەن، بەڵام ســەرکەوتوو نەبووین. ئێســتا ئەگەر بێت ئەم دوو دەوڵەتە ســوڵح بکەن، دیارە زۆر دژوارە، وەزعی ئێمەی کورد لە هەموو بەشەکانیدا زۆر خــراب دەبــێ، بۆیە ئێمە ئەگەر تەنانەت بە مافێکی زۆر کەمیش بــێ، دەبێ لەگــەڵ ڕێژیمی ئێران ڕێک بکەوین بــۆ ئەوەی کورد لەو مەترســییە رزگاری بێت. ئەو دوو هــۆکارە بوون کە مەیلی دوکتور قاســملوویان بەرەو لای وتوویژ لەگەڵ ڕێژیمی ئێران راکێشــا. لەو لاشەوە ئێران کە لە توانای یەکخستنی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی لە لایەن دوکتور قاسملوو و هەروەها رۆڵی دوکتور قاسملوو لە بزووتنەوەی کورددا ئاگادار بوو، بە ڕێبەرێکی مەترســیداری دەزانی کە هەرکات دەتوانــێ بۆ ڕێژیمی کۆماری ئیســلامی خەتەرســاز بــێ. هەر بۆیە چەندین جار پلانی تیرۆر کردنی دوکتور قاسملوویان دانابوو. تا ئەو کاتەی کە لە کوردستان بوو، بە هۆی وریایی خەڵک و پێشمەرگەکانی پارێــزەری، ڕێژیــم نەیتوانی بــە ئامانجەکەی بگات، بــەڵام ئۆتریش یەکێک لە وڵاتانی دێموکراتیکی ئۆرووپا بوو کە پێشــتریش چەندین کەســایەتیی ئۆپۆزیســیونی ئێرانی و کوردیان تێدا تیرۆر کرابوو و هەر بە ســات و ســەودا بازرگانییەکانی نێوان وڵاتانی رۆژئاوایی و ئێران چاوپۆشییان لێ کرابوو. هەر ئەو راستییە ڕێژیمی بەرەو ئەوە هــان دا کە پلانی ئەم تیــرۆرە لە وییەن پایتەختــی ئۆتریش بەڕێوە بەرێ. بەو جیاوازییەوە کە تیرۆری ئەمجارە لە ســەر مێزی بە ناو دانوســتان بۆ گەیشــتن بە ئاشــتبوونەوە بەڕێوە چوو کە نموونەی ئەوپەڕی جینایەتکاریی ئەم ڕێژیمەیە.

پــاش ئەم بــاس و لێکدانەوەیە بوو کە کومیتــەی ناوندی، بڕیاری وتوویژ لەگەڵ ڕێژیمی پەسەند کرد و مەشرووعیەت درا بە دەفتەری سیاســی کــە لە ئەگەری بوونــی زەمینەی وتوویژ و دانوســتاندا بۆ

ئاشتی دەستی ئاوەڵا بێ. ئەوە بوو کە بۆ جاری یەکەم دانوستان لەگەڵ ڕێژیم ساڵی ١٩٨٨ دەبێ و بەو ئاکامە دەگەن کە جارێکی دیکە لە ژووئیەی ١٩٨٩دا سەر لە نوێ بگەڕێنەوە بۆ وییەن.

ڕۆژی ١١ی ژووئییە دوکتور قاسملوو هێلێنای خێزانی ئاگادار دەکاتەوە کە بۆ وتوویژ لەگەڵ ڕێژیم هاتۆتە وییەن.

ڕۆژی ١٣ی ژووئییە تیرۆریستەکان کە هەمان وەفدی دانوستانکاری ڕێژیمن، پیلانەکەیان کە تیرۆری دوکتور قاسملوو بوو لە سەر مێزی وتوویژ بەڕێوە دەبەن و «دوکتور قاسملوو، عەبدوڵڵا قادری ئازەر و دوکتور فازڵ ڕەسووڵ» تیرۆر دەکرێن و بە هەر شێوەیەک بووە سەحراڕوودی، ئەندامی وەفدی ڕێژیم بە برینداری لەو ساختمانە کە تیرۆرەکەی تێدا ئەنجام دراوە بە جێ دێڵن و لە ماوەیەکی کورتدا پۆلیسی ئوتریش دەگاتە شوێنی کارەساتەکە و لەگەڵ ئەوەی بە ڕوونی عامیلەکانی تیرۆر دەناسن، بەڵام بەداخەوە تیرۆریستەکان ئیسکۆرت دەکەن و بەرەو تاران ڕەوانە دەکرێن.

وەزیری دەرەوەی ئوتریش دەورێکی زۆری گێڕاوە لە بەدوادا نەچوون و بەلاڕێدا بردنی مەسەلەی تیرۆرەکە و سەرەتا میدیاکانی ئورووپایی وەک bbc و ڕادیۆ فەرانسە و زۆر ڕاگەیاندنی دیکە هەوڵیان دا مەسەلەی تیرۆرەکە بە لاڕێدا بەرن و خستیانە ئەستۆی گرووپێکی توندڕەوی دیکەی کورد و وەکوو کێشەی نێوخۆییان تەبلیغ پێوە کرد کە ئەمەشیان تاوانێکی دیکە بوو کە دێموکراسیی بەرژەوەندیخوازی ڕۆژئاوا دەیەویست قوربانیەکانی جارێکی دیکە قوربانی بکاتەوە، بەڵام سەردەمدارانی تیرۆر و عامیلانی تیرۆر بە ڕادەیەک ڕوون و ئاشکرا بوون بێجگە لە ڕیسوایی بۆ ئەو ڕاگەیانانە و بەرپرسانی ئوتریشی هیچی دیکە نەمایەوە.

تەنیا کەس کە دەتوانی لە ڕێگای یاساوە بەدواداچوونی کەیسی تیرۆری دوکتور قاسملوو بکات، هێلێنا قاسملوو بوو کە ئەویش لە

بیرەوەرییەکانیدا هەر لە کاتی خۆی بەم چەشنە باسی دەکا:

« پۆلیسی ئوتریش زۆر بە خێرایی راستیی رووداوەکەی کەشف کردبوو، پیاوکوژەکان لە راستیدا هەمان بەناو دیپلۆماتە ئێرانییەکان بوون کە لە دانوستانەکاندا بەشدار بوون. کاتێک کە راگەیەنە نێونەتەوەییەکان و بەتایبەتی راگەیاندنی ئوتریش، هەواڵەکەیان بڵاو کردەوە و هەموو لایەک لێی ئاگادار کرایەوە، حکوومەتی ئوتریش تووشی سەرئێشەیەکی گەورە بوو، تاوانباران بە پاسپۆرتی دیپلوماتیک سەفەریان کردبوو و دەوڵەتی ئوتریش بە بیانووی پێوەندیی ئابووری بەرفراوان لەگەڵ ئێران هەبوو، چاوپۆشیی لەو تاوانە گەورەیە کرد».

هێلێنا قاسملوو (نەسرین خانم) وە دوای پەروەندەکە کەوت، وەکیلێکی لاو بە ناوی « مانفرید وایدینگر» وەکالەتی دەکرد و نەسرین خانم سکاڵای لە سەر بەرپرسانی پێوەندیداری ئوتریشی بەم کەیسەوە هێنایە ئاراوە و خوازیاری دادگایی کردن و سزادانی تاوانبارەکان بوو و خوازیاری ئەوەش بوون کە دەزگای دادی ئوتریش راشکاوانە تیرۆریزمی دەوڵەتیی ئێران ئاشکرا بکات. لێکۆڵینەوەکان بەهۆی کارشکێنی و ئاستەنگەکان لە لایەن بەرزترین بەرپرسانی ئوتریشیەوە بە هیچ جێگایەک نەگەیشت و چەندین ساڵی خایاند.

هێلێنا قاسملوو دەڵێ بڕیارم دا سکاڵاکەی بەرمە ئاستێکی بەرزتر و لە دیوانی باڵای ئەو وڵاتە سکاڵا لە سەر حکوومەتی ئوتریش تۆمار بکات، بەڵام لە کۆتاییدا دیوانی باڵای ئوتریش نەک هەر سکاڵای لە سەر حکوومەت رەد کردەوە، بەڵکوو بڕیاری ٨٠ هەزار شیلینگ غەرامە بە سەر هێلێنا قاسملوودا دەسەپێنێ کە لە دژکردەوەیەکدا هێلێنا قاسملوو بەو دیوانە رادەگەیەنێ ئەگەر ناچار بکرێ ئەو پووڵە بدات، ئامادەیە وەک قەرزدارێکی کەمدەست کە

توانای دانەوەی قەرزەکەی خۆی نییە بچێتە زیندان بەڵام ئامادە نیە بــە دەزگایەکی داد پارە بدات کە لایەنگری لــە تیرۆریزمی دەوڵەتی دەکا، بۆیە بەدوای ئەم تەهدیدە ئیتر نەســرین خانم لەم پێوەندییەدا لێپرسینەوەی لێ ناکرێ.

لــەو ماوەیــەدا نەســرین خانــم دەیــان کنفرانســی رۆژنامەوانیی ســەبارەت بەو تیرۆر بەڕێــوە برد و میدیاکانــی ئوتریش دەورێکی زۆر گرینگیان لە زانیاری سەبارەت بەو تیرۆرە بە بیروڕای گشتیی ئوتریش دا.

لە نووســینی نەســرین قاســملوودا « عەبدولڕحمان مرۆڤێک بوو نــەک فریشــتەیەک یان بوونەوەرێکی ئاســمانی و ســەروو مرۆیی، ئەوەی لە ژیانی ئەودا گرینگە، هەر ئەوەیە کە مرۆڤ وەکوو رێنوێن و ڕێگەچارە بۆ بەرەکانی پاش خۆی بە جێی دەهێڵێت. گومان لەوەدا نیــە کە عەبدولڕەحمــان لە زەین و تێگەیشــتنی هاونیشــتمانیەکانی خۆیدا ئالوگۆڕی دروســت کرد و روانگەیانی بە نیسبەت دنیا گۆڕی و هەســتی خەباتکاری و ئۆگریی ژیانی ئازادی لەواندا بەهێز کرد و زیندووتری کردەوە و ئەوە دەسکەوتێکە کە لەو بە جێ ماوە».

هەروەها لە درێژەی بۆچوونەکەیدا دەنووسێ:

«عەبدولڕەحمــان هەوڵی دا چارەیــەک بدۆزێتەوە کە ببێتە هــۆی هێورترکردنــەوەی ئەو دۆخــە نالەبارەی کــە خەڵکی کوردی تێدا دەژیا و رەنگە هەر ئەم هەوڵ و تێکۆشــانەش بۆ دۆزینــەوەی رێگاچارەیەکی گونجاو، بووبێتە هۆی ئەوەی کە چاوپۆشــی لە هیندێک شــت بکات و ئەو خاڵە لە بیر بکات کە تیرۆریســتەکانی سەر بە ئاخوندەکان، سەرەتا دەست دەکەن بە چەواشەکاری و دواتر هەوڵی لە ناوبردنی ئەدەن».

عەبدولڕەحمان کە بە پێی سروشتی خۆی لە سیاسەتدا، مرۆڤێکی بیر تیــژ و دووربین بوو، پێی وابوو دەتوانێ بیرکردنەوەی مەلاکان

بکوژرێت و هەر ئەم بیرکردنەوەش بە نرخی لەدەست دانی گیانی تەواو بوو. بە کوشتنی عەبدولڕەحمان ڕێژیمی مەلاکان نەیانتوانی نەتەوەیەک لە داواکردنی مافەکانی پاشگەز بکاتەوە، ئەوان توانیان مرۆڤێک لە ناوبەرن، بەڵام هزر و ئازادی و دیرۆکی ئەو وەکوو ڕێبەری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ماوەتەوە.

هیلێنا قاسملوو دەڵێ: قاسملوو لە دەفتەری یادداشتەکانیدا ڕەستەیەکی بەناوبانگی « ئاندرێ مالرۆ»ی نووسیبوو کە: «من شەڕم کرد، بەبێ ئەوەی حەزم لە شەڕ بێت».

نەسرین خێزانی دوکتور قاسملوو بەهۆی خۆشەویستیی بۆ دوکتور قاسملوو لە خەباتی نهێنیی حیزبدا زۆر زەحمەتی کێشاوە و لەگەڵ زۆر دژواری و گیروگرفت بەرەوڕوو بووەتەوە و منداڵەکانی دوکتور قاسملووش هەروا تووشی زۆر کەم و کوڕی و گیروگرفت بوون، واتە دوکتور قاسملوو نەک تەنیا خۆی بەڵکوو ژیانی هاوسەرەکەی و منداڵەکانیشی لە پێناوی ئەم خەباتەدا داناوە، بۆ ئەوەی کە خوێنەر ڕادەی ئەم کێشە و گرفتانەی کە بۆی هاتۆتە پێش شارەزا بێت، سەرنجتان بۆ خوێندنەوەی کتێبی «ئوروووپاییەک لە وڵاتی کورداندا» کە بە فارسی و کوردیش وەرگێڕان کراوە، ڕادەکێشم.

■ دەنگدانەوەی شەهید بوونی دوکتور قاسملوو

شەهیدبوونی دوکتور قاسملوو لە نێو کۆڕ و کۆمەڵە جیاجیاکاندا دەنگدانەوەیەکی زۆر بەرینی هەبوو. لە ئوروووپا زۆر کەسایەتیی ناودار کە دوکتور قاسملوویان دەناسی، زۆریان قسە لە سەر کرد. تەنیا ئەوە بەسە کە بڵێین دوکتور بێرنارد کۆشنێر کە دواتر بوو بە وەزیری دەرەوەی فەرانسە، لە بەشێک لە پەیامەکەیدا لە گۆرستانی پێرلاشێز دەڵێ: «دوکتور قاسملوو! کاتێک بیر لە تۆ دەکەمەوە، پێش لە هەموو شتێک لە بزەی سەر لێوت بیر دەکەمەوە، تۆ دەتتوانی بە

هەموو کەسێک و هەموو شتێک پێ بکەنی. لە فەرهەنگی گەورەی تۆ بیر دەکەمەوە، لە روانینەکانی تۆ کە وەک مێژوونووسێک و مرۆڤێکی ئـاگا هەموو شـتێکت لـە بەرچاو بوو و لەوە کەڵکـت وەردەگرت تا لێکدانەوەی جوان پێشـکەش بکەی. تۆ لە جیهانی سـێهەمدا کەسێک بـووی کە لە هەمـوو کەس زیاتر رێزم هەبوو بـۆت. لەو کاتەدا کە پارتیزان و ئازادیخواز و وەفادار بە سـتراتیژییەک بووی، لە کاتێکدا کـە هێڵێکی سیاسـیی لیبراوانـەت بەڕێوە دەبرد، هیچ کات ئەسـڵی مەسەلەکە کە دێموکراسی بوو، لە بەرچاوت ون نەبوو».

مادام میتران، هاوسەری فرانسوا میتران، سەرکۆماری ئەو کاتەی فەرانسـە دەڵـێ: « کەسـایەتیی وەک فەرانسـوا میتـران و دوکتور قاسـملوو لە نێو نەتەوەکاندا بە دەگمەن هەڵدەکەون و ئەوان جێگای لێ فێربوون بۆ کۆمەڵگای خۆیان بوون».

کریس کۆچێرا دەڵێ: « دوکتور قاسـملوو مامۆستایەک بوو، منی لەگەڵ کێشـەی کورد ئاشـنا کرد و لـە زانکۆی سـۆربۆنی پاریس مامۆستای شارستانیەتی کورد بوو».

جاناتان رندل، هەواڵنێری ئەمریکایی دەڵێ: «لە نێو رێبەرانی کورد لە هەموو پارچەکاندا کەسایەتیی دوکتور قاسملوو بێ وێنە بوو».

مێریلا گالیتی، رۆژنامەوان و کوردناسی ئیتالیایی دەڵێ: «خۆرەتاو و مانگ کوژران، بەلام تا هەتاهەتایە بە تاریکیی ئاسمانی دڵەکانمان رووناکی دەبەخشن».

مـارک کـراوس، رۆژنامەنـووس لـە رۆژنامـەی لیبراسـیۆن لە دانیشـتنێکدا لەگـەڵ دوکتور قاسـملوو دەڵـێ: تۆ دەسـاڵ پێش کە یەکترمـان ناسـی، قـەرار بـوو کتێبێک بنووسـی، منیش پرسـیارم کـرد: «کتێبێک سـەبارەت بە تۆ؟ ئەگەر سـەبارەت بـە تۆ بێ زۆر باشـە». وەڵامی دایەوە:» نا سـەرنجی هیچ کەس راناکێشێت، بەڵام ئەگەر سـەبارەت بە مێژووی کورد بێت، دەتوانم لەو بارەوە بابەتی

سەرنجراکێش بخەمە بەر دەستت» بیر لەو کتێبە بکەرەوە.

ئەم رۆژنامەنووسە دەنووسێ: «قاسملوو یەکێک لە بلیمەتترینی ئەو مرۆڤانە بوو کە لە ماوەی کاری رۆژنامەنووسیی خۆمدا ناسیبێتم و خۆم بە ئەمەکداری دەزانم، من لەگەڵ عەبدولڕەحمان و لە سایەی ئەودا کوردەکانم ناسی، لەگەڵ توانا بێ هاوتاکانی ئەم گەلە لە بواری خۆڕاگری و عیشقەکەیان بۆ ئازادی و ژیان ئاشنا بووم و لەوەش زیاتر، رێبەرێکی سیاسیم ناسی کە نموونەی لە سەر ئەم گۆی زەوییە کەمە.

■ لە نێو کۆڕ و کۆمەڵە ئێرانییەکاندا:

عاتیفە گورگین دەڵێ: «دوکتور قاسملوو نەمردووە، هەر هەنگاوێکی لە حەرەکەتی هەڵۆیەکی پێشمەرگەدا، کە وەدیهێنەری ویستەکانی گەلی کوردە، زیندووە».

لە نێو خەڵکی کوردستاندا دەنگدانەوەی شەهیدبونی دوکتور قاسملوو زۆر بەرینتر بوو. زۆر کەس رەشی پۆشی و زۆر کەس شەوان و رۆژان بۆ شەهید گریا. هەستی ژنێکی کورد کە بە فیلمیش تۆمار کراوە، وەک نموونە دێنمەوە، ژنە کوردێکی نەخوێندەوار کە رەنگە زۆر لە سیاسەت شارەزا نەبێ:

« ئێوارە وەختانێ کوڕەکەم هاتەوە بۆ ماڵ، بە دەمدا کەوت و دەگری. لێم پرسی بۆ دەگریت، چی قەوماوە؟ وتی جا چ ماوە بقەومێ؟! وتم بۆ؟ چی بووە؟ کوڕەکەم وتی: باوکی کوردیان شەهید کرد. وتم کێ؟ وتی دوکتور قاسملوو. دەڵێ لەم کاتەدا لە هۆش چووم، کە هاتمەوە هۆش دەزانم شین و شەپۆڕێکە هەر مەپرسە. ئەو شەو تا بەیانی هیچ کاممان لەم ماڵەدا نەخەوتین، هەر گریاین. چەند رۆژی دیکەی بە سەردا تێپەڕی و ئێمە هەروا ناڕەحەت و چاو بە گریان بووین کە چەند پێشمەرگەیەک هاتنە لامان و لێمان پرسین پاش دوکتور

قاسملوو ئێوە چ دەکەن؟ کورد چیی لێ دێ؟ دەڵێ پێشمەرگەکان وتیان: راستە دوکتور قاسملوو زۆر گەورە بوو و شەهید بوونەکەی زەربەیەکی کاری و گورچکبڕی لە پەیکەری حیزب دا، بەڵام حیزب لێبڕاوانە درێژە بە ڕێبازی دوکتور قاسملوو دەدات و ناهێڵێ دوژمنان رۆژی خۆش ببینن و خەوی خۆش لە چاویان بکەوێ. ئەو ژنە دەڵێ کە پێشمەرگەکان وایان وت، هەرچەند دیسان بۆ شەهیدبوونی دوکتور قاسملوو ناڕەحەت بووین، بەڵام سوکناییەک بە دڵماندا هات و وتمان شوکر .. ئەوەمان بیست کە حیزبەکەمان لە سەر درێژەدانی خەبات رادەوەستێ و خەباتەکە ڕێبەری دەکا».

ئەگەر بێت و نموونە بێنینەوە، هەزاران لەم نموونانە لە نێو خەڵکی کوردستاندا روویان داوە، لێرەدا بە هێنانەوەی ئەو نموونەیە کە لە سەر شریتی ویدیۆیی تۆمار کراوە، قەناعەت دەکەین. لە نێو کوردەکانی تورکیەشدا نموونەی ئەم هەستەمان هەبوو. لە دەیان گوندی ئەم ناوچەیە بە رەشپۆشین و گریان و نووسینی نامەی پرسە و سەرەخۆشی بۆ کومیتە و مەڵبەندی شیمال و بە هاتن بۆ لامان و دەربڕینی هەستی هاودەردی، ئەم هەست و سۆزەیان نیشان دەدا.

■ کاندیدابوونی دوکتور قاسملوو بۆ وەرگرتنی خەڵاتی ئاشتیی نۆبێل (١٣٦٨)

لە مانگی ڕێبەندانی ١٣٦٨ی هەتاویدا بە دەستپێشخەریی کۆمیتەی ئۆتریش، دۆستانی گەلی کورد و پشتیوانیی ژمارەیەک لە زانایان و یاساناسەکان، نوێنەرانی پارلەمان و دیپلۆماتەکانی وڵاتانی فەرانسە، ئیتالیا، ئۆتریش، چێکۆسلۆڤاکی، ئاڵمانی فیدراڵ، ئیسلەند بە ئاکادمیای بەخشینی خەڵاتی ئاشتیی نۆبێل پێشنیار کراوە کە بۆ قەدرزانی لە هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوامی لە ڕێگای ئاشتیدا، خەڵاتی ئاشتیی

نۆبێلی ئەو ساڵە بدرێت بە ڕێبەری هەڵکەوتووی گەلی کورد، دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو.

پێشـنیاری کاندیداتـۆری بۆ بەخشـینی ئـەم خەڵاتە بـە دوکتور قاسملوو لەگەڵ ئیستدلال کردن بۆ دانی ئەم خەڵاتە بە ناوبراو هەر وەهـا ئەو پشـتگیرییانەی کە لێی کـراوە بۆ ئاکادیمیـای ناوبراو لە ئۆسلۆ پێتەختی وڵاتی نۆرویژ نێردرا.

لەو پێشـنیارەدا هاتبوو کە: «د.قاسـملوو سـەرەڕای سـەرکوتی بێڕەحمانە و خوێناویی گەلی کورد لە ئێران و ناوچە کوردنشینەکان، بـەردەوام ئامادەیـی ڕێککەوتنی لە خۆی نیشـان داوە و خوازیاری چارەسەری مەسەلەی کوردەکان لە ڕێگای ئاشتیخوازانە و وتوویژی سیاسییەوە بووە. ئەو وەک ئەسڵێکی حاشاهەڵنەگر تیرۆریزمی وەک کەرەستەیەکی گوشـارهێنانی سیاسی ڕەد کردۆتەوە و ویستەکانی لە چوارچێوەی پشـتیوانی لە ناسنامە و مافی کوردەکان هاوئاهەنگ بووە لەگـەڵ جاڕنامـەی نەتـەوە یەکگرتـووەکان و ڕاگەیەندراوی جیهانیـی مافی مرۆڤ». لـە درێژەی ئەم نامەیـەدا هاتووە کە: «بە هۆی پێداگری لە سـەر ئەم هەڵوێسـتە بوو کە لـە ئاکامدا بە نرخی گیانـی تەواو بوو و ئەو کاتێک لـە وییەن لە گەڵ نوێنەرانی ڕێژیمی کۆماری ئیسـلامیی ئێران بۆ گەیشتن بە ئەگەری ڕێککەوتنی ئاشتی لە وتوویژدا بوو، تیرۆر کرا».

### ■ ٥٥: جیابوونەوەی زۆربەی ئەندام و کادرە کوردەکانی دەرەوەی وڵات لە حیزبی توودەی ئێران (١٣٦٩)

ڕۆژی ١٠ی خاکەلێـوەی ١٣٦٩ زۆربـەی ئەندامـان و کادرە کوردەکانی حیزبی تـوودەی ئێران بە دەرکردنی بەیاننامەیەک پاش دەربڕینـی بێهیوایـی خۆیان بەرانبەر بە سیاسـەت و کردەوەکانی حیزبـی تودە و ڕێبەرانی، جیابوونەوەی خۆیان لەو حیزبە ڕاگەیاند.

ئەوە بەیاننامە دوور و درێژە پاش باسکردنێکی تێروتەسەل لە سەر ئاڵوگۆڕەکانی جیهانی هاوچەرخ و داڕمانی جەمسەری کۆمۆنیستی، ئاوڕدانەوەیەک بۆ سەر مێژووی حیزبی توودە، بارودۆخی نێوخۆیی تەشکیلاتی حیزب و دۆخی بەستراوەییان، دێتە سەر هەڵوێستی ئەو حیزبە بەرانبەر بە پرسی نەتەوایەتی لە ئێران و دەڵێ:

«پاش یەکێتیی فەرمایشی لەگەڵ فیرقەی دێموکراتی ئازەبایجان و بە لاسایکردنەوە لە حیزبەکانی تەرازی نوێ، لە بەرنامەی حیزبدا، مەسەلەی نەتەوەکان و مافی ئەوان و لە ریزی ئەو مافانەدا، فورموولی ناسراوی مافی دیاریکردنی چارەنووس، هاتە مەیدانەوە. لەو کاتە بە دواوە، هەڵوێستی حیزبی توودەی ئێران بەرامبەر بە مەسەلەی نەتەوایەتی، یەکێک لە دیاردە هەرە بەرچاوەکانی هەلپەرستی و نان بە نرخی رۆژ خواردن بووە. بە رەسمی ناسین و دانان بە مافی دیاریکردنی چارەنووسدا بە گوێرەی ئوسوول، وەک هەر ماف و ئوسوولێکی دیموکراتیکتر، پێویستە بە بێ گرتنە بەرچاوی کات و شوێن، هەمیشە جێگای داکۆکیی شێلگیرانە بێ. بەڵام حیزبی توودەی ئێران، هەمیشە لە بواری تێئۆرییەوە، دەکەوێتە چاوبەستن و ئەو ئەسڵانە دەسپێرێتە بەر فەرمانی بارودۆخی کاتوسات کە مەبەست لەوەش پێوەندیی رێژیمی دەسەڵاتداری ئێران لەگەڵ ئوردووگای سۆسیالیستی و بەر لە هەمووان یەکێتیی سۆڤیێتە».

لە بەشێکی دیکەدا ئۆگریی کۆمۆنیستەکان بۆ «حیزبی سەرانسەری» بە هۆکاری پاشگەزبوونەوەیان لە مافی دیاریکردنی چارەنووس دادەنێت و دەڵێ: «مافی دیاریکردنی چارەنووس تا جیابوونەوەی تەواو و کەماڵ کە دروشمی کۆمۆنیستەکان بۆ چارەسەری مەسەلەی نەتەوایەتی بوو، گەرچی بوو بە هۆی پێکهێنانی کۆمارەکانی بە

ڕواڵەت سەربەخۆ، بەڵام بە لە ئارادا بووونی فۆرموولەکانی حیزبی سەرانسەری و حیزب و دەوڵەت و بە ناچاری حیزبی سەرانسەری ـ دەوڵەتی سەرانسەری، ناوەڕۆکی راستەقینەی پووچەڵ کرایەوە».

هەروەها باس لەوە دەکات کە هەڵوێستی حیزبی توودە لە هەمبەر پرسی نەتەوایەتی و مافی دیاریکردنی چارەنووس نیشاندەری ساتوسەودا کردنێکی بازاڕی لەگەڵ ئەو چەمکانە بووە و دەڵێ: «هەڵوێستی حیزبی توودەی ئێران لە سەردەمەکانی بەرزبوونەوەی هێزای بزووتنەوە لە سالانی ٢٥.٢٤ و ٤٧.٤٦ و بە تایبەتی دوای شۆڕشی ڕێبەندان، نیشاندەری قووڵی هەلپەرەستی و قوربانیکردنی ئەسڵەکانی بە رواڵەت بیروباوەڕی خۆی لە بەرامبەر قازانج و بەرژەوەندییەکانی رۆژدا بوو. تاقیکردنەوەی دەیان ساڵەی بوون و دەسەڵاتداریی تاکەحیزبی سەرانسەری لە وڵاتی فرەنەتەوەی ئێراندا، فێرمان دەکا کە ئەو چەشنە حیزبانە نەیانتوانیوە هاوکات وەڵامدەری داخوازییەکانی سەرجەم و بەشە تاکە تاکەکانی پێکهێنەری کۆمەڵ بن.

تاقیکردنەوەی شۆڕشی ڕێبەندانیش، جێگایەکە کە دەبێ گەلێک ئەزموونی لێ فێر بین. هەر لەو کاتەدا کە بەڕێوەبەرانی حیزبی توودەی ئێران لە خۆشیی فەزای ئاوەڵەی سیاسی و دەرەتانی دەمەتەقەی تەلەڤیزیۆنی گەشەکە ببوون، کوردستانی خوێناوی و بریندار، لە تاو ئێش و ئازاری خۆی پێچی دەخواردەوە. دێهات ئاگریان تێ بەر دراو چەنگیزەکانی ئیسلامی لە کەلاکان گردیان دروست دەکرد و ئێمە ئەندامانی سەرانسەری، بە کاوێژکردنەوەی خۆشبینییەکان و هێلکێشان و هێلسازییەکانی ناوەندیتی حیزب دەکەوتینە پینەکردنی ئەم کوشتارە بە کۆمەڵانە و ئێمە کە ئاواتێکمان جیا لە چاکە و بەختەوەریی گەلەکەمان نەبوو، بەکردەوە لە تەنیشتی گەلەکەمان نەماینەوە».

لــە درێژەدا دەپەرژێتە ســەر پیلانگێڕییەکانی حیزبی توودە دژ بە بزووتنــەوەی نەتەوەیــی ـ دێموکراتیکی کــورد و حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێــران و دەڵێ: «حیــزب توودەی ئێران لــە ناکۆکی و گیروگرفتــی نێوخۆیی حیزبی دێموکراتی کوردســتان بە مەبەســتی دابینکردنــی هێژموونی خۆی کەڵکی وەرگرت و ئەم کارە لە دواییدا بە شــێوەی داکۆکیکردن لە جیابوونەوەی پێڕەوانی کۆنگرەی چوار خۆی نیشان دا.

جێگای سەرنجە کە دوای هێرش بۆ سەر حیزب، دەمڕاستەکانی ئەو کاتی حیزبی توودەی ئێران بۆ «وجیه‌الملە» نیشــاندانی «کۆنفراسی میللــی» و بــە بیانــووی تەختکردنی ڕێگای پێوەنــدی لەگەڵ حیزبی دێموکــرات، پێڕەوانی کۆنگرەی چواریان کردە قوربانیی سیاســەتی هەلپەرەستانەی خۆیان و لە یەک شەودا «باندی قاسملوو»ی پێشوو بوو بە بەڕێوەبەری بزووتنەوەی نەتەوایەتیی گەلی کورد.

لــە کۆتاییدا ئەو گرووپە چەند خاڵێــک وەکوو هێڵەکانی داهاتووی کاری سیاسیی خۆیان دەخەنە روو و دەڵێن: «ڕێباز و ئاسۆی هەرە گشتیی بزووتنەوەی ئێمە بەو چەشنە دیاری دەکرێ:

ـ ئێمە بۆ ســەقامگیر کردنی ڕێژیمێکــی دێموکراتیک کە حاکمیەتی یەکســانی هەمــوو نەتەوەکانــی دانیشــتووی ئێــران دابیــن بــکا، تێدەکۆشین.

ـ ئێمــە لــە پێناوی یەکێتیی کردەوەی گشــت هێزەکانی نیشــتمانی و دێموکراتیــک و شەخســیەتەکانی کــورد لــە کوردســتاندا خەبات دەکەین.

ئێمــە بزووتنەوەی ڕزگاریخــوازی نەتەوەی کورد بە بەشــێک لە بزووتنەوەی جیهانی لە ڕێگای ئاشتیی جیهانیدا، نەهێشتنی دیکتاتۆری بە هەموو چەشــن و شــێوەیەکییەوە و ســەربەخۆیی نەتەوەکان لە دیاریکردنــی چارەنووســیاندا و ڕووخانــی ڕێژیمەکانــی زۆردار و

زۆرداریـــی وڵاتـــەکان و خەبات لـــە دژی دەســـتدرێژیی ئیمپریالیزم دەنرخێنین».

لە کۆتایی ئەو بەیاننامەیەدا نووسراوەیەکی کورت بە ئیمزای غەنی بلووریان و حەمەدەمین ســـیراجی، دوو کەســـایەتیی دیاری «تاقمی حەوت کەســـی» کە بە تەحریکی حیزبی توودە لە حیزبی دێموکرات جیا بوونەوە، دەبینرێت کە بەم چەشنەی خوارەوە پەشیمانیی خۆیان لـــەو خەیانەتە گەورەیـــە دەردەبڕن و دان بـــەوەدا دەنێن کە فریوی حیزبی توودەیان خواردووە:

هاونیشتمانی خۆشەویست!

خەڵکی شەریفی کوردستان!

ئێمە کە ئەم نووســـراوە کورتەمان واژۆ کردەوە، لە رەوتی ئامادەکردنی بەیاننامەی جیابوونەوەی بەشی زۆری ئەندام و کادرەکانی ســـەر بە حیزبی توودە لە دەرەوەی وڵاتدا بووین و بە گشتی لەگەڵ دەقی بەیاننامەکەدا هاودەنگین.

بـــەڵام لـــە بـــەر ئـــەوەی خۆمـــان و ژمارەیـــەک لەوانـــەی بەیاننامەکەیان واژۆ کـــردووە، لە رابردوودا، ئەندامی حیزبی دێموکراتـــی کوردســـتانی ئێـــران بوویـــن و کاتێـــک بـــە هۆی جیاوازیـــی بۆچـــوون و لێکدانەوە و هێندێـــک هۆ و فاکتۆر کە ئاگری دووبەرەکییان خۆشتر دەکرد، لە حیزب جیا بووینەوە و لە ژێر ناوی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران (پێڕەوانی کۆنگرەی چوار) دەســـتمان کرد بە تێکۆشان و پاشان لە بەر ئەوەی ئاگاداریی پێویستمان لە ماهیەتی رابەری و ساختاری دژە دێموکراتیکـــی حیزبی تـــوودەی ئێران نەبوو، چووینە پاڵ ئەو حیزبەوە، ئێستاش رایدەگەیەنین لە رۆژی بڵاوکردنەوەی ئـــەم بەیاننامەیـــە بـــە دواوە، هیـــچ چەشـــنە پێوەندییەکمان لە ژێـــر هیچ ناو و نیشـــانێک لەگەڵ حیزبی تـــوودەی ئێران نییە

و هەر وەها هەوڵ دەدەین رەوتی جیابوونەوە لە حیزبی دیموکراتی کوردستان و تێکۆشان لە ژێر ناوی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران (پێڕەوانی کۆنگرەی چوار) و چوونە پاڵ حیزبی توودەی ئێران کە پێویستی بە توێژینەوەی وردتر و تێکڕایی هەیە و روانگەکانی خۆمان سەبارەت بە ئاڵوگۆڕەکانی قووڵ، رووداوەکانی سەردەمسازی ئێستا و شوێنەواری ئەو رووداوانە لە سەر پرۆسەی خەبات و بزووتنەوەی رزگاریخوازیی کوردستان روون کەینەوە و بە ئاگاداریی گشتیی بگەیەنین.

غەنی بلووریان ـ حەمەدەمینی سیراجی

١٠ی خاکەلێوەی ١٣٦٩، رێکەوتی ١٩٩٠/٣/٣٠

### ■ ٥٦: تیرۆری دوکتور سەعید و هاوڕێیانی لە ریستورانی میکونۆس (١٣٧١)

لە بیروباوەڕی ئیسلامی و لەوانەش بیروباوەڕی شیعەدا دنیا بە دوو بەش دابەش دەکرێت: «حەق» و «باتڵ». لەم شێوە بیرکردنەوەدا ئیسلامییەکان خۆیان بە حەقی موتڵەق و نەیارەکانیان بە باتڵ دەزانن. لەم شێوە روانینەدا ویلایەتی فەقیە نوێنەری خوداوەند لە سەر زەوییە، هەرچی ئەو دەیڵێ و دەیکا، رەوایە و جیهانی بەرانبەری ناڕەوا. ئەم دیتنە لەگەڵ ئازادی، دیموکراسی، مافی مرۆڤ و مافەکانی ژنان و .. لە دژایەتیدایە، کەرەستەی خەبات دژ بە ئەم بۆچوونانە جیهادە و جیهادیش یانی لەناوبردنی موخالیفەکانی بیروبۆچوونی ئەوان. لەم پێوەندییەدا رێبەرایەتیی حیزبی دیموکرات کە بۆ بەها دیموکراتیکەکان تێدەکۆشێ و لەو بوارەدا چالاک و هەڵسووڕە، دەکەوێتە ریزی هەرەپێشەوەی ئامانجەکانی تیرۆری رێژیم. بەم پێیە لە چوارچێوەی بڕیارەکانی کۆماری ئیسلامیدا رێبەرایەتیی حیزب

لــە بەرنامەی حەزف و لە نێوبردندا بــوون. ڕێژیم بۆ بەڕێوەبردنی هــەر تیرۆرێک لــە دەرەوەی وڵات کومیتەیەکی بە ناوی «کومیتەی کاروبــاری تایبــەت» پێک هێناوە. ئەم کومیتەیــە کە لە ژێر نەزەری ڕاستەوخۆی ڕێبەری نیزامدایە و دەفتەرەکەی لە کۆشکی فیروزەیە، ســەرەڕای نوێنەرانی ڕێبەر و ســەرۆک کۆمار، فەرماندەی گشتیی ســپای پاســداران، وەزیری ئیتلاعات و ئەمنیەت بەشــدارییان تێیدا هەیە. لە کاتی ئەم تیرۆرانەدا خامنەیی ڕێبەر و ڕەفسەنجانی سەرۆک کۆمار، عەلی فەلاحیان وەزیری ئیتلاعات و ئەمنیەت و عەلی ئەکبەر وەلایەتی وەزیری دەرەوە بوون. ڕێژیم لە ٢٢ی پوشــپەڕی ٦٨دا بە تیرۆری دوکتور قاســملوو بە ئاواتی لەنێوچوونی حیزبی دێموکرات نەگەیشــتبوو. بۆیە گەڵاڵەی لەنێوبردنی دوکتور ســەعیدی دارشت. ئــەم گەڵاڵەیە بــە هۆی ژمارەیەک تیرۆریســتی ئێرانی و لوبنانی کە بریتــی بــوون لە «کازم دارابــی، عەبدولڕەحمان بەنیهاشــمی» کە ڕێبەریــی تیمــی عەمەلیاتەکەی لە ئەســتۆ بــووە و «عەباس ڕاحل، یوسف ئەمین» کە شەهیدەکانی وە بەر دەستڕێژی موسەلسەل دان و لــە ژێــر چاوەدێریی کومیتــەی عەمەلیاتی تایبەتــدا کار دەکات و پــاش بەڕێوەبردنــی تیرۆرەکە بە پێی بەرنامەیەکی لەپێشــداڕێژراو دەگەڕێتەوە بۆ ئێران و ماشــینێکی بنزی ئاخر سیستمی لە پاداشتی ئەم جینایەتەدا پێ دەبەخشن، بەڕێوە چوو.

■ چۆنیەتیی بەڕێوەچوونی تیرۆر

دوکتور سەعید کە بۆ مەئموورییەتی ساڵانەی کاروباری دیپلۆماسی لــە دەرەوە بوو، لە ســەر بانگهێشــتی ڕێکخــراوی ئینترناســیۆناڵ سۆسیالیســت لە نۆزدەهەمین کۆنگرەی ئەم ڕێکخراوەیەدا کە لە ١٤ تا ١٧ی ســپتامبر لــە ئاڵمان بە ڕێوە چوو، بە بەشــداریی هاوڕێیان فەتــاح عەبدولــی نوێنــەری حیــزب لــە دەرەوەی وڵات، هومایوون ئــەردەڵان نوێنــەری حیزب لە ئاڵمان و نووری دێهکوردی دۆســتی

لەمێژینــەی حیــزب لــەم کۆنگرەیــەدا بەشــداری دەکــەن. لە ســەر داوای دوکتور شــەرەفکەندی قەرار دەبێ کە بۆ باســکردن لە سەر داهاتووی ئێران لەگەڵ نەفەراتی ئۆپۆزســیۆنی ئێرانی دانیشــتنێکی هاوبەش پێک بێنن و رێکخستنی ئەم دانیشتنە بە نووری دێهکوردی کە مرۆڤێکی سیاســیی کارا و دۆســتی حیزب بوو، دەســپێردرێ و لــە کۆنگرەی ئینترناســیونال سۆسیالیستیشــدا وەک وەرگێڕ لەگەڵ وەفدی حیزب دەبێ، بەڵام نووری دێهکوردی بە هۆی کاری زۆرەوە ئەرکەکــە بە کەســێک بە نــاوی «عەزیــز غەفاری» دەســپێرێ کە خاوەنی رێســتۆرانەکە بوو و داوای لێ دەکات ئەو نەفەرانە ئاگادار بکاتەوە، عەزیز غەفاریش بۆ رۆژی هەینی ١٨ی ســپتامبر خەڵکەکە ئــاگادار دەکاتەوە، بەڵام دانیشــتنەکە بەهەر هۆیــەک بوو دەکەوێتە رۆژی٥شــەممە ١٧ی ســپتامبر، نووری دێهکــوردی بۆ خۆی چەند کەســێک ئاگادار دەکاتەوە کە لە دانیشتنەکەدا بەشداری بکەن و بەم چەشــنە بێجگە لە هەیئەتی نوێنەرایەتیی حیزب و نووری دێهکوردی (حوســەین ئەحمەدی) پەرویز دەســتماڵچی، مەهــدی ئیبراهیمزادە، مەســعوود میرڕاشد، ئیســفەندیار و عەزیز غەفاری ئامادە دەبن کە کاتژمێــر نزیــک بــە ١٠ و پەنجا خولەکی شــەو بە کاتــی ئاڵمان لە لایەن تیرۆریســتانەوە هێرشــیان دەکرێتە سەر و لە نێو ئەو هەشت کەسەدا تەنیا «دوکتور سەعید، فەتاح عەبدولی، هومایوون ئەردەلان و نــووری دێهکوردی» بەر دەکەون و لــە رێکەوتی ٢٦/ ١٣٧١/٦ی هەتاوی شەهید دەکرێن.

پاش ئەم جینایەتە پۆلیســی ئاڵمان گەمارۆی شــوێنی رووداوەکە دەدەن و بە لێپرسینەوە لەو کەسانە کە لە ریستورانی میکونۆسدا بوون، بەتایبەتی ئەو ئێرانیانە کە ناویان لە ســەرەوە هات، موشەخەســاتی قاتڵەکان و شێوەی ئاخاوتنیان کە بە فارسی بووە، هەر لە سەرەتاوە دەردەکەوێ کە قاتلەکان ئێرانین و دوای ماوەیەکی زۆر بەدواداچوون،

دادگای لێکۆڵینــەوە لــەم جینایەتە لە لایەن دەزگای قەزایی ئاڵمانەوە پێک دێ و ناوی دادگاکە کە لێکۆلینەوە لە سەر جینایەتی ریستۆرانی میکونۆس دەکات، دەبێتە دادگای میکۆنۆس و ئێستا ئیدی میکۆنۆس لە هەموو دنیادا ناوێکی ناسراو و بەناوبانگە.

دادگای میکۆنۆس زیاتر لە سێ ساڵ و نیوی خایاند و لەو ماوەیەدا ٢٤٧ جار کۆ بوونەوە و ١٧٠ کەســیان بۆ شــاهیدی بانگهێشت کرد. هەزاران کاتژمێر کاریان لە ســەر کــرد و هەزاران لاپەڕە کاغەزیان لــەم بــارەوە رەش کــردەوە. یەکێک لە شــاهیدەکان ئەبولحەســەن بەنی‌ســەدر بوو کە بە ســەرنجدان بەوەی کە ناوبراو لە رابردوودا ســەرۆک کۆمار بووە، شــاهیدییەکەی شــوێندانەریی زۆری هەبوو. هــەر بۆیە حیزبی دێموکراتیش لەو پێوەندییەدا سپاســی ئازایەتی و شوجاعەتی ناوبراوی کرد.

یەکێکی دیکە لە شاهیدەکان کە بە هۆی بەنی‌سەدرەوە ناسێنرابوو، ئەبوولقاســم میســباحی ناسراو بە شــاهیدی (C) بوو کە ناوبراو لە رابــردوودا یەکێــک لــە بەرپرســانی دەرەوەی وەزارەتــی ئیتلاعات بــووە و زانیارییەکــی زۆر ورد و بە کەڵکی لە ئیختیــار قازییەکانی دادگای میکونۆســدا دانا. پاش ئەم شــاهیدیدانە رێژیم زۆری هەوڵ دا کە ناوبراو بە کڵاوبەردار بناســێنێ و بیســەلمێنێ کە ناوبراو هیچ بەرپرســایەتییەکی لە دامــودەزگای ئیتلاعاتی ئێرانــدا نەبووە، بەڵام ناوبــراو بە رادەیەک ناســرابوو کــە رەتکردنەوەی ئێــران بێجگە لە ریســوایی هیچی دیکــەی بۆیان بە ئــاکام نەهێنا، چوونکــە ناوبراو یەکێــک لــە بناغەدانەرانی واواک بووە و «نوێنــەری تام‌الاختیار»ی ئێــران بــۆ وتوویژ لەگــەڵ نوێنەرانی دەوڵەتەکانی ئاڵمان، فەرانســە و وڵاتــە یەکگرتووەکانــی ئەمریکا بە مەبەســتی ئازادکردنی بارمتە رۆژئاواییــەکان لــە لوبنان بووە و زۆر کەس لــە ئاڵمان ناوبراویان دەناسی.

کۆنگرەی دەیەمی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران مەسەلەی تیرۆری سکرتێری گشتیی حیزب، شەهید دوکتور سادق شەرەفکەندی و فەتاح عەبدولی و هاوڕێکانی لە ١٧ی سێپتامبری ساڵی ١٩٩٢ لە شاری برلینی وە بیر هێنایەوە و ڕەوتی موحاکمەی تاوانبارانی ئەو جینایەتەی هێنایە بەرباس و لێکۆڵینەوە.

نوێنەرانی کۆنگرە ڕەزامەندیی خۆیان لە ڕەوتی بەرەوپێشچوونی دادگای برلین دەربڕی و بە چاوێکی پڕ لە هیواوە ڕوانیانە هەوڵ و تەقەلای دەزگای قەزایی ئاڵمان، هەر بەم هۆیەشەوە سڵاو و ڕێزی خۆیان بە نیشانەی پێزانین و ئەمەکناسی پێشکەش بە بەڕێزان سەرۆکی دادگا و دادستان و قازییەکانی دادگا کرد.

کۆنگرە داوای لە حکوومەتی ئاڵمان کرد کە پێشگیری لە هەر چەشنە نفووزێکی ڕێژیمی ئێران لە کاری دادگادا بکا بۆ ئەوەی دادگا بتوانێ حوکمی دادپەروەرانەی خۆی دەر بکا و کۆماری ئیسلامیی ئێران وەک بەرنامەداڕێژ و عامیلی ئەسڵیی ئەو جینایەتە بە دنیا بناسێنێ.

هەر لەو کاتەدا کۆنگرە داوای لە کۆڕوکۆمەڵ و کەسایەتییەکانی لایەنگری حەق و عەدالەت لە جیهان و بە تایبەتی لە ئورووپادا کرد کە هەموو نفووز و ئیعتباری خۆیان لە لای دەوڵەتی ئاڵمان بە کار بەرن بۆ ئەوەی دادگای «میکونۆس» بە دوور لە هەر چەشنە دەستێوەردانێک ڕەوتی سروشتیی خۆی بپێوێ و ڕێگا نەدرێ جارێکی دیکە عەدالەت بە فیدای بەرژەوەندییە بازرگانی و دیپلۆماسییەکان بکرێ. لە ماوەی دادگاییکردنەکەدا ئێران زۆری هەوڵ دا بەڵکوو بتوانێ ئاراستەی دادگاکە بگۆڕێ. بۆ ئەم مەبەستە «عەلی فەلاحیان» وەزیری ئیتلاعاتی ئێران سەفەرێکی ئاڵمانی کرد و لەگەڵ «ئیشمیت باوێر» وەزیری ئاسایشی ئاڵمان چاوپێکەوتنی کرد کە لە ڕاگەیەنە گشتییەکانی ئاڵماندا ئەم چاوپێکەوتنە لە هەلا درا

تا بەو هۆیەوە ئیشمیت باوێر بانگهێشتی دادگا کرا و ئەویش ناچار بوو دان بەوەدا بنێ کە وەزیری تیرۆریستی ئێران ویستوویەتی کە وڵاتی ئاڵمان شوێن لە سەر دادگاکە دابنێ و ئاراستەی دادگاکە بگۆڕێ کە دیارە لەو ماوەیەدا دەزگای قەزایی ئاڵمان ویستیان بڕیاری دەستبەسەر کردنی ناوبراو دەر بکەن کە بە هۆی دەستێوەردانی دەوڵەتی ئاڵمانەوە ئەم کارە جێبەجێ نەبوو. لە کۆتاییدا لە ڕێکەوتی ١٣٧٤/١٢/٢٤ی هەتاوی دادگا حوکمێکی ئازایانەی دەرکرد و حوکمی دەستبەسەرکردنی «عەلی فەلاحیان»ی دەرکرد.

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە ڕێکەوتی ١٣٧٤/١٢/٢٦ی هەتاوی لە بەیاننامەیەکدا وێڕای دەربڕینی خۆشحاڵیی خۆی لە دەرکردنی ئەو حوکمە، پیرۆزبایی لە دەزگای قەزایی ئاڵمان کرد و هیوای دەربڕی کە ڕەوتی ئەم موحاکمەیە هەروا درێژە بکێشێ تا کۆماری ئیسلامی لە تەواوەتیی خۆیدا مەحکووم دەکرێ. دوای دەرکردنی ئەم حوکمە ڕۆژی ١٣٧٤/١٢/٢٨ی هەتاوی هەیئەتی وەزیرانی ئێران لە دژکردەوەیەکدا بەم مەحکەمەیە، هەڕەشەی ئەوەیان لە ئاڵمان کرد کە ئەم شێوە ڕەفتارە دەتوانێ ڕوو لەویش بکا و ئەتباعی ئەوان لە وڵاتی ئێران دادگایی بکرێن. سێ ڕۆژ پاش دەرچوونی ئەم حوکمە ڕێژیم هاتوهاوارێکی زۆری وە ڕێ خست و عامیلی دەرخستنی ئەم بڕیارەی بە کاری ئیسرائیل و ئەمریکا لە قەڵەم دا کە گۆیا ئەوان فشاریان بۆ دەزگای قەزایی ئاڵمان هێناوە کە ئەو بڕیارەی دەرکردووە. هەر لەم ڕۆژەدا ئەنسساری حیزبوڵڵا بە سەرۆکایەتیی «حوسەین ئەڵلاکەرەم» ژمارەیەک بەکرێگیراوی خۆیان لە بەر درگای باڵوێزخانەی ئاڵمان لە تاران کۆ کردەوە و خوازیاری عوزرخوازیی ئاڵمان لە ئێران و هەڵوەشانەوەی ئەو بڕیارە لە سەر فەلاحیان بوون و هەڕەشەیان کرد کە ئەگەر ئەم حوکمە هەڵنەوەشێتەوە، حیزبوڵڵا لە تەواوی دنیادا ئامادەباش دەبێ.

ئەمانە هەر ئەو هەڕەشـــانە بوون کە پێشتر دەوڵەتی ئۆتریشیان پێ ترساندبوون تا وە دوای جینایەتی ڤیەن نەکەون.

لە کۆتاییدا ڕۆژی ٢١ی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٧٦ی هەتاوی حوکمی نیهایی دادگای میکۆنوس خامنەیی و ڕەفسەنجانیی وەکوو تاوانباری سـەرەکیی تیرۆرەکـە ڕاگەیاند و لـەو حوکمەدا کـە ڕایگەیاند، بەم جـۆرە هاتبوو: «هۆی ئەم تیرۆرە دەبـێ لەو ئاڵوگۆڕ و پێوەندییەدا کە پاش شۆڕشـی ئیسلامی لە ئێراندا پێک هاتبوو ببینین. تێکۆشانی کوردەکانی ئێران بە ڕێبەرایەتیی حیزبی دێموکراتی کوردستان ئێران، بە مەبەسـتی بەدەسـتهێنانی خودموختاری، ئـەم حیزبەی کردوەتە یەکێک لە حیزبە هەرە بەهێزەکانی دژی ڕێژیمی دەسـەڵاتدار.. بۆیە، ڕێبەریی سیاسـیی ئێران بە مەبەستی سەرکوتی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێـران، بڕیاری داوە کـە دژی ئەم حیزبە نـە تەنیا بە شـێوەی سیاسی بجووڵێتەوە، بەڵکوو مەبەستی لەنێوبردنی فیزیکیی ئەویشی هەیە.. .

قەتڵی دوکتور قاسملوو و دووکەس لە هاوڕێیانی لە ١٣ی ژووئیەی ١٩٨٩زایینی بەرانبەر بە ٢٢ی پووشپەڕی ١٣٦٨ی هەتاوی لە شاری ڤییـەن، هەروەها ئـەم قەتڵەی کە لەم دادگایەدا پێی ڕاگەیشـتین، لە ئاکامەکانی بە کردەوەی وەها سیاسـەتێکە و پێوەندیی نێوان قەتڵی ڤیەن و برلین زۆر روون و ئاشکرایە.. .

بەڵگە و دۆکۆمنتە حاشـاهەڵنەگرەکان کە لەم دادگایەدا پێشـکەش کراون، شـکڵ و شێوازی بڕیاردانی ئاستی هەرەسەرەوەی ڕێبەریی سیاسـیی ئێـران و هەروەهـا پێکهاتـە و بەرپرسـایەتییەکانی ئـەم بڕیاردانانە، بە مەبەسـتی لەنێوبردنـی دژبەرانی ڕێژیم لە دەرەوەی وڵات، زۆر بە ڕوونی و ئاشکرا پیشان دەدات.. . بڕیاردان لە پێوەندی لەگـەڵ لەنێوبردنی دژبەرانـی ڕێژیم لە دەسـەڵاتی دامەزراوەیەکی نایاسایی (مەبەست ئەوەیە کە بوونی وەها دامەزراوەیەک لە یاسای

بنەرەتیی ئێراندا نەهاتووە) و تەنیا لە سەر ئەمری ڕێبەری مەزهەبیی حکوومەت پێک دێت. ئەندامانی ئەم کومیتەیە بریتین لە: «سەرۆک کۆمار، وەزیری ئیتلاعات و ئەمنیەت (واواک)، وەزیری دەرەوە، سەرکردەکانی هێزە نیزامی و ئینتزامییەکان و هەروەها ڕێبەری مەزهەبیی حکوومەتی ئێران».

قەتڵی برلین هەمووی لە بەر هۆکاری مەزهەبی نیە، بەڵکوو هۆکارەکەی تەنیا سیاسی و پەیوەستە بە ڕاگرتنی دەسەڵاتی سیاسییەوە. بە ڕواڵەت، دانی رووکەشێکی مەزهەبی بە ئەم قەتڵە، ئەوە کە حکوومەتی ئێران، ئیدیعا دەکا کە گویا حکوومەتێکی ئیلاهییە، بە هیچ شێوەیەک لەم ڕاستییە ناگۆڕێ کە ئەم تیرۆرە تەنیا و تەنیا هۆکاری سیاسیی بووە و بە مەبەستی لەنێوبردنی دژبەرانی ڕێژیم بەڕێوە چووە. مەبەستی ڕێژیمی ئێران لەنێوبردنی دژبەرە چالاکەکانی ڕێژیم لە دەرەوەی وڵاتە.

■ بەشێک لە دەقی بڕیارەکەی دادگای میکۆنۆس

دوای دەرکردنی ئەم بڕیارە، یەکێتیی ئورووپا، وێڕای ئەوەی ئێرانی بۆ ڕێککەوتن لە سەر قەدەغەکردنی چەکی کۆمەڵکوژ و مافی مرۆڤ بانگهێشت کرد، ئەم بڕیارانەی دا:

١. لە هەلومەرجی ئێستادا هیچ بنەمایەک بۆ درێژەدانی دیالۆگی ڕەخنەگرانە لە نێوان ئێران و ئورووپادا نیە.

٢. نابێ چەک بە ئێران بفرۆشرێ.

٣. بەو ئێرانیانە کە کاری ئیتلاعاتی و ئەمنیەتی دەکەن، ویزا نەدرێ.

٤. موشاویرە لە باری دەرکردنی مەئموورانی ئیتلاعاتی ئێران، لە وڵاتانی ئەندامی یەکێتیی ئورووپا. هەروەها ١٥ وڵاتی ئورووپایی باڵوێزەکانی خۆیان لە ئێران کشاندەوە، بەڵام پاش شەش مانگ لە ٢٢ی خەزەڵوەری ١٣٧٦ی هەتاوی بەبێ بەدیهاتنی داواکانیان

گەڕانەوە بۆ ئێران. ئەمە نیشـــانەی ئەوپەڕی بێ پرەنســـیپیی وڵاتانی ئورووپایی بوو کە ئامادەن لە پێناو قازانجە مادییەکاندا چاوپۆشـــی لە هەموو ئوسوول و ڕێوشوێنە نەتەوەییەکانیان بکەن.

بابەتێکی جێگای ســـەرنجی دیکە پـــاش ڕاگەیاندنی ئەم حوکمە کە لێرەدا دەبێ ئاماژەی پێ بکەین، هەڵوێســـتی بەناو نوێنەرانی کوردی مەجلیســـی شـــوورای ئیســـلامیی ڕێژیم بوو. بەم بۆنەیەوە نامەیەک بە ئیمزای ١٦٠ ئەندامی ئەو مەجلیســـە بـــۆ خامنەیی ڕێبەری ڕێژیم نووســـرابوو کە لەو نامەیـــەدا بڕیاری مێژوویـــی دادگای میکۆنۆس بە پیلانێکی ئەمریکایی ـ سەهیوونیســـتی لـــە قەڵەم درابوو و هێرش کرابووە ســـەر هەڵوێســـتی وڵاتانـــی ئورووپایی لەمەڕ کشـــانەوەی باڵوێزەکانیان لە ئێران. ئەم نامەیە بە ئیمزای هەموو بەناو نوێنەرانی شـــار و ناوچەکانی کوردســـتان (بێجگـــە لە نووربەخـــش، نوێنەری مەهاباد کە لە کۆبوونەوەکەدا ئامادە نەبوو) گەیشتبوو.

حوکمی دادگای میکۆنۆس ســـەرکەوتن و دەســـکەوتێکی گەورەی مێژوویـــی بـــۆ بزووتنـــەوەی ئازادیخوازانەی خەڵکی کوردســـتان و جووڵانەوەی سەرتاسەریی ئێران و هەروەها بۆ تەواوی ئەو کەسانە بوو کە بۆ ئازادی و عەدالەت و مافی مرۆڤ خەبات دەکەن.

پـــاش دەرچوونـــی ئەم حوکمـــە ژمارەیەکـــی زۆر لـــە ڕێکخراو و کەسایەتییەکان پێشوازی و خۆشحاڵیی خۆیان سەبارەت بەم حوکمە ڕاگەیاند کە بریتی بوو لە:

١. کومیتەی بەربەرەکانێ لەگەڵ تیرۆریزمی کۆماری ئیسلامی.
٢. ڕێکخراوی «اتحاد فدائیان خلق ایران».
٣. ڕێکخراوی چریکە فیداییەکانی ئێران.
٤. حیزبی میللەتی ئێران.
٥. ئەنجوومەنی دیفاع لە زیندانیانی سیاسیی ئێران.
٦. « شورای مقاومت ملی».

٧. «نەهزەتی مقاومەتی میللی».
٨. ڕێکخــراوی لایەنگرانی مافی مــرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتیەکان لە ئێران.
٩. « شورای مرکزی اتحاد فدائیان کمونیست».
١٠. ڕێکخراوی مەشرووتەخوازان.
١١. جوولانەوەی میللیی ئێران.
هەروەهــا زۆربەی ڕۆژنامە و گوڤارەکان کە لە دەرەوە بە زمانی فارســی چاپ دەکرێت و هەروەها ئەم کەسایەتییانەش ئەبولحەسەن بەنیســەدر یەکەمین ســەرۆک کۆماری ئێران، پەرویز دەستمالچی سیاســەتمەدار، عەبدولکەریم لاهیجی یاساناس، عەلیڕەزا نووریزادە ڕۆژنامەنووس، میهــدی خانبابا تیهرانی ڕۆژنامەنووس، مەنووچیهر گەنجی سیاسەتمەدار.
لە دەساڵەی شەهیدبوونیاندا، بۆ ڕیزگرتن لە یادی دوکتور سەعید و هاوڕێکانــی لــە ٢٣ی ئۆکتوبری ٢٠٠٢ی زایینــی بەرانبەر بە ١ی خەزەڵــوەری ١٣٨١ی هەتاوی بە بەشــداریی ڕێبــەران و نوێنەرانی چەندین ڕێکخراوی سیاســی و کۆمەڵە و ئەنجومەنی مرۆڤدۆســتیی فەرانســەوی و ئۆرووپایــی هەروەهــا بــە ئامادەبوونــی نوێنەرانی دەیــان حیــزب و ڕێکخــراوی سیاســیی کــورد و ژمارەیەکــی زۆر کەســایەتیی کورد و ئێرانی و ڕۆژئاوایی کۆبوونەوەیەک لە ساڵۆنی «مارس»ی پارلەمانی فەرانسە بەڕێوەچوو کە ژمارەیەکی زۆر وتار بــۆ مەحکوومکردنــی تیرۆریزمی کۆماری ئیســلامی و ڕێزگرتن لە شەهیدەکان خوێندرانەوە.
لە ٢٠ی ئاوریلی ٢٠٠٤ی زایینی بەرانبەر بە ٣٠ی بانەمەڕی ١٣٨٣ی هەتاویدا بە بەشــداریی نزیکەی هەزار کەس لە کورد و ئێرانییەکان و ژمارەیەکی زۆر لە بەرپرســە ناوچەییەکانی برلین و کەســایەتییە نیشــتمانییەکان، پەردە لە ســەر هێما (لوح)ی بیرەوەریی شەهیدانی

میکۆنــوس لادرا. ئەم هێمایە لە ســەر بڕیاری شــارەداریی ناوچەی «شــاری لاتنبــۆرگ» لە شــوێنی تیرۆری دوکتور شــەرەفکەندی و هاوڕێیانیدا دانرا. کۆماری ئیســلامی هەوڵێکی زۆری دا کە پێش بەم کارە بگرێ، بەڵام هیچی بۆ نەچووە ســەر و بەم چەشنە شارەداری ئازای شاری «لاتنبۆرگ» بە دانانی ئەم لەوحە ڕێزی لە قوربانییەکانی ئــەم تیرۆرە ناجەوامێرانەیە گرت و ئەمە نیشــانەی مەحکوومکردنی تیرۆریزمی کۆماری ئیسلامی بوو.

**■ ٥٧: گواستنەوەی بنکەکانی حیزب لە قەندیل بۆ کۆیە (١٣٧٢)**

ڕێژیمی کۆماری ئیسلامی کە لە بەربەرەکانێ دژی هێزی پێشمەرگە دەستەوەســتان و داماو بوو، لە سەرەتاکانی ساڵی ١٣٧٠ی هەتاوی بەرانبــەر بــە ١٩٩١ی زایینــی کــە حکوومەتی عێراق دەســەڵاتی بە سەر کوردســتاندا نەما، کونترۆڵی کوردستان کەوتە دەستی بەرەی کوردستانی و بە سەرەنجدان بەو راستییەکە هێزەکانی کوردستانی باشوور مەقەڕەکانیان ساڵانێک لە کوردستانی ئێران لە ژێر دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی ئێراندا بوو، هەر بۆیە پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵیان هەبــوو کە لەم بەشــە لە کوردســتاندا کەوتە پیلانگێڕی و دەســتی دایە تیرۆری تێکۆشەران لە بناری قەندیل کە شوێنی نیشتەجێبوونی ژمارەیەکــی زۆر لەکادر و پێشــمەرگە و هەروەهــا بنکەی دەفتەری سیاســی و کومیتەکانــی ناوەندی کوردســتان بوو، لــە گەڵاڵەیەکی تیرۆریســتیدا لــە ڕۆژی ١٣٧٠/٨/٧ وانێــت بارێکــی بومبڕێژکراوی لە ســەر ڕێگای هاتوچــووی ئۆتۆمبیلی پێشــمەرگەکان کە بەیانیان لە»ئینــدزێ» شــوێنی نیشــتەجێبوونی بنەماڵەکان بــەرەو «بۆڵێ» شــوێنی کاری ڕۆژانەی دەفتەری سیاســی دەڕۆیشــت، دانایەوە کە لەو ئۆتۆمبیلەدا ژن و منداڵی هاوڕێیانی حیزبیش هەبوون و ماشینە بومبڕێژکراوەکــە لە ڕێــگای بەکرێگیراوێکەوە کاتژمێــر ٩ی بەیانی

بـە مینیبووسـێکی حیزبـدا تەقێنرایـەوە. بەداخەوە لـەم عەمەلیاتە تێروریسـتییەدا سـێ کەس بە ناوەکانی حەسـۆ عەلیپـوور جێگری هێـزی سـامەرەند، مەلا رەسـووڵ گـەردی کادری حیـزب، جەلیل مامایـی کە شـۆفیری مینیبووسـەکە بوو، شـەهید و ژمارەیەک لە سەرنشـینەکانیش بریندار بوون کە لە نێو بریندارەکاندا منداڵی ٥-٦ ساڵانیش هەبوون.

لەم رێکەوتە بە دواوە رێژیم هێرشـەکانی بە بومبارانی هەوایی و تۆپباران درێژە دا و رۆژی ٢٢ی رەشـەمەی ساڵی ١٣٧١ی هەتاوی بەرانبەر بەی مارسـی ١٩٩٣ی زایینی کاتژمێر ١٠ی سەرلەبەیانی ٦ فڕۆکەی بومبهاوێژی کۆماری ئیسلامی بە بومبی هێشوویی بنکەکانی نەخۆشـخانە و ماڵەکانی دەوروبەری دەفتەری سیاسییان بۆردمان کرد کە لەو بۆردمانەدا ٤ پێشـمەرگەی حیزب بە ناوەکانی عەبدوڵڵا رەسـوڵزادە، رەسـووڵ عوسمانی، حوسەین شـەمامی و مەحموود محەممەدپوور شەهید و چەندین کەسیش بریندار بوون.

دەفتـەری سیاسـی لـە راگەیەندراوێکـدا وێـڕای دەربڕینی داخ و کەسـەر بۆ شـەهیدبوونی ئەو پۆلە پێشـمەرگەیە و سەرەخۆشـی لـە بنەماڵەکانیـان، ئەم کـردەوە جنایەتکارانەیـەی مەحکووم کرد و داوای لـە کۆڕ و کۆمەڵە سیاسـی و بەشەردۆسـتەکان کرد دەنگی بێزاریـی خۆیان بەرانبەر بە ئەم کردەوە دژی ئینسـانییەی کۆماری ئیسـلامی بەرز بکەنـەوە و چیدی رێگا نەدەن ئـەم رێژیمە گاڵتە بە پەسـەندکراوەکانی رێکخـراوی نەتـەوە یەکگرتووەکان بکا و یاسـا نێونەتەوەییـەکان بخاتـە ژێـر پـێ و بە تایبەتـی داوا لـە رێبەریی بزووتنەوەی کوردستانی باشور و دەوڵەتی عێراق دەکا ناڕەزایەتیی خۆیان بەرانبەر بەم پێشێلکارییە دەر ببڕن.

پـاش ئـەم بومبارانـە تێکڕای رێکخراوە سیاسـییەکانی باشـوور و رۆژهەڵاتـی کوردسـتان، ئینترناسـیۆناڵی سۆسیالیسـت، حیزبی

سۆسیالیستی فەرانسە، بونیادی فرانس لیبرتی، ڕێکخراوی پزیشکانی جیهـان، ڕێکخراوی پارمەتییە دەرمانییــە نێونەتەوەییەکان و کەنداڵ نــەزان، ســەرۆکی ئەنسـتیتۆی کــورد لە پاریــس ئــەم کردەوەیان مەحکووم و شەرمەزار کرد.

لە درێـژەی ئەم پیلانگێڕییانەدا ڕێژیم هەڕەشــەی لە گوندنشــینە ســنوورییەکان کــرد کە دەبێ بە مــەودای ١١ کیلۆمیتر لە هەر دوو دیوی کوردســتانی باشوور و کوردســتانی ڕۆژهەڵاتەوە گوندەکان چــۆڵ بکرێــن. بە وتــەی خۆیــان پلانی هێــرش بۆ ســەر بنکەکانی حیزبیــان بە دەســتەوە بوو کە ئــەم پیلانە بە هــۆی بانگەوازێکەوە کــە دەفتەری سیاســی لە ڕۆژی ١٣٧٢\١١\٢٦ بــڵاوی کردەوە، لەقاو درا. لــەو بانگــەوازەدا داوا لــە گوندنشــینەکانی هــەر دوو دیــوی ســنوور کرابوو کە لە بەرانبەر ئەو پیلانەدا بوەســتن و گوێ نەدەنە هەڕەشــە و گوڕەشەی ڕێژیم کە پاش ئەم ڕاگەیەندراوە ژمارەیەکی زۆر لە گوندنشــینەکانی کوردســتانی باشــوور ئامادەیی خۆیان بۆ پووچەڵکردنــەوەی پیلانەکــەی ڕێژیمــی کۆنەپەرەســتی کۆمــاری ئیسلامی ڕاگەیاند.

لــە کۆتاییەکانــی مانگــی خاکەلێــوەی ١٣٧٢ەوە تۆپبارانی ڕێژیم بۆ ســەر بنکــە وماڵەکانی حیزبی دێموکراتی کوردســتانی ئێران تا گواســتنەوەی بنکەکانی حیزب لە قەندیلەوە بۆ کۆیە هەر وا درێژەی هەبوو کە لەو تۆپبارانەدا ژمارەیەک هاووڵاتیی کوردستانی باشوور لــە مانگــی جۆزەرداندا شــەهید و برینــدار بوون. بێجگــە لە تۆپ و خومپارەباران و بۆمبارانی هەوایی، لە ڕێگای دەســتوپێوەندییەکانی خۆشییەوە بە پاڵپشتیی ژمارەیەک لە بەرپرسانی هێزە سیاسییەکانی لە کوردستانی باشوور گوندنشــینەکانی ئەو ناوچەیان هان دابوون کە بگەڕێنەوە ســەر ماڵ و ملکەکانیان کە لەم بارەوە حیزب ســاڵێک بــە دانی ئیجارەیەکی خەیاڵــی گوندنشــینەکانی ڕازی کرد، بەڵام لە

درێژەی ئەو هاندانانەدا سـەرئەنجام گوندنشـینەکان هەڕەشـەکانی خۆیانیان لە حیزبی دیموکرات گەیاندە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوە کە لەم پێوەندییەدا حیزب ناچار بوو بیر لە ئاڵوگۆڕی شوێن بکاتەوە بۆ ئەوەی پیلانی ڕێژیم کە تێکهەڵچوون لەگەڵ گوندنشینەکانی ناوچەکە بـوو سـەر نەگرێ. لەم پێوەندییـەدا زیاتر لـە دوو حەوتوو گەڕان. سەرئەنجام بڕیاری کۆچکردن لە قەندیل بۆ کۆیە لە لایەن دەفتەری سیاسـییەوە پەسـەند کـرا. کاتێک کە ئـەم بڕیارە دەرچـوو، بەڕێز مسـتەفا هیجری سـکرتێری گشـتیی حیزب لە دەرەوەی وڵات بوو و بەڕێوەبـەری حیزب جێگری سـکرتێری ئـەوکات بەڕێز عەبدوڵڵا حەسەنزادە بوو. مەبەست ئەوە نییە کە بڵێین بەڕێز مستەفا هیجری ئـاگاداری ئـەم ئاڵوگـۆڕە نەبووە، بەڵکوو مەبەسـت گواسـتنەوەی زانیارییەکە وەک خۆیەتی.

گواستنەوە لە قەندیل بۆ کۆیە بوو بە ڕێگایەک کە بە دڵی هیچکام لـە ڕێبەرایەتیـی حیزب نەبـوو، بەڵام هەڵـەی کاری ڕێبەری لەوەدا بوو کە هەموو شـتێکی خۆی گواسـتەوە بۆ کۆیە بە بێ ئەوەی کە بیرێک لە ئاکامی ئەم گواسـتنەوەیە بۆ داهاتوو بکاتەوە. بە باوەڕی من دەکرا حیزب ئەو کات بەشێکی بەرچاو لە هێزەکە بگوازێتەوە بۆ کۆیە، بەڵام لە هەمان کاتدا دەکرا دوو تا سـێ تیمی ١٠٠ کەسـی لە پێشمەرگە سەڵتەکان لە سنوور بهێڵێتەوە بۆ ئەوەی جێگایەک بن بۆ جووڵاندنی هێز و توانای حیزب لە ساڵانی دوای گواستنەوەدا.

### ■ ٥٨: کۆنگرەی دەیەمی حیزب و یەکنەگرتنەوە (١٣٧٤)

لـە نێـوان کۆنگرەی نۆیەم بـۆ کۆنگرەی دەیەمدا دوکتور سـادق شـەرەفکەندی، سکرتێری گشتیی حیزب لە لایەن تیمی تیرۆریستیی کۆماری ئیسلامییەوە لە ریستۆرانی میکۆنۆسی بێرلین شەهید کرا و مستەفا هیجری، جێگری دوکتور سادق لە یەکەم کۆبوونەوەدا پاش

شەهیدکرانی دوکتور سادق، وەکوو سکرتێری گشتی دیاری کرا.

یەکێک لەو بابەتانە کە بوو بە باسی نێوخۆی حیزب و کۆنگرەی دەیەمی خستە ژێر شوێندانەریی خۆی، پرسی یەکگرتنەوە لەگەڵ «ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ» بوو. بەشێک لە کادر و پێشمەرگە و ڕێبەریی حیزب خوازیاری یەکگرتنەوە یا باشتر بڵێین هێنانەوەی «ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ» بوون و بەشەکەی دیکە بەو ئیستدلالە کە ماوەی ٨ ساڵە ئینشعاب رووی داوە و یەکگرتنەوەی کوتوپڕ ناتوانێ سەرکەوتوو بێ، بوون بە دوو بەرە و «عەبدوڵلا حەسەنزادە» ڕێبەریی خەتی یەکگرتنەوەی بەو شێوەیە کە خۆی پێی خۆش بوو، لە ئەستۆ گرت و لەم پێوەندییەدا بە داخەوە حیزبی تا ئێستاش کرد بە دوو بەش و بۆ گەیشتن بەو ئامانجە لە هیچ شێوە فەعالیەتێک خۆی نەبوارد و لەو پێوەندییەدا کار گەیشتە جێگایەک کە «باباعەلی میهرپەروەر» لە کۆبوونەوەیەکی گشتیدا کە بەڕێز عەبدوڵلا حەسەنزادە بۆ خۆشی تێیدا بەشدار بوو، ڕایگەیاند کە دیاردەی ناوچەگەرایی و دەستەبەندی، میعمارەکەی عەبدوڵلا حەسەنزادەیە.

بەم زەمینەوە کۆنفرانسەکانی پێش کۆنگرەی دەیەم بەڕێوە چوون و هەر لە سەرەتادا دیار بوو کە دەستەی «عەبدوڵلا حەسەنزادە» براوەی کۆنگرەی دەیەم دەبێ و لە کۆتاییدا کۆنگرەی دەیەم لە ژێر فەزای تیرۆریزمی کۆماری ئیسلامیدا لە ڕۆژی ٢٣ تا ٣٠ی خاکەلێوەی ١٣٧٤ی هەتاوی لە هەولێر لە ساڵۆنی حیزبی شیووعی بەڕێوە چوو. ناوی کۆنگرەش بوو بە «کۆنگرەی پەنجاهەمین ساڵی دامەزراندنی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران». کۆنگرە لە لایەن مەلا حەسەن شێوەسەڵییەوە کرایەوە کە دوو کۆنگرە پێشتر لە تەقینەوەیەکی تیرۆریستیدا کە لە لایەن بەکرێگیراوێکی کۆماری ئیسلامییەوە ئەنجام درا، هەر دوو دەست و هەر دوو چاوی لە دەست دابوو.



دروشـــم و خـــەت و ڕێبـــازی ئیســـتراتیژیکی حیـــزب گۆڕانێکـــی ئەوتۆیان بە ســـەردا نەهات، بەڵام هەر وەک پێشبینی دەکرا، بڕیاری یەکگرتنەوە لەگەڵ ڕێبەرایەتیی شۆڕشـــگێڕ پەسەند کرا، لەگەڵ چەند بڕیارێکی دیکە کە دەقەکەیان بەم چەشنەیە:

١. دەرگای وتووێژ لەگەڵ ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ بکرێتەوە و ئەو بایکۆتەی تا ئیستا لە سەریان بووە، هەڵبگیرێ.

٢. کومیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی دەیەم، هەوڵ بدات لە ڕێگای وتووێژەوە ئەم گیروگرفتە بە پێی ئوسوول و بە قازانجی حیزب و بزووتنەوە چارەسەر بکا.

٣. ئەگـــەر ئـــەوان بـــی قەید و شـــەرت، بـــەو چەشـــنەی کومیتەی ناوەندی موافقەتی لە ســـەر دەکا، حازر بن بگەڕێنەوە ناو حیزب، لە نێـــو ریزەکانی حیزبدا وەک هەموو کادر و ئەندامێکی حیزب چاویان لێ بکرێ و حورمەتیان بپارێزرێ.

- کەمایەتی بە هیچ جۆرێک مافی نیە دەربارەی ئەو بڕیارانەوە کە باری ئیجراییان هەیە، نەزەری خۆی لە دەرەوەی ئۆرگانەکەی باس بکا. سەرپێچی لەو ئەسڵە دەتوانێ سزای حیزبیی بۆ دابنرێ.
- لە بارەی مەسەلە سیاسییەکانەوە کەمایەتی هەروەک زۆرایەتی مافی هەیە ٦ مانگ پێش لە کۆنگرە لە ڕێگای بڵاوکراوەی نێوخۆیی حیزبەوە نەزەری خۆی بەرێتە ناو بەدەنە و تەبلیغی بۆ بکا.
- کومیتەی ناوەندیی هەڵبژێراوی کۆنگرە رێوشوێنی بەڕێوەبردنی ئەم بڕیارە دیاری بکا و بە ئاگاداریی ئەندامانی حیزبی بگەیەنێ.

پاش کۆتایی کۆنگرەی دەیەم و یەکەم کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندی، وەک دیار بوو «عەبدوڵلا حەسەنزادە» وەکوو سکرتێری گشتی حیزب هەڵبژێردرا و مستەفا هیجری، سکرتێری پێشوو پیرۆزبایی لێ کرد و زۆر بە هاسانی و بێ گێرە و کێشە و پێچ و پەنا ئاڵوگۆڕی دەسەڵات کرا و تەنانەت پاش کۆنگرەش سکرتێری پێشوو بوو بە جێگری سکرتێری تازە کە ئەمە وەک مامۆستا «سەعد عەبدوڵلا» بەرپرسی لقی دووی ئەو کاتی پارتی بە نوێنەری حیزبی لە هەولێر گوت، دیاردەیەکی نوێ بوو لە نێو حیزبەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، چوونکە تا ئەو کاتە هەر کە سکرتێرێک لە سکرتێریی حیزبێک کەوتبێ، یان بەجێی هێشتووە، یان ئینشعابی پێک هێناوە کە ئەم دیاردەیە لە کۆنگرەی سێزدەهەمی حیزبیشدا بە داخەوە رووی دا.

لە کۆبوونەوەکانی دوای هەڵبژاردنی سکرتێردا کۆمیتەی ناوەندی بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی پێئەسپێردراوی کۆنگرە کە تێکەڵبوونەوەی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ لەگەڵ حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بوو، وەفدێکی پێک هێنا و «حەسەن شەرەفی، تەیموور مستەفایی، سلێمان کەڵەشی، قادر وریا» بۆ جێبەجێکردنی ئەم بڕیارە دیاری کران.

هەروەها وەفدی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ پێک هاتبوون لە «فەتاح کاویان، حوسەین مەدەنی، کەماڵ کەریمی» .

بەدوای هەڵگرتنی بایکۆت لە کۆنگرەی دەیەم لە سەر «ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ» هاتوچۆکان بۆ لای یەکتر چڕتر بوونەوە. پاش دوو جار سەردانی بەرپرسانی «حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ـ ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ» و هاتنیان بۆ دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکرات، ئامادەیی خۆیان بۆ یەکگرتنەوە ڕاگەیاند.

لە یەکەم کۆبوونەوەی تەقسیمی کاری کومیتەی ناوەندیدا باسێکی تێروتەسەل لەو پیوەندییەدا هاتە ئاراوە کە بە گشتی دەتوانین بۆچوونەکان لە دوو تەیفدا باس بکەین: تەیفێک کە زۆرینەی کومیتەی ناوەندیی پێک دەهێنا و لە ڕاستیدا بڕیاری شکاندنی بایکۆت و تەنانەت یەکگرتنەوەشی لە کۆنگرە بە پەسەندکردن گەیاندبوو، بێجگە یەک و دوو نەفەریان نەبێ کە نەزری هێندێک جیاوازیان هەبوو، هەموویان سوور بوون لە سەر یەکگرتنەوە، بەڵام جیاواز بیریان دەکردەوە، ئەوی دیکەشیان بیری یەکگرتنەوەی هەبوو کە دیارە لە ناوەڕۆکدا هەر یەک قسە بوو. کەمایەتیی کومیتەی ناوەندیش پێی وابوو ماوەیەکی زۆرتر بدری بە یەکگرتنەوە جارێ بایکۆتەکە بشکێنین و پێکەوە هاوکاری بکەین، ئەگەر دەرکەوت کە زەمینە لەبارە بۆ یەکگرتنەوە، لە قۆناغی دووهەمدا ئەم کارە بکرێ، هەرچی بێ، پاش ئەم کۆبوونەوەیە و لە ١٣٧٤/٣/١٩دا ڕۆژی هەینی وەفدێکی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە پێک هاتبوون لە: عەبدوڵڵا حەسەنزادە، حەسەن شەرەفی، باباعەلی میهرپەروەر، تەیموور مستەفایی، ئیسمایل بازیار، سلێمان کەلەشی، کەریم مەهدەوی، لەگەڵ وەفدێکی ڕێبەرایەتی شۆڕشگێڕ کە پێک هاتبوو لە: جەلیل گادانی، حەسەن ڕستگار، هاشم کەریمی، سەرهەنگ قادری، کەماڵ کەریمی، عوسمان ڕەحیمی، هاشم ڕۆستەمی، لە «دۆڵە ڕەقە» کە

ناوەندی دەفتەری سیاسـیی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ بوو، لە دەوری یەک کۆ بوونەوە.

پاش قسـەکردن لـە کولیاتی یەککرتنـەوە یان پێکـەوە کارکردن بڕیار درا کە دانوسـتان بۆ ئەم مەبەستە دەست پێ بکا و هەوڵەکان بـۆ یەککرتنـەوە بێت، بەڵام ئەگەریش لە کۆتاییـدا یەککرتنەوەی لێ نەکەوتەوە، لانیکەم لە سـەر پێکەوە کارکردن سـاغ دەبنەوە. بۆ ئەم مەبەستە هەر لایەک نوێنەری خۆیان بۆ وتووێژ لە سەر یەککرتنەوە ناسـاند. وەفدی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێـران پێک هاتبوو لە «حەسەن شـەرەفی، تەیمور مستەفایی، سلێمان کەڵەشی». پاش کۆبوونەوەیەکـی کومیتـەی ناوەنـدی داوا کـرا کـە وەفدەکە زیاتر بکرێ. لەم بارەوە «قادر وریا»ش پێی زیاد کرا. وەفدی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ پێک هاتبوون لە «فەتاح کاویان، حسێن مەدەنی و کەماڵ کەریمی».

سـەرەتای وتووێژەکان وەفدی ڕێبەرایەتی بە دوو باڵ دەسـتیان پـێ کـرد و وەفدی حیزبیش بە هاوڕیی یەکتریـن. بە کورتی بە باڵ قبووڵ نەکران و وتووێژەکان درێژەی کێشا و لە ئاکامدا بە هێندێک فورموڵی هاوبەش گەیشتن کە لە خوارەوە ئاماژەیان پێ دەکەین:

مەسـەلەی سرنجڕاکێش ئەوە بوو کە «عەبدوڵلا حەسەنزادە» کە دروشمی هێنانەوە و تواندنەوەی هەڵگرتبوو لە کۆبوونەوەیەکی نزیک بە کۆتایی دانیشـتنەکاندا بە هاوێشتنی ناوی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ لـە گیوومەیەکـدا دەیهەویسـت ئۆتۆریتەی خۆی بە سـەر هەمواندا بسەلمێنێ، لە کاتێکدا کە هەم وەفدی حیزب و هەم ڕێبەرایەتیی حیزب دەیانکوت ئێسـتا کە بڕیاری هاتنەوە یـا یەککرتنەوە یا هەر ناوێکی لێی دەنێن گەیشتووەتە کۆتایی، باش نیە بە گیوومەیەک پەکی بخەی کـە دیارە ناوبراو زانیاریی زۆر باشـی لە ڕێبەرایەتیی شۆڕشـگێڕ پێ گەیشـتبوو و دەیزانـی کە وەزعی ماڵـی و ناوخۆییان لەوپەڕی

خراپیدایە ئەم هەوڵەشیان بۆ خۆ دەربازکردن لەو وەزعەیە.
یەکگرتنەوە لە چەند خاڵدا بە ئیمزای سەرۆکی دوو وەفد « حەسەن شەرەفی و فەتاح کاویان « گەیشت کە دیارە لە ڕێکەوتی ١٩ /١٠ /١٣٧٥ی هەتاویدا پاش ٩ ساڵ دابڕان، ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ گەڕایەوە بۆ نێو حیزبی دێموکرات، بەڵام چ یەکگرتنەوەیەک؟ ئەگەر سەرەتای یەکگرتنەوەکە بە شایی و خۆشی دەستی پێ کرد و بە کۆڵێک قەرزەوە کە حیزب بۆی بژاردن، لە فێرگە پێشوازییان لێ کرا کە ئەمەشیان عەبدوڵڵا حەسەنزادە ڕێکی خستبوو و مانادار بوو. بە هاتنەوەیان پاش یەک دوو مانگ دەستەبەندییان دەست پێ کرد و بە کادر و پێشمەرگەکانی ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕیان دەگوت «هاوڕێیانی خۆمان» و بە ڕاستیش تا جاریکی دیکە کە لە ١٥/ ٩/ ١٣٨٥ی هەتاویدا لەگەڵ جەمعێکی چەند قاتی خۆیان لە حیزب جیا بوونەوە و هەروەک کوتلەیەک لە نێو حیزبدا کاریان دەکرد و یەکگرتوویی خۆیان لە نێو حیزبدا پاراستبوو، هەر بۆیە کاتێک کە ئینشعابی کۆنگرەی سێزدەهەم رووی دا، تەنانەت یەک تاقە نەفەریشیان لەگەڵ حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران نەمایەوە، لەم لاشەوە بەشی زۆر لە کادر و پێشمەرگەکانی حیزب ئەوانیان لە کاتی هاتنەوەیان تا دووبارە جیابوونەوەیان بە «لادەر» ناو دەبرد.
ئەمەش دەقی ڕێککەوتننامەکەی نێوان حیزب و ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ:

## ڕێککەوتننامە

بە ئیمان بە ڕەوا بوونی خەباتی شۆڕشگێڕانەی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و بە لەبەرچاو گرتنی قازانج و مەسڵەحەتی بەرزتری کورد و بۆ بەهێزتر کردنی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بە تایبەت لەم قۆناغە لە مێژووی خەباتی گەلی کورددا، هەیئەتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و «حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ» لە سەر ئەم خاڵانەی خوارەوە ڕێک کەوتن.

١- لە ڕۆژی ئیمزاکرانی ئەم ڕێککەوتننامەیەوە «حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ» تێکەڵ بە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دەبێتەوە و وەک ڕەوتێکی سیاسی بەو ناوە نامێنێ.

٢- هەتا کۆنگرەی یازدەهەم ئەو هاوڕێیانەی کۆمیتەی ناوەندیی «ڕێبەرایەتی» کە لە کۆمیسیۆنەکانی ڕێبەری کاریان کردوە، لە کۆمیسیۆن و کۆمیتەکانی دەوروبەری دەفتەری سیاسیی حیزب کاریان پێ دەسپێردرێ. ئەگەر بە موافەقەتی خۆیان و بە سەلاحدیدی حیزب بنێردرێنە کۆمیتەکانی مەڵبەند و شارستان.

٣- ئەو کادر و پێشمەرگانەی «ڕێبەرایەتی» کە لە کۆمیتەکان کاریان کردوە، دەنێردرێنە کۆمیتەی هاوتای خۆیان لە حیزبدا و کاریان بۆ دیاری دەکرێ. لەو شوێنانە کە بە پێویست دەزانرێ، یەک یان دوو کەس لەو هاوڕێیانە بە ئاگاداری و موافەقەتی کۆمیسیۆنی سیاسی ـ نیزامی دەکرێنە موشاویری کۆمیتەی مەڵبەند یان شارستان.

٤- لە بارەی پلەی تەشکیلاتیەوە، ئاییننامەی پلەی کادر و پێشمەرگە کە تا ئێستا لە بارەی کادر و پێشمەرگەکانی حیزبەوە بەڕێوە چووە، لە سەر هەموو کادر و پێشمەرگەکانی «ڕێبەرایەتی» پیادە دەکرێ.

٥- تەشکیلاتی نهێنیی «ڕێبەرایەتی» لە ڕێگای مەسئوولیەوە بە بەرپرسی کۆمیسیۆنی سیاسی ـ نیزامیی حیزب دەناسێندرێن و کار لە گەڵ ئەو تەشکیلاتە بە هاوکاریی بەرپرسانی ئاشنایەتی درێژە دەدرێ.

٦- لە دەرەوەی وڵات، لەو شوێنانە کە حیزب کۆمیتەی دامەزراوی هەیە، ئەندامان و بەڕێوەبەرانی کۆبوونەوەکانی «ڕێبەرایەتی» لەگەڵی «ئیدغام» دەکرێن. بەرپرسی کۆمیتەی «ڕێبەرایەتی» لە هەر وڵاتێک دەبێتە ئەندامی کۆمیتەی حیزب لەو وڵاتە و یەک یان دوو کەس لە ئەندامانی دیکەی کۆمیتە، دەکرێنە موشاویری کۆمیتەی حیزب. لەو وڵاتانەش کە حیزب کۆمیتەی دامەزراوی نیە، ئەندامان و لایەنگرانی هەردوولا پێکەوە هاوکاری دەکەن، هەتا دەگەنە کۆنفرانس و کۆمیتە هەڵدەبژێرن.

٧- «ڕێبەرایەتی»، پێوەندییەکانی دەرەوەی تەحویلی بەشی پێوەندییەکانی حیزب دەدا و هەموو پێوەندییەکان لەو کاتەوە دەگیرێن. بەشی پێوەندییەکانی دەرەوەی حیزب لە سەر هێشتنەوە یان داخستنی بنکەکانی پێوەندیی دەرەوەی «ڕێبەرایەتی» بڕیار دەدا.

٨- ڕێبەرایەتیی حیزب لە سەر درێژەدان یان کۆتایی پێهێنانی پێوەندی لەگەڵ ئەو لایەنانە کە حیزب پێوەندیی لەگەڵیان نەبووە، بەڵام «ڕێبەرایەتی» هەیبووە، بە ئازادی حیزب بڕیار دەدا.

٩- هەموو ئیمکاناتی تەداروکاتی، چەک و تەقەمەنی، ڕادیۆ و چاپەمەنی، کەرەسە و مەوادێک و بە گشتی هەرچی دارایی «ڕێبەرایەتی» یە، لە ژێر چاودێریی هەیئەتێکی هاوبەشدا، تەحویلی حیزب دەدرێ، بەو تێبینییەوە کە ئارشیوی ڕادیۆ و چاپەمەنی وەک بەشێک لە ئارشیوی حیزبدا ڕادەگیرێ.

١٠- شەهیدان و کەمئەندامانی هەردوولا بێ جیاوازی، وەک شەهیدان و کەمئەندامانی حیزب چاویان لێ دەکرێ.

١١- ئەو ئیتهامانەی لە بارەی ئەمنییەتیەوە گومانیان لە سەر بووە، لە هەر لایەک بووبن، لە ڕیزەکانی حیزب

دەردەکرێن.

١٢- هەروەک تا ئێستا لە حیزبدا باو بووە، هەر کەس بیهەوێ لە کۆنگرەدا ببێتە ئەندامی کومیتەی ناوەندی، دەبێ ئامادە بێ لە کوردستان کار بکا. ئەگەر ژن و منداڵیان لە دەرەوەی وڵات بوون، هەقیان هەیە لە نێوان دوو کۆنگرەدا جارێک و ئەوپەڕەکەی بۆ ماوەی سێ مانگ بە خەرجی خۆیان سەردانی ماڵ و منداڵیان بکەن. بۆ ئەم مەبەستە حیزب دەبێ بە پێی ئیمکان لە باری ویزا و پاسپۆرتەوە کۆمەگیان بکا.

تێبینی :

١. ئەوەی ئەم بڕگەیە بشکێنێ، ڕێبەرایەتیی حیزب بڕیاری لە سەر دەدا.

٢. ماوەی دیاریکراو مەشروطییەتی حیزبی ناگرێتەوە.

١٣- لە نێو ڕیزەکانی «ڕێبەرایەتی»دا ئەو کەسانەی بە مەبەستی چوونەدەر ناوی خۆیان لە U.N نووسیوە، دەبێ پەروەندەی خۆیان لەو ڕێکخراوە وەرگرنەوە و ناوی خۆیان وەک خوازیاری پەنابەری ڕەش بکەنەوە. ئەوانەی ئەم بڕیارە بەڕێوە نەبەن، وەک ئەنجامانی دانیشتووی حیزب دەناسرێن و دەبێ ئەوپەڕەکەی لە ماوەی سێ مانگدا ماڵەکانیان لە کەمپەکانی حیزب ڕاگوێزن.

١٤- برادەرانی «ڕێبەرایەتی» سەرچاوەکانی داهاتیان لە ئیختیاری حیزب دەنێن و هەوڵ دەدەن بە ئازادی حیزب کەلکیان لێ وەربگیرێ.

١٥- ئەسڵی سانتراڵیزمی دێموکراتیک و پەیڕەویی کەمایەتی لە ڕای زۆرایەتی لە هەموو ئۆرگانەکانی حیزبدا بەڕێوە دەچێ.

١٦- بە مەرجێک بەیاننامەی هاوبەش هەتا ئاخری بەفرانباری ساڵی ١٣٧٥ی هەتاوی بڵاو بکرێتەوە، کۆنگرەی یازدەهەمی حیزب لە ساڵی ١٣٧٦دا دەبەسترێ.

١٧- بیست کەس لە کادری ڕێبەرایەتیی «حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ» بە پێشنیاری دەفتەری سیاسیی «ڕێبەرایەتی» بە بێ هەڵبژاردن لە کۆنفرانسدا لە کۆنگرەی ١١ دا بەشدار دەبن، بەو مەرجە ئەوانەی لە دەرەوەن پێش کۆنگرە بە خەرجی خۆیان بگەڕێنەوە کوردستان. «دەفتەری سیاسیی ڕێبەرایەتی»ی پێشوو دەبێ تا چوار مانگ دوای ئیمزای ئەم ڕێککەوتننامەیە ناوی ئەو بیست کەسە بدا بە دەفتەری سیاسیی حیزب.

١٨- هەر بڕیار و بەخشنامەیەک لە ١٣٦٦/١٢/٢٩ بەم لاوە لە لایەن هەر لایەکەوە دەرچووبێ، ئەگەر پێچەوانەی ناوەرۆکی ئەم ڕێککەوتننامەیە بێ، بەتاڵ و بێ ئیعتیبارە.

١٩- لە هەر جێگایەکی ئەم ڕێککەوتننامەیەدا ناوی «ڕێبەرایەتی» هاتوە، مەبەست «حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ»ە، و لە هەر جێیەکیش ناوی حیزب هاتوە، مەبەست حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانە.

٢٠- ئەم ڕێککەوتننامەیە لە سەرەتایەک و بیست بەند و دوو تێبینی پێک هاتوە، بە زمانی کوردی نووسراوە و ڕۆژی شەممە ٨ی بەفرانباری ١٣٧٥ ئیمزا کراوە.

لە<br>کومیتەی ناوەندیی<br>حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران<br>٨/١٠/١٣٧٥

لە<br>کومیتەی ناوەندیی<br>«حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران،<br>ڕێبەرایەتیی شۆڕشگێڕ»<br>١٣٧٥.١٠

## ■ ٥٩: تۆپبارانی کەمپی ئازادی (١٣٧٥)

رۆژی ٥ی گەلاوێــژی ١٣٧٥ ســتوونێکی دوو هــەزار کەســی لە هێزەکانی رێژیمی ئێران لە دوو ســنووری باشــماخ و ســاوجییەوە هاتنە کوردســتانی عێراق و بەرەو شــاری ســلێمانی هاتن و شــەو لە «معەســکەر (پادگان) ســەلام»ی ئەو شارە مانەوە. پاشنیوەڕۆی رۆژی ٦ی گەلاوێژ بەرەو شــاری کۆیە کەوتنە رێ. ئێوارەی هەمان رۆژ لە بەرزاییەکانی هەیبەت ســوڵتان جێگیر بوون و نزیکەی ٢٠٠ کەســیان رۆیشــتنە شــارۆچکەی «تەقتەق» بۆ ئــەوەی گەمارۆکە تەواو بکەن. کەرەســتەی نیزامیی ئەم هێزە ئەمانە بوون: کاتیۆشای ٤٠.٤٠: شــەش قەبزە، تۆپخانــەی ١٣٠ و ١٥٥ میلیم: ١٢ قەبزە، دوو ســەکۆی مووشــەکهاوێژ جــۆری ٢٥٠ م.م. فەرمانــدەری ئەم هێزە پاســدار «موحەممەدی جەعفەریی سەحراڕوودی» بکووژی دکتور قاســملووی نەمر بوو، جێگرەکەشــی «ســەردار ئەحمــەد کازمی» یەکێــک لــە بەرپرســانی یەکەمــی قــەرارگای حەمزە بــوو. تۆپ و خومپارەبارانــی مەقەڕەکانی حیزب کاتژمێــر ٦:١٠ی بەیانیی رۆژی ٧ی گەلاوێــژ دەســتی پێ کرد. ئــەم هێزە لە دوو شــوێنەوە رێگای گەڕانــەوەی هەبوو: یەکەم ســنووری لای سەردەشــت، دووهەم بە «دۆڵی بالیسان»دا کە سەیتەرەکەی پارتی لە رێگای گەڕانەوەیان بە وێــدا رێگەیان پێ نەدابوون، بۆیە ناچار بوون بە رێگای بێســتانە و سلێمانی ـ قەڵاچۆلان و سنووری «ساوجی»دا بگەڕێنەوە.

لە پێوەندی لە گەڵ ئەم هێرشەدا، خەڵکی پەنابەری کوردی ئێران و ژمارەیەکــی کەم لــە کوردانــی عێراقیش بە وەســتان و مانگرتن لــە بــەر درگای «یوو ئێــن» لە هەولێر بــە دەرکردنــی بەیاننامەی جۆراوجۆر لە دژی ئەم هێرشە و بە پشتیوانی لە حیزبی دێموکرات، ناڕەزایەتیی خۆیان دەربڕی. لێرەدا هەڵویســتی حیزبی شیوعی زۆر بەرپرســانە بــوو و تا کۆتایــی رووداوەکە هــاوکاری حیزب بوون،

تەنانــەت بەرپرســانیان بــەردەوام بــۆ هاوکاریکردن لــە پێوەندیدا بوون. دانیشــتوانی کەمپی ئازادیــی حیزب روویان لە هەولێر کرد و نزیک بە ٢٠ رۆژ لە بەر درگای «یوو ئێن» مانیان گرت، پاشــان بە هەماهەنگیی حیزب و نوێنەرایەتیی «یوو ئێن» لە هەولێر، گەڕانەوە شــوێنە وێرانکراوەکانیــان کە چەنــد هەواڵنێریش لــەم ئۆردووگایە هــەوال و راپۆرتیان ئامــادە کردبوو، ئــەم نارەزایەتییە هەروەها لە ئورووپایش درێژەی هەبو کە زور رێکخراوی ئورووپایی، ئێرانی و کوردی، وێڕای مەحکوومکردنــی ئەم جەرەیانە، نارەزایەتیی خۆیان بەرانبەر بەم کردەوەیە دەربڕی.

دەفتــەری سیاســیی حیــزب رۆژی ١٣٧٥/٥/٢٠ بەیاننامەیەکــی دەرکرد و تێیدا وێڕای ئاماژە بە شکستی حەرەکەتی رێژیم، رێزی لە هەڵوێستی هەموو ئەو کەسانە گرت کە لەم رووداوەدا پاڵپشتی حیزبی دێموکرات بوون و هاوسۆزیی خۆیان لەگەڵ حیزب دەربڕی.

لەم ســاڵانەی دواییدا دەرکەوت کە لە پێوەندی لەگەڵ ئەو هێرشــەدا دەفتــەری سیاســیی حیــزب لەگــەڵ یەکێتیی نیشــتمانیی کوردســتان رێککەوتننامەیەکیــان واژۆ کــردووە کــە بە داخەوە قــەت لە کومیتەی ناوەندی باسی لێ نەکرا و کومیتەی ناوەندیی لێ ئاگادار نەکرایەوە کە ئەم جۆرە رێککەوتنە جێگەی داخە.

هەڵوێســتی دەفتــەری سیاسی ســەبارەت بــە هاتنی ئــەو هێزە لە پێوەنــدی لەگەڵ یەکێتیدا زور لاواز بوو. لــە بەر ئەوەی کە یەکێتی وە پێش هێزەکە کەوتبوو، لە کۆبوونەوەیەکی هاوبەشــدا پاش گەڕانەوەی ئەو هێزە دوکتور کەمال فوئاد، ئەندامی مەکتەبی سیاســیی یەکێتی بەم چەشنە باسی لە رووداوەکە کردبوو:

«پێمان ناخوش بوو سەرجەممان کە هێزەکانی ئێران هاتنە ژوورەوە، هــەر وەک تورکیەش پێمان فێرە، هیچ هێزێک لە یەکێتیی نیشــتمانی لە ئێــوەوە نزیکتر نیە، ئێرانییــەکان هێندێک پێشــنیاریان هەیە هیوادارین

بـێ وەڵام نەمێنێتەوە، هەوڵ بـدەن کارێک نەکەین زیانی هەبێ بۆ هەر دوو لامـان. ئەوەی ئێران داوای دەکا لە عورفی نێودەوڵەتیدا دروسـتە و ئێمە ناتوانین دەسـت لـە ئێران هەڵگرین. ئەوەی کـە وەکوو یەکێتی تۆ بێی شـەڕی حیزبـی دێموکرات بکـەی، تەحوویلی بدەیـەوە لەگەڵ ئەوەی کە ئێستا هەیە فەرقی هەیە. ئێمە دەمانهەوێ ئێرانی لێ بپارێزین (دوژمنایەتییەکەی پێ رابگرین).

هاتنی ئێمە دەبێ جێگای تەقدیر بێ. ئەگەر ئێمە نەبین، خراپتر دەقەومێ و ئێمەش تەئسیرمان زۆرە. کەوتووینە حاڵەتێک کە ئێران سنووری ئێمە ببەزێنـێ و بێتـە ژورەووە. ئێمە گلەییمان لە حیـزب هەیە کە زرووفی ئێمەی لە بەرچاو نەگرتووە، ئێمە ناڵێین واز لە خەباتی چەکداری بێنن، ئێمە دەڵێین جارێ رایبگرن، خەباتی سیاسی ئازادیی تەواوی تێدا هەیە. ئـەو کات ئەوە کرا، لەگەڵ ئێرانییەکان دادەنیشـین. لەگەڵ ئەوەی ئێوە خەباتـی چەکداری رادەگـرن، ئەوانیش یانی ئێرانییەکانیش دەسـت لە تیرۆر هەڵبگرن، ئەگەر دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکرات لە ناوچەی ئێمە بێ ناتوانین ئەوە قبووڵ بکەین.

## ■ ٦٠: بزووتنەوەی ئیسلامی و رادەستکردنی تێکۆشەرانی دێموکرات بە کۆماری ئیسلامی (١٣٧٥)

لـە رێکەوتی ١٣ی رەزبەری ١٣٧٥ی هەتاویدا کومیتەی شارسـتانی پاوە بڕیاری ناردنەوەوی تیمێکی حەوت کەسـیی بۆ نێوخۆی وڵات دا، تەرکیبی ئەم تیمە حەوت کەسییە پێک هاتبوو لە:

> «ئەرشـەد رەزایـی، محەممـەد عەزیـز قـادری، یوونـس محەممەدپوور، عەدنان ئیسـماعیلی، موزەفەر کازمی. داریووش ئیسلامدووست».

لە ماوەی مەئموورییەتی ئەم تیمەدا لە ناوچەی پاوە رێژیم بە هەموو هێزییـەوە هـەوڵ دەدات تیمەکە بخاتـە داوەوە و زەربەیـان لێ بدات،

بەڵام بە هۆی وریایی ئەم تیمەوە ڕێژیم بە مەبەستەکەی ناگات. ڕێگای گەڕانــەوەی ئــەم تیمە بۆ تانجەڕۆ لە سـلێمانی لە ڕێـگای هەڵەبجەوە دەبێت و ئەو کات هەڵەبجە لە ژێر دەســەڵاتی بزووتنەوەی ئیسـلامیدا دەبێ.

کومیتــەی پاوە لە وەزعی ئاڵـۆزی ناوچەکە تێ دەگا و هەوڵ دەدات پێوەنـدی بـکات بە تیمەکــەوە کە ســەرکەوتوو نابن تا لە یــەک کاتدا تیمەکــە ڕۆژی ٢٧ی ڕەزبــەری ١٣٧٥ی هەتــاوی پــاش ئەنجامدانــی مەئموورییەتەکەیــان بەرەو مەقەڕەکانیان دەگەڕێنەوە و بە ماشـینێکی نەفەرهەڵگــر لە هــاوارەوە بەرەو هەڵەبجە دەکەونــە ڕێ کە لە گوندی «عەنەب» ســەر بە هەڵەبجە دەکەونە بۆســەی هێزێکی بزووتنەوە، بە فەرماندەهیی «ئەنوەر عەنەبی» و ڕادەگیرێن، ئەم هاوڕێیانەش خۆیان بە بزووتنەوە دەناسێنن کە پێشمەرگەی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێرانن، بەڵام بەو حاڵەش بە قسەی خۆیان بە ڕواڵەت بۆ هاوکاریکردنیان دەیانبەنە مەقەڕەکانی بزووتنەوە لە «عەنەب» و هەر ئەو شــەوە واتە شــەوی ٣٠ی ڕەزبەر دەگوازرێنەوە بۆ پاوە و تەحویلی ئیتلاعاتی پاوە دەدرێن کە ئەم هەواڵە بە زووترین کات لە پاوەوە دەدرێ بە حیزب.

حیزبی دێموکرات هەم لە ڕێگای کومیتەی شارستانی پاوە و هەم لە ڕێگای نوێنەرایەتیی هەولێر و ســلێمانییەوە داوا لە بزووتنەوە دەکا کە حیزبی دێموکرات لە چارەنووسی هاوڕێیانی ئاگادار بکاتەوە، بزووتنەوە خۆی لەم حەرەکەتە بە بێئاگا نیشان دەدات.

پــاش دڵنیابوون لــەوەی کە ئەم تێکۆشــەرانە تەحویــل دراونەتەوە، دەفتەری سیاســیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە ڕۆژی ٩ی خەزەڵــوەری ١٣٧٥ی هەتــاوی بەرانبــەر بــە ٣٠ی ئۆکتۆبری ١٩٩٦ی زایینــی لــە ڕاگەیەندراوێکــدا خەڵکــی کوردســتان و کــۆڕ و کۆمەڵــە ئازادیخواز و بەشەردۆســتەکان لەو خیانەتە ئــاگادار دەکاتەوە و داوا لــە بزووتنــەوەی ئیســلامی دەکات کــە لەباتیی پەردەپۆشــکردنی ئەو

کردەوەیە، ئەنجامدەرانی بە سـزا بگەیەنن و بەو کارە نیشـان بدەن کە لـەم پیلان و تاوانە پڕ لە شـورەییەدا ڕێبەرایەتیی بزووتنەوە بەشـدار نیـە و ئەمە سیاسـەتی بزووتنەوە نیـە، بەڵام بێدەنگیـی بزووتنەوە و پاسـاوهێنانەوەی نـاڕەوا دەری خسـت کە ئەم کردەوەیـە بە بڕیاری ڕەسمیی بزووتنەوە و لە سەرەوەی هەموویانەوە «مەلا عەلی» ڕێبەری بزووتنەوە دەرکراوە.

ڕاسـت لە سـەروبەندی ڕادەسـتکردنەوەی ئەو تێکۆشـەرانەدا بوو کـە کەسـێک بە نـاوی «محەممەد حەسـەن» پێوەندیی بە بەرپرسـی نوێنەرایەتیی هەولێری حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێرانەوە کرد و بـە زمانی عەلی باپیرەوە و وەک نوێنەری عەلی باپیر ئەو کردەوەیەی پشتڕاسـت کـردەوە و گوتـی: «ئـەو کردەوەیـە کاری مـەلا عەلـی عەبدولعەزیز و ئەنوەر عەنەبییە و ئەوانیش وەک بەشێک لە بزووتنەوە ئەو کردەوەیە مەحکووم دەکەن و ڕادەگەیەنن لەوانەیە ماوەیەکی دیکە لە بزووتنەوەدا ئینشعاب ڕوو بدات». کۆماری ئیسلامی و بزووتنەوەی ئیسـلامی زۆریـان هـەوڵ دا مەسـەلەکە بە لاڕێـدا بـەرن و تەنانەت بەرپرسـایەتییەکەی بخەنە ئەسـتۆی یەکێتیی نیشـتمانیی کوردستان، بەڵام بەڵگە و سەنەدەکان بە ڕادەیەک ڕوون و حاشاهەڵنەگر بوون کە هیچیان پێ نەبڕا بێجگە لە ڕیسوایی و سەرشۆڕیی زیاتر.

«داریووش ئیسلامدووسـت» یەکێک لەو حەوت کەسە گیراوە کە لە ڕێگای خۆشکەزاکەیەوە بە ناوی عەدنان کە پێشتر هاوکاری بزووتنەوە بـووە، لـە چوارچێوەی پیلانێکدا کـە ئیتلاعات بە مەرجـی ئازادبوونی داریـووش بۆی دادەنـێ، دەگەڕێنرێتەوە بۆ کوردسـتانی عێراق کە بە هۆی داریووش ئیسلامدووسـت و زانیاریی حیزب لەو بارەوە پیلانەکە پووچـەڵ دەکرێتـەوە و داریووش ئـازاد دەبێ، لـە وتوویژێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی «کوردسـتان» خەیانەتەکەی بزووتنەوە بەم چەشـنە باس دەکات و دەڵێ:

شــەوی ١٣٧٥/٧/٢٧ی هەتــاوی لە کاتــی گەڕانەوەمان لــە ناوچەی هەورامانــی کوردســتانی ئێران و لە «هــاوار» بە هــۆی ئۆتۆمبیلێکی شەخســییەوە کــە خاوەنەکەی ناوی «عومەرە» بــوو، بەرەو هەڵەبجە وەڕێ کەوتین. کاتژمێر نزیکی ٨ی شــەو لە نزیک گوندی « عەنەب « جەماعەتێــک چەکدار پێشــی ئێمەیان گرت و داوای کارتی شناســاییان لێ کردین، ئێمەش دەســتبەجێ داوامان لەوان کرد کە خۆیان بناسێنن، هەم شــۆفیرەکە ئەوانی دەناســی و وتی بزووتنەوەی ئیسلامین و هەم خۆشــیان گوتیــان جەماعەتی بزووتنــەوەی ئیســلامین. ئێمەش داوای هاوکاریمــان لێ کردن بۆ گەڕانەوەمان بــۆ بنکەکانی خۆمان. ئەوانیش بەڵێنیی هاوکارییان پێ داین. پاشــان بە شــۆفیری ماشــینەکەیان گوت «تــۆ بڕۆ» و بردینیانە مەقەڕی خۆیان و ســەعات ٤ی شــەو چەکیان کردیــن و چاویان بەســتین و فڕێیان داینە ناو ماشــینێکەوە و ئاگامان لێ نەبوو بەرەو کوێمان دەبەن تاکوو بەیانی لە پاوە لە دەرکی ســپای پاسداران خۆمان بینییەوە.

لەو ماوەیەدا حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە ناردنی نامە بۆ ڕێکخراوە دێموکراتەکان و کۆڕ و کۆمەڵە بەشەردۆستەکان، سکرتێری گشــتیی ڕێکخــراوی نەتــەوە یەکگرتــووەکان و لــە ڕێــگای دوکتــور «گرانژۆن»ەوە بۆ باڵوێزخانەی ئێران لە فەرانسە و نامەی سەوزەکانی پارلەمانــی ئۆتریش بۆ وەزیری دەرەوەی ئۆتریــش داوا کرا کە گیانی ئەو تێکۆشــەرانە لە مەترســیدایە و چارەنووســیان روون بکرێتەوە تا لــە کۆتاییــدا پاش ٨ ســاڵ و هەوڵێکــی زۆر لە ســاڵی ١٣٨٣ لە لایەن باڵوێزخانــەی بریتانیــاوە داوا لە ئێران کرابوو کــە ئاخر هەواڵی ئەو ٦ کەسەیان پێ بدات. ئێران لە وەڵامدا رایگەیاندبوو کە هەر ٦ کەسەکەیان ئیعدام کراون. دیارە لە جەریانی ئەو هەشــت ساڵەدا وەک ئاماژەی پێ درا، یەکێک لە گیراوەکان بە ناوی «داریووش ئیسلامدووست» بە هەر شێوەیەک توانی بگەڕێتەوە بۆ لای حیزب.

## ■ ٦١: تیرۆرەکان لە کوردستانی باشوور و عێراق (١٩٩١- ١٩٩٥)

لـە سـاڵانی خەباتـی حیزبەکەمانـدا بـۆ بـە دەسـتهێنانی مافـی نەتەوایەتییەکانـی گەلـی کـورد، خەباتگێڕانـی دێمۆکـرات بـەردەوام کەوتوونەتە بەر شـاڵاوی هێرشـی دەزگای تیرۆری کۆماری ئیسلامی و بە داخەوە بەشـێکی بەرچاو لەو تیرۆرانەش لە کوردستانی باشوور و لـە ناوچـەی ژێر دەسـەڵاتی کوردیـدا بەڕێوە چـوون و هەر چەند بەشـێکی زۆر لە تیرۆریسـتەکان ناسـراو بوون، بەڵام بەو حاڵەشەوە تا ئێسـتا تاقە تیرۆریسـتێکیش نەکەوتە بەر لێکۆڵینەوەی بەرپرسـانی هەرێمی کوردستان. لەوەش خراپتر بە داخەوە بەشێک لەو تیرۆریستانە ئەندامی حیزبە دەسـەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستان بوون. لووتکەی ئـەو ناحەقی و زوڵمەش تیرۆری دەروازەی کۆیە بوو کە بەڕێوەبەر و بەرپرسەکانیان سەر بە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون. سەرەڕای روون و ئاشـکرابوونی رووداوەکە، یەکێتی کەوتە هێنانەوەی پاساوی نابەجێ و لەوەش خراپتر، لە سـاڵی ٢٠١٤دا بەرپرسـی ئەو پرسـگەیە بە ناوی «حاجی مەسـیفی» کرایە بەربژێـری یەکێتی بۆ ئەندامەتی لە پارلەمانـی کوردسـتاندا کە ئەمـە بۆ جارێکی دیکە زامـی ئەو کردەوە نامرۆڤانەیەی لە لای ئەندامانی حیزب نوێ کردەوە.

تیـرۆری دەروازەی کۆیە کاتێک رووی دا کە تیمێک لە بەرپرسـانی حیزبی لە ناوچەی سـلێمانی بانگهێشـتی پلینیۆمـی کومیتەی ناوەندی کرابوون. نامەی دەعوەتی هاوڕێیانی بەرپرس بە هۆی سیخوڕێکەوە بە ناوی «ئازادی عەلی باڵە» خەڵکی مەهابادەوە کە کادرێکی حیزبی بوو و زۆر جێگای باوەڕی سکرتێری ئەو کاتی حیزب و لە خزمانی ناوبراو بوو، بەڕێ دەکرێت و ناوبراویش کۆماری ئیسـلامی لەو کۆبوونەوەیە ئاگادار دەکاتەوە. رۆژی دواتر رێژیم لە رێگای دووکان-کۆیە لە پێچەکانی دووکان کەمینێک بۆ لێدان و تیرۆری بەرپرسانی حیزبی دادەنێتەوە و لە شوێنی دیاریکراو تەقە لەو ئۆتۆمبیلی بەرازیلییە دەکەن کە بەرپرسانی

حیزبی تێدا بوون و لە ئاکامدا بەرپرس و پێشمەرگەکان دێنە دەست و تیرۆریستەکان راو دەنێن و دەست بە سەر ئۆتۆمبیلەکەیاندا دەگرن. لەم تەقە و پێکدادانەدا بە داخەوە، کاک مەنسوور فەتاحی، بەرپرسی کومیتەی شارستانی پاوە بە توندی بریندار دەبێ کە بە هۆی یەکێک لە پێشمەرگەکانەوە بە ناوی جەلال خەڵکی ناوچەی ئیناخی دەگەیەنرێتە بنکەی حیزب لە کۆیە. بە داخەوە کاک مەنسووریش سەعاتێک دواتر بە هۆی کاری بوونی برینەکەیەوە شەهید دەبێ. لێرەدا لەگەڵ ئەوەی تیرۆریستان بۆسەیان ناوەتەوە، بەڵام بە هۆی ئازایەتیی هاوڕێیانی حیزبی تێک دەشکێندرێن و هەڵدێن و بەرپرسانی حیزبیی دیکە کە پێک هاتبوون لە مەنسوور ناسری، بەرپرسی پێوەندییەکانی حیزب لە سلێمانی و ئەندامی رێبەری و ئەبووبەکر ئیسماعیلی ناسراو بە ساماڵ، بەرپرسی کومیتەی بانە، یەدوڵڵا شیرین سوخەن پێشمەرگە و رەفعەت حوسەینی پێشمەرگە بەرەو کۆیە وە رێ دەکەون کە بەداخەوە لە سەیتەرەی کۆیە بە بێ لێپرسینەوە لە نێو ئۆتۆمبیلەکەدا دەدرێنە بەر دەستڕێژی گوللە و هەر چوار کەسەکەیان شەهید دەبن. پێویست بە گوتنە، کاتێک کە بەڵگەکانی ناو ئۆتۆمبیلەکە بە دەستکەوت گیراوەکەی رێژیم کەوتە بەردەستی حیزب، ئازادی عەلی بالەش هەروەک گوترا زۆر نزیک بوو لە سکرتاریا و ئاگادار بوو کە یەکێک لەو مەدرەکانە کاسێتێک بوو کە ناوبراو راپۆرتی هاتنی هاوڕێیانی بۆ کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی تێدا باس کردبوو، بۆیە هەڵهات و گەڕایەوە بۆ ئێران بۆ باوەشی کۆماری ئیسلامی. ماوەیەک دواتر خەباتگێڕانی دێموکرات لە ناوچەی مەهاباد لە تۆڵەی ئەو کردەوە خائینانەیەدا بە سزای کردەوەی خەیانەتکارانەیان گەیاند.

ئەم بانگهێشتە بۆ دوایین کۆبوونەوەی کومیتەی ناوەندی، کومیتەی ناوەندیی هەڵبژێردراوی کۆنگرەی ١٠ بوو بەرەو کۆنگرەی ١١ دەڕۆیشتین زۆری لە سەر نەڕۆین و هەرکام لەم تیرۆرانە داستانێکی

تراژیکیان هەیە و تیرۆری وا هەیە کە تەنیا لە بەر تەلیسـە ئاردێک بە ڕێوە چووە کە فیلمی دانپێدانانی تیرۆریستەکەش لە بەر دەستدایە.

لێرەدا سـەرنجی خوێنەران بۆ ئامارێک لەو تیرۆرانە رادەکێشـین کە کۆماری ئیسـلامی راسـتەوخۆ یان بە هۆی دەستوپێوەندییەکانیەوە لە کوردستانی باشوور و عێراق دژ بە چالاکانی سیاسیی ئۆپۆزیسیۆن بە تایبەتی ئەندامان و کادر و پێشمەرگەکانی حیزبی ئەنجامی داون.

کۆی ئەو کەسـانەی لە کوردسـتانی عێراق هێرشـی تیرۆریسـتییان کراوەتە سـەر، بە ناوی ڕێکخراوەکانیانەوە لە سـاڵی ١٣٧٠ تا ١٣٧٥ی هەتاوی بەرانبەر بە ١٩٩١ تا ١٩٩٦ی زایینی:

| ناوی ڕێکخراو | کوردستان | | | عێراق | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | شەهید | بریندار | سەرجەم | شەهید | بریندار | سەرجەم |
| حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران | ٨٨ | ١٨ | ١٠٦ | ١ | - | ١ |
| کۆمەڵە | ١٢ | - | ١٢ | - | - | - |
| موجاهیدین | - | - | - | ٥ | - | ٥ |
| پەنابەر | ٢٠ | ٥ | ٢٥ | - | - | - |
| باقی هێزەکان | ٥ | - | ٥ | - | - | - |

تێبینی: زۆربەی هەرە زۆری پەنابەران ئەندام یان لایەنگری حیزبی دیموکرات بوون.

**اسامی شماری از اپوزیسیون ایرانی که در فاصلەی سالهای ۱۹۹۱ تا ۱۹۹٦ هدف سوء قصد عوامل جمهوری اسلامی قرار گرفتەاند:**

①

| ردیف | نام و نام خانوادگی | حزب یا سازمان سیاسی | تاریخ ترور | محل ترور | ساکن | کشته | زخمی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ۱ | عبدالله بیژن فر | دمکرات | ۱۹۹۰/۹/۲۰ | رانیه | مهاباد | + | − |
| ۲ | مام حبیب | کومله | ۱۹۹۱/٦/۵ | رانیه | سنندج | + | − |
| ۳ | کامران منصور (منوچهر) | اتحادیه کمونیستها | ۱۹۹۱/۷/۱ | سلیمانیه | − | + | − |
| ٤ | احمد گرد کشی | دمکرات | ۱۹۹۱/۸/۲۲ | سلیمانیه | اردبیل | + | − |
| ۵ | محمد (آرام) فتحی | کومله | ۱۹۹۱/۸/۲۷ | جاده‌ی زرگویز | سنندج | + | − |
| ٦ | صابر (صارم) فرهادی | کومله | ۱۹۹۱/۹/۱ | باوزی | سنندج | + | − |
| ۷ | جلیل ماماتی | دمکرات | ۱۹۹۱/۹/۲۹ | اندزه‌ی – بولی | پیرانشهر | + | − |
| ۸ | حسن طیبور (حسو) | دمکرات | ۱۹۹۱/۹/۲۹ | اندزه‌ی – بولی | پیرانشهر | + | − |
| ۹ | ملا رسول گردی | دمکرات | ۱۹۹۱/۹/۲۹ | اندزه‌ی – بولی | پیرانشهر | + | − |
| ۱۰ | سعید یزدانپناه | اتحادیه انقلابیون | ۱۹۹۱ | سلیمانیه | بوکان | + | − |
| ۱۱ | خالد سقزی | « خابات » | ۱۹۹۱ | رانیه | سقز | + | − |
| ۱۲ | محمد بابایی (حمه رهش) | پناهنده ایرانی | ۱۹۹۱ | سلیمانیه. | سقز | + | − |
| ۱۳ | کمال زورهی | پناهنده ایرانی | ۱۹۹۱ | دره‌ه‌شهیدان | سردشت | + | − |
| ۱٤ | عثمان زورهی | پناهنده‌ی ایرانی | ۱۹۹۱ | دره‌ه‌شهیدان | سردشت | + | − |
| ۱۵ | کمال قادرزاده | دمکرات | ۱۹۹۱ | پنجوین | مریوان | + | − |
| ۱٦ | محمد خضری | دمکرات | ۱۹۹۲/۱/۱۳ | سلیمانیه | سقز | + | − |
| ۱۷ | محمد رحمانی | دمکرات | ۱۹۹۲/٦/۲ | چومان | پیرانشهر | + | − |
| ۱۸ | علی تاتوره | دمکرات | ۱۹۹۲/٦/۰ | حلبچه | مریوان | + | − |
| ۱۹ | هادی محمودی | دمکرات | ۱۹۹۲/٦/۰ | حلبچه | اورامان | + | − |
| ۲۰ | سالار ساعدپناه | دمکرات | ۱۹۹۲/٦/۰ | حلبچه | سنندج | + | − |
| ۲۱ | فخرالدین مرادی | دمکرات | ۱۹۹۲/٦/۰ | حلبچه | سنندج | + | − |
| ۲۲ | ابراهیم شیخی (بالدار) | دمکرات | ۱۹۹۲/٦/۱۷ | جاده‌رواندز– اربیل | بوکان | + | − |
| ۲۳ | شاپور فیروزی | دمکرات | ۱۹۹۲/۷/۱ | رانیه | کامیاران | + | − |
| ۲٤ | ستار جلالی | دمکرات | ۱۹۹۲/۹/۱ | مام خطیب | تویسرد | + | − |
| ۲۵ | خدر الماس | دمکرات | ۱۹۹۲/۹/۱ | مام خطیب | اشنویه | − | + |
| ۲٦ | محمدامین نخرونی | دمکرات | ۱۹۹۲/۹/۱ | مام خطیب | پیرانشهر | − | + |
| ۲۷ | دکتر محمد صادق شرفکندی | دمکرات | ۱۹۹۲/۹/۱۷ | برلن | بوکان | + | − |
| ۲۸ | فتاح عبدلی | دمکرات | ۱۹۹۲/۹/۱۷ | برلن | نقده | + | − |
| ۲۹ | همایون اردلان | دمکرات | ۱۹۹۲/۹/۱۷ | برلن | سقز | + | − |
| ۳۰ | نوری دهکردی | تشکل چپ | ۱۹۹۲/۹/۱۷ | برلن | شهرکرد | + | − |
| ۳۱ | شاهرخ مرادی | دمکرات | ۱۹۹۲/۱۱/۱۳ | دربندیخان | سنندج | + | − |
| ۳۲ | انور ابراهیمی | دمکرات | ۱۹۹۲/۱۱/۱۳ | دربندیخان | سنندج | + | − |
| ۳۳ | صلاح مرادی | دمکرات | ۱۹۹۲/۱۱/۱۳ | دربندیخان | سنندج | + | − |
| ۳٤ | رشید رستمی | دمکرات | ۱۹۹۲/۱۱/۱۳ | دربندیخان | سنندج | + | − |

## ■ ٦٧: ڕاگەیەندراوی دەســتەی بەڕێوەبەریی ڕێزگرتن لە شــەهید دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو

لە بیستەمین ساڵی شەهیدکرانیدا (١٣٨٨)

هاونیشتمانە بەڕێزەکان!

کۆمەلانی بەشەرەف و مافخوازی کوردستان!

ئەندامان و لایەنگرانی تێکۆشــەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران!

٢٠ ساڵ لەمەوپێش لە پووشپەڕی ساڵی ١٣٦٨ی هەتاویدا، ڕێبەری مەزنی گەلی کورد و سکرتێری گشتیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، هاوڕێی تێکۆشــەر، کاک دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو، بە مەبەســتی چارەسەرکردنی ئاشــتیخوازانەی دۆزی ڕەوای نەتەوەی کورد گەیشــتە ڤیەن، پێتەختــی ولاتی ئۆتریش تا لەگــەڵ نوێنەرانی کۆماری ئیسلامی وتووێژ بکات، بەو هیوایەی کە کۆماری ئیسلامیی ئێران دەست لە سیاسەتی کوردکوشتن هەڵ بگرێ و پرسی نەتەوەی ١٠ میلیۆنیی کورد لە ئێراندا لە ڕێگای وتووێژەوە چارەســەر بکرێ. بەلام مەخابن لە ڕۆژی ٢٢ی پووشــپەڕی ١٣٦٨ی هەتاویدا، وەلامی پێغەمبەری ئاشــتی و مامۆســتای دێموکراســی بە گوللە درایەوە و هاوڕێ لەگەڵ کاک عەبدوڵلا قادری ئازەر ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و نوێنەری حیزب لە دەرەوەی ولات، شەلالی خوێن کرا و تێکەلأ بە کاروانی سوورخەلاتی شەهیدانی ڕێگای ڕزگاریی کوردستان بوو.

تیرۆرکرانــی ناجوامێرانــەی ڕێبەری مەزنی گەلــی کورد، دوکتور عەبدولڕەحمانی قاســملوو لە ســەر مێــزی وتووێــژ، ڕەتکرانەوەی خوێناویی پەیامی ئاشتی و تەبایی ئەو ڕێبەرە مەزنە بە نوێنەرایەتی لە گەلی کوردستانەوە بوو و لەو کاتەوە تا ئێستا، ڕێژیمی تیرۆریست پــەروەری کۆماری ئیســلامیی ئێران، بۆ ســەرکوتکردنی کۆمەلانی مافخوازی کوردســتان، لەو ئامرازە دزێوەی ســەرکوت و داپلۆسین

کەڵک وەردەگرێ و هیچ چەشنە گۆڕانێکی ئەرێنی لە سیاسەتە دژی گەلییەکانی ئەو ڕێژیمە ئازادیکوژەدا بەدی ناکرێ. بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو سەرکوت و زەبروزەنگە، گەلی کورد لە سەر داوا ڕەواکانی خۆی سوورە و قاسملوو گوتەنی «گەلێک ئازادی بوێ، دەبێ نرخی ئەو ئازادییەش بدات».

کۆمەڵانی مافخوازی خەڵکی کوردستان!

با لە بیستەمین ساڵڕۆژی تیرۆرکرانی ڕێبەری ناوداری کورد، دوکتور عەبدولڕەحمانی قاسملوودا، هەم سیاسەتی تیرۆر و ڕەشەکوژیی ئەو ڕێژیمە لە بیروڕای گشتیی خەڵکی ئێران و جیهاندا مەحکووم بکەین و هەم بە کوردکوژان بسەلمێنین کە ئاوات و ئامانجەکانی قاسملووی ڕێبەر، ئاوات و ئامانجی بە میلیۆنان کوردی بێبەش لە مافە نەتەوایەتییەکانیەتی و نەتەوەکەمان تا وەدیهێنانی سەرجەم ئامانجەکانی قاسملوو دەست لە خەبات هەڵ ناگرێ.

دەستەی بەڕێوەبەریی ڕێزگرتن لە ڕێبەری مەزنی گەلی کورد، دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو، لە ٢٠ەمین ساڵی شەهیدکرانیدا داوا دەکات:

١. داخستنی سەرجەم دووکان و بازاڕەکانی شار و شارۆچکەکانی کوردستان.

٢. کوژاندنەوەی چرای ماڵی هاووڵاتیان بۆ ماوەی ٣ خولەک لە کاتژمێر ١٠ی شەوی ٢٢ی پووشپەر بە کاتی تاران.

٣. هەڵکردنی ئاڵای سێ ڕەنگی کوردستان.

٤. هەڵکردنی ئاڵای شینی کاڵ و ئاسمانی و کەڵک وەرگرتن لەو ڕەنگە لە شێوەی جۆراوجۆردا.

٥. خۆپاراستنی گوندنشینان لە هاتوچۆ بۆ شارەکان لە ڕۆژی ٢٢ی پووشپەڕدا.

٦. هاتنە سەرشەقام و شوێنە گشتییەکان لە پاشنیوەڕۆی ڕۆژی

٢٢ی پووشپەردا، بە جلوبەرگی کوردییەوە.

٧. لە هەر شارێکی کوردستاندا، یەکێک لە شەقام یان گۆڕەپانەکانی شار بە ناوی شەقام یان گۆڕەپانی دوکتور قاسملوو ناودێر بکرێ.

ئەو شەقام و گۆڕەپانانەی کە بە ناوی دوکتور قاسملووی نەمرەوە ناودێر دەکرێن، بریتین لە:

| ریز | ناوی شار | ناوی شەقام یا مەیدان |
|---|---|---|
| ١ | ئیلام | «امام خمینی» |
| ٢ | ئەیوانغەرب | «امام خمینی» |
| ٣ | کرماشان | بلواری «بهشتی» |
| ٤ | گیلانغەرب | «جهاد» |
| ٥ | قەسری شیرین | «راه کربلا» |
| ٦ | سەرپێلی زەهاو | فەلەکەی «امام خمینی» |
| ٧ | کرند | راه کربلا |
| ٨ | شەهاباد | «باهنر» |
| ٩ | سەحنە | «امام خمینی» |
| ١٠ | روانسەر | خیابانی ئەسڵی |
| ١١ | جوانرۆ | مەیدانی بەسیج |
| ١٢ | پاوە | فەلەکەی شهدا |
| ١٣ | کامیاران | «خیابان بهشتی» |
| ١٤ | سنە | «خیابان پاسداران» |
| ١٥ | قوروە | «خیابان چمران» |
| ١٦ | دێگولان | «سێڕای جمهوری» |
| ١٧ | مەریوان | جمهووری |
| ١٨ | دیواندەرە | «خیابان امام خمینی» |
| ١٩ | سەقز | مەیدانی «قدس» |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٠ | سایین قەلا | فەلەکەی»قیام» |
| ٢١ | تیکاب | فەلەکەی «یادبود» |
| ٢٢ | بانە | مەیدانی «جهاد» |
| ٢٣ | رەبەت | «فەلەکەی جمهوری اسلامی» |
| ٢٤ | سردشت | «خیابان امام خمینی» |
| ٢٥ | بۆکان | بلواری «جمهوری اسلامی» |
| ٢٦ | مەهاباد | خیابان «جمهوری اسلامی» |
| ٢٧ | پیرانشار | مەیدانی «قدس» |
| ٢٨ | نەغەدە | «خیابان رجایی» |
| ٢٩ | شنۆ | «خیابان امام خمینی» |
| ٣٠ | ورمێ | «خیابان امام خمینی» |
| ٣١ | سەلْماس | «امام خمینی» |
| ٣٢ | ماکۆ | «جواد قنبری» |

هاونیشتمانە بەڕێزەکان!

خەڵکی مافخوازی کوردستان!

با هەموومان بە بەڕێوەبردنی ئەو حەوت خاڵە کە خستمانە پێش چاوی ئێوەی بەڕێز، ڕێز لە خەبات و تێکۆشانی ڕێبەری مەزنمان دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو بگرین و وێڕای مەحکوومکردنی تیرۆری ئەو مرۆڤە مەزنە، لە سەر ئارمانجە نەتەوایەتی و دێموکراتیکەکانی ڕێبەری مەزنمان کە ئارمانج و ئاواتی بە میلیۆنان کوردی بێبەش لە مافەکانیەتی، پێ داگرینەوە و بە نەیارانی نەتەوەکەمان بسەلمێنین کە ڕێبازی قاسملوو، ڕێبازی خەڵکی مافخوازی کوردستانە.

سڵاو لە گیانی پاکی ڕێبەری زانامان کاک دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو

سڵاو لە گیانی پاکی سەرجەم شەهیدانی ڕێگای رزگاریی

کوردستان
مەرگ و نەمان بۆ دوژمنانی ئازادی و مافی گەلان
دەستەی بەڕێوەبەریی ڕێزگرتن لە یادی شەهید دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو
لە ٢٠ەمین ساڵی شەهیدکرانیدا
سپاسنامە
لە پێوەندی لەگەڵ بەڕێوەچوونی سەرکەوتووانەی بیستەمین ساڵوەگەڕی تیرۆرکرانی دوکتور قاسملووی نەمردا
خەڵکی خەباتگێڕ و ئازادیخوازی کوردستان!
ئەندامان و لایەنگرە تێکۆشەرەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران!
لە ڕۆژی ٢٢ی پووشپەڕی ئەمساڵیشدا، سەرەڕای هەڕەشە و گوشاری لە ڕادە بەدەری هێز و ئۆرگانە بەکرێگیراوەکانی کۆماری ئیسلامی، وەلامدانەوەتان بە بانگەوازیدەستەی بەڕێوەبەریی یادی بیست ساڵەی شەهیدکرانی ڕێبەری مەزنی گەل، دوکتور قاسملووی نەمر، نیشانەی ڕێزدانانتانە بۆ خەبات و تێکۆشانی ئەم ڕێبەرەمەزنە و لەهەمان کاتدا دژایەتی و بێزاری دەربڕینە لە تیرۆریزمی کۆماری ئیسلامیی ئێران.
یەککگرتوویی بێوێنەی ئێوە بە داخستنی دووکان و بازاڕەکان، هاتنە سەر شەقام بە جلوبەرگی کوردی، کەڵکوەرگرتن لە ڕەنگی ئاویی ئاسمانی، نەهاتنی گوندنشینە خۆشەویستەکان لەو ڕۆژەدا بۆ شارەکان، هەڵکردنی ئاڵای سێ ڕەنگی کوردستان، کووژاندنەوەی چرای ماڵەکانتان بۆ ماوەی ٣ خولەک و سەرەنجام بە کردەیی کردنی ناوی ئەو شەقام و مەیدانانەی کە بە ناوی دوکتور قاسملووی ڕێبەر ناودێر کراون، جێگای ڕێز و قەدرزانینی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران و لە هەمان کاتدا نیشانەی سووربوونتان لە

پشتیوانیکردن لەم حیزبە خەباتکارە و ئامانجەکانیەتی.

هاونیشتمانە بەڕێزەکان!

یەکگرتوویی ئێوە لەم حەرەکەتە مەدەنی و ژیرانەیەدا هیوابەخشی دواڕۆژێکـی روون بـۆ گەلی کـورد و پەیامێکی قـورس و قایمە بۆ دوژمنان و نەیارانی گەلەکەمان کە بێگومان شـوێندانەرییەکانی ئەم حەرەکەتە لە داهاتوودا زیاتر رەنگ دەداتەوە و دەردەکەوێ.

سەرکەوتنی بەرچاوی گەلەکەمان لەم پانۆرامایەدا لە یەکگرتوویی و ئازایەتـی و بوێریی تەک تەکی ئێـوە خەباتگێڕانی رێگای ئازادیدا بـوو و دەبێ ئـەم یەکگرتووییە وەک گلێنەی چاو بپارێزین، چوونکە لـە داهاتووشـدا رەمـزی هەر سـەرکەوتنێکمان لـە یەکگرتوویی و یەکڕیزیدایە.

ئێمە لە حیزبی دیموکراتی کوردسـتاندا لە سـەر ئەو باوەڕەین کە دەکرێ و دەبێ وێڕای بوونی بیری جیاواز و فرەچەشن لە کۆمەڵگای کوردسـتاندا، پێکەوە هـاوکار و هاوخەبات بین لـە پێناو هێنانەدیی کۆمەڵگایەکی ئازاد و بەختیار و هەر ئەم هاوکاری و یەکگرتووییەش دەتوانێ رەمزی سەرکەوتنمان بێ.

لە هەرێمی کوردستانیش سەرەڕای کۆبوونەوەی گشتی لە بنکەی دەفتەری سیاسـی بە بەشـداریی کادر و پێشـمەرگە و بنەماڵەکانی حیزب، نوێنەرانی لایەنە سیاسییەکانی هەموو بەشەکانی کوردستان و کۆمەڵێک لە کەسـایەتییە سیاسی و رۆشـنبیرییەکانی کوردستان لەم رێورەسـمانەدا رێزیان لە خەبات و تێکۆشـانی قاسملووی نەمر گرت.

هەروەها لە بنکەی ناوەندی ٢ی کوردستان، لە شارەکانی هەرێمی کوردستان: هەولێر، سلێمانی و کەلار یادی ئەم رێبەرە هەڵکەوتووەی گەلەکەمان کرایەوە و چەندین کەسـایەتیی سیاسـی و زانسـتگایی قسەیان لە سەر رۆڵی دوکتور قاسملوو لە خەباتی رزگاریخوازانەی

کورددا کرد و ئەم خەباتەیان بەرز نرخاند.

لە دەرەوەی وڵاتیش چەندین کۆڕ و کۆبوونەوە و سمینار بە بەشداریی بەڕێز سکرتێری گشتیی حیزب و کەسایەتییە سیاسییە بیانی، ئێرانی و کوردستانییەکان بەڕێوە چوون، کە لە باس و بابەتەکانیاندا تیشکیان خستە سەر رۆڵی سیاسی و دیپلۆماسیی دوکتور قاسملوو و هەوڵە نێونەتەوەییەکانی ئەم رێبەرە ئاشتیخوازە و جارێکی دیکە داوایان لە حکوومەتی ئوتریش و کۆڕ و کۆمەڵە مرۆڤدۆستەکان کرد پەروەندەی ئەم تیرۆرە بخەنە بەرباس و رێبەرانی رێژیمی کۆماری ئیسلامی وەک بڕیاردەرانی ئەم تاوانە بە دادگای نێونەتەوەیی بناسێنن و بە سزای کردەوە جینایەتکارانەکەیان بگەیەنن.

دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، هەزاران سڵاو و سپاس دەنێرێ بۆ ئەو کەسانەی تەنانەت بە کردەوەیەکی بچووک لە بە سەرکەوتن گەیاندنی بانگەوازی دەستەی بەڕێوەبەریی بیستەمین ساڵیادی تیرۆرکردنی رێبەری شەهید دوکتور قاسملوودا هاریکار بوون و پیرۆزبایی ئەم سەرکەوتنە لە هەموو ئەو کەسانە دەکا کە بە ئیحساسێکی پاک و ئازاییەکی بێوێنەوە هاتنە مەیدان و ئەم سەرکەوتنەیان دەستەبەر و تۆمار کرد و هەروەها سپاسی ئەو کەس و لایەنانە دەکا کە بەشدارییان لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی بیستەمین ساڵیادی دوکتور قاسملووی شەهیدا کرد.

دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

١٣٨٨/٨/٢٣

نیشتمانی قاسملوو لە ٢٢ی پووشپەڕدا رابوو

راپۆرتی رۆژنامەی «کوردستان» لە حەماسەی ٢٢ی پوشپەڕی ساڵی ١٣٨٨:

بە پێی راپۆرتەکانی «هەواڵدەریی کوردستان» ئەمساڵ لە ٢٢ی

پووشپەڕدا، بیستەمین ساڵڕۆژی شەهیدبوونی ڕێبەری مەزنی گەلی کورد و حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، دوکتور قاسملووی نەمر، کوردستان ڕابوو. شارەکانی کوردستان لە بێدەنگییەکی پڕمانا ڕۆچوون، هەم بۆ ناڕەزایەتی دژی تیرۆری ڕێبەری بێوێنەی نەتەوەی کورد و هاوڕێیانی لە وییەن لە لایەن دیپلۆمات ـ تیرۆریستەکانی کۆماری ئیسلامیی ئێرانەوە و هەم بە مەبەستی پەیمان نوێکردنەوە لەگەڵ ڕێبازی بەرزی دوکتور قاسملوو و حیزبەکەی، ڕەنگی شینی ئاسمانی بە نیشانەی ڕەنگی هزرە قووڵاً و مرۆڤتەوەرەکانی دوکتور قاسملووی ڕێبەر، هەموو شار و گوندەکانی کوردستانی داپۆشی، دروشمی شۆڕشگێڕانە و تراکت و فیلمی تایبەت بەم بۆنەوە و هەروەها ئاڵای پیرۆزی کوردستان لە هەموو شوێنێکی کوردستاندا بەرچاو دەکەوتن. خەڵکی گوندەکان لە هاتوچۆ بۆ شارەکان خۆیان پاراست، خەڵکی شارەکان لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەدا بە جلوبەرگی کوردییەوە هاتنە سەر شەقام و گۆڕەپانە سەرەکییەکان و هەڵوێستی خۆیان نواند و لە سەر کاتژمێر ١٠ی شەو بۆ ماوەی سێ خولەک چرا و ڕۆشنایی ماڵەکانیان لە هەموو شار و گوندەکاندا بە نیشانەی یەکیەتی و یەکدەنگیی خەڵکی کوردستان لە ناڕەزایەتی دەربڕین دژی ڕێژیم و پەیمان نوێکردنەوە لەگەڵ ڕێبەری شەهیدیان کوژاندەوە.

* ٧ خاڵی پێشنیاری بە بۆنەی ٢٢ی پوشپەڕەوە

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە ڕاگەیەندراوێکدا داوای لە خەڵکی سەرانسەری کوردستان کردبوو تا بە جێبەجێکردنی ٧ خاڵی پێشنیارکراوی «کومیتەی ڕێزگرتن لە یادی دوکتور قاسملوو لە بیستەمین ساڵی شەهیدکرانیدا»، لە خەبات و لەخۆبوردووییەکانی ڕێبەری مەزنمان ڕێز بگرن و تیرۆریزمی کۆماری ئیسلامی مەحکووم بکەن. ڕەوتی جێبەجێبوونی ٧ خاڵە پێشنیارکراوەکە بەمجۆرەی خوارەوەیە:

■ ١. داخستنی دوکانو بازاڕەکان لە شارو شارۆچکەکانی کوردستاندا

مەهاباد، بۆکان، سەقز، ورمێ، رەبەت، شنۆ، نەغەدە، بانە، سنە، پاوە، دیواندەرە، جوانڕۆ، خۆی، ماکۆ، سەڵماس، سەلاسی باوەجانی، کامیاران و سەریاس لەو شارانە بوون کە هێندیکیان بە تێکڕاو هێندێکی دیکەیان تا رادەیەک بازاڕ و دووکانیان داخست.

لە مەهاباد، دووکاندار و بازاڕییە دلێرەکانی ئەو شارە سەرجەم دووکانەکانیان داخست و شار لە بەرەبەیانەوە تا خۆرئاوا هاوڕێ و هاوهەنگاوی حەرەکەتە شۆڕشگێڕانەکە بوو. رێژیمی کۆماری ئیسلامی لە شوێنەکانی دیکەی ئێرانەوە هێزێکی سەرکوتکەری زۆری تەیار بە چەکی هێنابووە شارەکە و بە شکاندنی قوفڵ و درگای هێندێک لە دووکانەکان دەیهەویست لە ریگەی ترس و تۆقاندن و دەرخستنی داماوی و دەستەوەستانیی خۆیەوە، رووبەڕووی حەرەکەتەکە بێتەوە کە بە خۆشییەوە ژمارەیەک لە ریش چەرمووەکان و کەسایەتییەکانی ئەو شارە بە رێژیمیان راگەیاند کە ئەگەر درێژە بە شکاندنی قوفڵی دووکانەکان بدەن، خەڵک لە دژیان رادەپەڕێ و بەمجۆرە سەرکەوتنی حەرەکەتی خەڵکی مەهاباد و دەستەوەستانیی رێژیم لەو شارەدا بە تەواوی مسۆگەر بوو.

لە بۆکان، دووکان و بازاڕەکان لە تەواوی رۆژدا داخرابوون و سەرەڕای گوشارەکانی رێژیم لە رۆژانی پێشتر و بەتایبەت لە ٢٢ی پووشپەڕدا بۆ سەر بازاڕییەکان تا دووکانەکانیان بکەنەوە، حەرەکەتی مەزنی خەڵک لە پێناو ئامانجەکانیاندا درێژەی کێشا و بە تەواوی سەرکەوتوو بوو.

لە سەقز، مانگرتن لە شێوەی داخستنی دووکان و بازاڕەکان هەموو شاری گرتەوە و تەنانەت دووکانی سەر شەقامەکانی روو لە دەرەوەی شاریش و لە نێو کۆڵانەکانیش بەسترابوون. رێژیم هێزە

سەرکوتکەرەکانی خۆی بردە سەر ماڵی هێندێ لە دووکاندارەکان و بە بێحورمەتیکردن بە بازاڕییانی بەڕێز هێندێکیانی ناچار بە کردنەوەی دووکانەکانیان کرد کە لە کۆتاییدا ئەوانەشی کە ناچار کرابوون هەر ماوەیەکی کورت خۆیان ڕاگرت و سەرلەنوێ دووکانیان داخستەوە و ڕێژیمی داماو و داتەپیو نەیتوانی پێش بە سەرکەوتنی حەرەکەتی شۆڕشگێڕانەی خەڵکەکە بگرێ.

لە شنۆ نزیک بە تەواوی دووکان و بازاڕەکانی شار هەر لە بەیانییەوە داخرابوون و ئەم حەرەکەتە بێوێنەیەی خەڵک لە کاتێکدا بە تەواوی سەرکەوتوو بوو کە کاربەدەستانی ڕێژیم لە چەند ڕۆژ پێشترەوە هەڕەشەیان لە هەموو بازاڕییان و دووکاندارانی ئەو شارە کردبوو کە ئەگەر لەگەڵ حەرەکەتی ئێعترازی خەڵک لە ٢٢ی پووشپەڕدا بکەون، سزای قورس چاوەڕوانیان دەکات.

لە نەغەدە، هەموو دووکان و بازاڕەکانی بەشە کوردنشینەکان داخرابوون و ژمارەیەک لە دووکانداران و بازاڕییانی بەشە ئازەری نشینەکانیش لەگەڵ ئەو حەرەکەتە کەوتن. گوشارەکانی سەر خەڵکی ئەو شارە لەرادەبەدەر بوو، بەڵام خەڵک حەرەکەتەکەیان سەرخست.

لە شاری بانە، هەموو دووکان و بازاڕەکان لە بەری بەیانەوە داخرابوون و خەڵکی دلێری ئەو شارە، سەرەڕای گوشارە توندەکانی هێزە سەرکوتکەرەکانی ڕێژیم، گومانیان لە پێویستی پەیوەستبوون بەم حەرەکەتە جەماوەرییە نەکرد.

لە ڕەبەت، سەرانسەری ڕۆژ، هەموو دووکان و بازاڕەکان داخرابوون و گوشارەکانی ڕێژیم بۆ سەر خەڵکی ئەو شارە و وەرگرتنی بەڵێننامەی زۆرەملێ لە بازاڕییان بۆ دانەخستنی دووکانەکان هیچی پێ نەکراو سەرکەوتنی تەواو بوو بە نسیبی شارەکە.

لە ورمێ لە هەموو ناوچە کوردنشینەکانی نێو شاردا کە بریتین

لە ئیسلام ئاباد، ئابیاری، گرەجوو، تەرزەلوو، کوشتارگا، حەسار، ئەلواج، شەهرەکی سپا، شەهرەکی دانشگا، دیزەی سیاوەش و لە چەند ناوچەی ئازەرینشینیش هێندێ لە دووکانو بازاڕەکان داخرابوون. هەروەها لە شارۆچکەکانی «دزێ»و «زیوێ» لە ناوچەی مەرگەوەڕی ورمێدا، دووکان و بازاڕەکان داخران و خەڵکی ورمێ لەگەڵ ئەم یەکیەتییە کەوتن.

لە سنە، بازاڕ و دووکانی ناوچەکانی کەمەربەندی ١٧ی شەهریوەر، فەیزئاوا، کانی کوزەڵە، عەبباس ئاوا، فەرەح، حەسەن ئاوا و غەفوور بە تەواوی داخرابوون و بەشێک لە دووکان و بازاڕەکانی شەقامی قاسملوو، فردەوسی و شاپووریش داخرابوون.

هەروەها لە شارەکانی پاوە، دیواندەرە، جوانڕۆ، خۆی، ماکۆ، سەڵماس، سەلاسی باوەجانی، کامیاران و سەریاس بە رادەی جۆراوجۆر دووکان و بازاڕەکان داخرابوون و خەڵکی ئەو شارانە لەگەڵ حەرەکەتی جەماوەریی خەڵکی کوردستان کەوتن.

■ ٢. کوژاندنەوەی چرای ماڵەکان بۆ ماوەی ٣ خولەک لە کاتژمێر ١٠ی شەوی ٢٢ی پووشپەڕ بە کاتی تاران:

لە زۆربەی شار و گوندەکانی کوردستاندا، لە ماکۆ و سەڵماسەوە تا کرماشان و ئیلام، خەڵک لە کاتژمێر ١٠ی شەوی ٢٢ی پووشپەڕدا بۆ ماوەی ٣ خولەک چرای ماڵەکانی خۆیان بە نیشانەی ناڕەزایەتی لە تیرۆریزمی کۆماری ئیسلامی و پەیمان نوێکردنەوە لەگەڵ ڕێبازی بەرزی دوکتور قاسملووی نەمردا و هەروەها ڕێزدانان بۆ گیانی پاکی دوکتور قاسملوو و هاوڕێیانی کوژاندەوە. شایانی باسە کە ئەم حەرەکەتە ئیعترازییە لە هێندێک لە شارەکاندا سەداسەد سەرکەوتوو نەبوو، بەلام بە لە بەرچاوگرتنی رۆشنایی چرا حکوومەتییەکان دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە زۆر سەرکەوتوو بووە.

■ ۳. هەڵکردنی ئاڵای سێ ڕەنگی کوردستان:
ئەندامانو لایەنگرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران لە هەموو شـــارەکانی کوردستان بە هەڵکردنی ئاڵای ســێ ڕەنگی کوردستان، کەشـــوهەوایەکی شۆڕشـــگێڕانە و نەتەوەییان بۆ شـــار و گوندەکان خوڵقاند. ئەم حەرەکەتە لە زۆربەی شـــارو گوندەکاندا ســـەرکەوتوو بووە.

■ ٥. هەڵکردنی ئاڵا بە ڕەنگی شـــینی ئاسمانی و کەڵکوەرگرتن لەو ڕەنگە لە شێوازی جۆراوجۆردا:
لـــە سەرانســـەری مانگی پووشـــپەڕدا و هاوکات لەگـــەڵ چالاکییە بەربـــڵاوە تەبلیغاتییەکانـــی ئەندامان و لایەنگرانی حیزب لە شـــوێنە جیاجیاکانی سەرانسەری کوردستاندا، ئاڵا بە ڕەنگی شینی ئاسمانی لـــە ســـەر بەرزاییەکانـــی شـــارەکان و هەروەهـــا لـــە نێو شـــەقام و کۆڵانەکانی شـــارەکاندا هەڵکرا و لە ڕۆژی ۲۲ی پووشپەڕیشـــدا ئەم ڕەنگە بە شـــێوەی بەرچاو لە شـــارەکاندا بەدی دەکرا. بۆ نموونە لە شاری سەقز، ئەندامان و لایەنگرانی حیزب، وێڕای هەڵکردنی ئاڵا بە ڕەنگی شینی ئاسمانی، بە پرژاندنی ڕەنگ بە دیوار و سەر شەقام و کۆڵانەکاندا، شاریان ڕەنگڕێژ کرد.

■ ٥. خۆپاراســـتنی گوندنشـــینان لـــە هاتووچـــۆ بۆ شـــارەکان لەو ڕۆژەدا:
ئـــەم حەرەکەتـــە جەماوەرییـــە لـــە لایـــەن گوندنشـــینانی دڵێـــری کوردســـتانەوە لـــە دێهاتەکانـــی زۆربەی شـــارەکان بە تـــەواوی بە شـــێوەیەکی بەرچـــاو بەڕێوە برا و گوندنشـــینان وێـــڕای هەڵکردنی ئاڵای کوردستان، ئاڵای شینی ئاسمانی و تەبلیغاتی بەرین لە ئاستی گوندەکاندا، بە خۆپاراستن لە هاتوچۆ بۆ شارەکان هەروەک هەمیشە هاوڕێی ئەو یەکیەتی و یەکهەڵوێستییەی کۆمەڵانی خەڵک بوون.

■ ٦ـ هاتنە سەر شەقام و شوێنە گشتییەکان لە پاشنیوەڕۆی ڕۆژی ٢٢ی پوشپەڕ بە جلوبەرگی کوردییەوە:

خەڵکی کوردستان ئەم حەرەکەتە سەمبوولیکەیان بە باشی و بە سەرکەوتووییەوە بەڕێوە برد. لە هێندێک لە شارەکاندا، هێزەکانی ڕێژیم دەیانویست ئاپۆرەی خەڵک بە توندوتیژیدا بکێشن و بەم شێوەیە سیمای حەرەکەتی شارستانییانە و مەدەنی خەڵک خەوشدار بکەن کە بە خۆشییەوە خەڵکو بەتایبەت توێژی لاوان ئەم پیلانەی ڕێژیمی داسەپێنەری بریندارییان پووچەڵ کردەوە.

٧ـ لە هەر شارێکی کوردستاندا، یەکێک لە شەقام یان گۆڕەپانەکانی شار بە ناوی شەقام یان گۆڕەپانی دوکتور قاسملوو ناودێر بکرێ:

لە مانگێک پێش ڕۆژی ٢٢ی پوشپەڕەوە، «کومیتەی ڕێزگرتن لە یادی دوکتور قاسملوو لە بیستەمین ساڵیادی شەهید کردنیدا» بە ڕاپرسی لە خەڵکی شارەکان و لێکدانەوەی وردی ڕای خەڵک، ئەو شەقام یان گۆڕەپانانەی دیاری کرد کە بە ناوی دوکتور قاسملووەوە ناودێر کران و پێش لە ٢٢ی پووشپەڕ ڕایگەیاند کە خەڵک بە تەواوی پێشوازییان لێ کرد و هەر ئێستا خەڵکی کوردستان لە هەر شارێکدا خاوەنی شەقامێک یان گۆڕەپانێک بە ناوی ڕێبەری مەزنی خۆیانەوەن و شانازیی پێوە دەکەن.

■ چالاکیی تەبلیغیی ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

لە پووشپەڕدا، لە ڕۆژی یەکەمەوە تا ٢٢ی پووشپەڕ، ئەندامان و لایەنگرانی نهێنیی حیزبی دێموکرات لە سەرانسەری شارو گوندەکانی کوردستاندا بە شێوەی بەربڵاو چالاکیی تەبلیغییان بەڕێوە برد. چالاکییەکان بریتی بوون لە بڵاوکردنەوەی وتە بەنرخەکانی دوکتور قاسملوو بە شێوەی فیلم و تراکت، بڵاوکردنەوەی وێنەی دوکتور قاسملوو، نووسینی دروشمی شۆڕشگێڕانەی تایبەت بەم

رۆژە لە شوێنە گشتییەکاندا، هەڵکردنی ئاڵای کوردستان، هەڵکردنی ئاڵا بە رەنگی شینی ئاسمانی، بڵاوکردنەوەی بانگەوازی «کومیتەی رێزگرتن لە یادی دوکتور قاسملوو لە بیستەمین ساڵیادی شەهید کردنیدا»و ...

ئەو شارانەی کە تێیاندا چالاکیی تەبلیغی بەڕێوە چووە بریتین لە: ورمێ، مەریوان، شنۆ، بۆکان، نۆدشە، دێولان، کامیاران، سەقز، نەغەدە، مەهاباد، سنە، پیرانشار، بانە، ناوچەی هەوشار، نەوسوود، سەردەشت، دیواندەرە، ماکوو، پاوە، خۆی، سەلاسی باوەجانی، کرماشان، روانسەر، سەڵماس، رەبەت، شائاباد، قەسری شیرین، سەرپێڵی زەهاو، کرندی غەرب، گەهوارە و ئیلام. شایانی باسە کە لە گوندەکانی سەر بە هەموو شارەکاندا چالاکیی تەبلیغی بەڕێوە چووە. هەروەها لە تاران لە سەر گۆڕی «ندا ئاغا سوڵتان» کە لە رەوتی خۆپیشاندانەکانی ئەمدواییانەی تاراندا شەهید بوو، وێنەی دوکتور قاسملوو و وتە بەنرخەکانی ئەم رێبەرە شەهیدە دانرا. لە کوورەخانەکانی وایەگان، شەبەستەر، نەورۆز و سەلامەتیشدا چالاکیی تەبلیغی بەڕێوە چوو. ئەندامان و لایەنگرانی دلێری حیزب لە مەهاباد لە رۆژی ٢٢ی پووشپەڕدا هەموو حەوزەکانی مەیدان و پارکەکانی ئەو شارەیان بە رەنگی سوور دەرهێنا، بە نیشانەی خوێنی بەناهەق رژاوی شەهیدان.

■ پەرچەکرداری هێزە سەرکوتکەرەکانی رێژیم

هێزە سەرکوتکەرەکانی رێژیم پێش رۆژی ٢٢ی پووشپەڕ، بە هۆی دەستبەسەرکردنی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی کوردستان، بانگهێشتکردنی دووکانداران و بازاڕییەکان بۆ ئیدارەی ئەماکنی ئیتلاعات، وەرگرتنی بەڵێننامەی زۆرەملێ لە بازاڕییان و بەنیزامیکردنی هەرچی زیاتری شار و گوندەکانی کوردستان دەیانەویست بە ترس و تۆقاندن لە حەرەکەتی جەماوەری و دوژمن بەزێنی خەڵکی

کوردستان پێشگیری بکەن کە بە خۆشییەوە ناکام مایەوە.

لە رۆژی ٢٢ی پووشپەڕدا هەموو هەوڵی خۆی خستە گەڕ تا لە ڕێگەی توندوتیژییەوە حەرەکەتی مەدەنیی خەڵک و سیمای حەرەکەتەکە خەوشدار بکات کە تێیدا سەرکەوتوو نەبوو. لە رۆژی ٢٣ی پووشپەڕدا، هێزەکانی ڕێژیم بە پۆلۆمپکردنی ژمارەیەکی زۆر لە دووکانەکانی خەڵک لە چەندین شاردا و بەتایبەت لە مەهاباد، بۆکان، سەقز و شنۆ و هەروەها پچڕاندنی بەرقی بەشێکی زۆر لە بازاڕەکان هەوڵی دا هێزی زۆر و سەپێنەری خۆی بنوێنێ کە بە هۆی یەکگرتوویی خەڵک لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم کردەوانەی ڕێژیمدا، لەو کارەشدا ناکام و دەستەوەستان مایەوە و بەمجۆرە یەکیەتیی و یەکدەنگیی خەڵکی کوردستان سەرکەوتنی خۆی تۆمار کرد.

■ ڕەنگدانەوەی حەرەکەتی جەماوەریی خەڵک

ئەم حەرەکەتە شۆڕشگێڕانە و یەکگرتووەی خەڵکی کوردستان لە لایەن ڕاگەیەنەکانی شوێنە جیاجیاکانی جیهانەوە ڕەنگدانەوەی هەبوو. جگە لە ڕاگەیەنە کوردییەکان، لە تەلەڤیزیۆن، ڕادیۆ، ماڵپەڕە هەواڵییەکان و ڕۆژنامەکانەوە تا بڵاوکردنەوەی ڕاگەیەنراوی جیاواز، لە ڕاگەیەنە فارسی زمان و ئینگلیسی زمانەکانیشدا ڕەنگی دایەوە.

تەلەڤیزیۆنی «تیشک»، ڕاگەیەنی جێی متمانەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لە ماوەی مانگرتنەکەدا بە وەشانی ڕاستەوخۆ و ڕەنگدانەوەی سات بە ساتی مانگرتنەکە لەم پێناوەدا تێکۆشا کە ئەمەش خاڵێکی وەرچەرخانە لە مێژووی خەباتی گەلی کورددا. هەروەها بەشەکانی فارسیی VOA، DW و ڕادیۆ فەردا، هەرچەند لە ئاستی چاوەڕوانییەکان نەبوو، بەڵام ئەو هەواڵانەیان گواستەوە. حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، بە گواستنەوەی سات بە ساتی مانگرتنەکە و ناردنی هەواڵەکانی بۆ ڕاگەیەنەکانی وڵاتانی دەرەوە،

لەم پێناوەدا هەوڵی بێوچانی دا.

■ سپاسی حدکا لە خەڵکی خەباتگێڕ و ئەندامان و لایەنگرانی تێکۆشەری حیزب

دەفتەری سیاسیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران ڕۆژی ٢٣ی پووشپەڕ لە سپاسنامەیەکدا ڕوو لە خەڵکی خەباتگێڕ و ئازادیخوازی کوردستان و ئەندامان و لایەنگرانی تێکۆشەری حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، لە هەموو ئەو کەسانەی کە لە پێناو ئەم سەرکەوتنە مەزنە بۆ گەلی کورد هەوڵیان دا، سپاسی کرد و لە سەر یەکیەتی و بوێریی خەڵک وەکوو ڕەمزی سەرکەوتنی حەرەکەتەکە جەختی کردەوە. دەقی ئەم بەیاننامەیە لەم ژمارەی ٥١٣ی ڕۆژنامەی «کوردستان»دا بڵاو کراوەتەوە.

## ■ ٦٨: ٢٣ی بانەمەڕ، ڕۆژێک کە کوردستان سەری بە سێدارە داخست (١٣٨٩)

لە بەرەبەیانی ڕۆژی یەکشەممە ١٩ی بانەمەڕ، کۆماری ئیسلامی جارێکی دیکە جینایەتێکی خولقاند. لە سێدارەدانی بە کۆمەڵی پێنج چالاکی سیاسی و مەدەنیی کورد و ئێرانی بە ناوەکانی «فەرزاد کەمانگەر، عەلی حەیدەریان، شیرین عەلەمهوولی، فەرهاد وەکیلی و میهدی ئیسلامیان» جینایەتێک بوو کە زیاتر لە هەر شتێک نیشاندەری داماوی و لاوازیی ڕێژیم بۆ دەربازبوون لە کێشە و قەیرانانەکان بوو.

پاش هەڵسەنگاندن و خوێندنەوەی وردبینانە لە نێوخۆی وڵات و بیروڕاگۆڕینەوە لەگەڵ هێزەکانی نێوخۆ و دەرەوەی وڵات و حیزبەکانی کوردستانی ئێران، حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران، کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان، کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران، حیزبی کۆمۆنیستی ئێران ـ

کۆمەڵـە، ڕێکخـراوی خەباتی کوردسـتانی ئێران بـە ڕاگەیەندراوی جیـاواز، بـەڵام ناوەڕۆکێکـی وەک یـەک، خەڵکی کوردسـتانیان بۆ مانگرتنێکـی سەراسـەری لـە ڕۆژی پێنجشـەممە، ٢٣ی بانەمـەڕ بانگهێشـت کـرد. بڵاوکردنەوەی ئەو بانگەوازانە لە کاتێکدا دەسـتی پـێ کـرد کـە کاتێکـی زۆر لـە بەردەسـتدا نەبـوو و لـە لایەکـی دیکەشـەوە ڕێژیـم بۆ خۆتەیارکـردن و بەڕێکردنی هێزەکانی خۆی بـۆ بەرەوڕووبوونـەوە لەگەڵ هەر چەشـنە ناڕەزایەتییـەک ئامادە بوو تا جووڵەکان هەر لە سـەرچاوەکەدا بخنکێنێ، ئاواتێک کە هێزە کوردییەکان نەیاندەویسـت ڕێژیم بە ئاڵۆزکردنی کەشـەکە پێی بگا. بەرئـەنجامەکـەشـی مانگرتنی ڕۆژی پێنجشـەممە، ٢٣ی بانەمەڕ بوو کە خەڵکی کوردستان، گشت ئێرانییەکان و جیهانیان سەرسامی هەڵوێستی ئازایانەی خۆیان کرد. گەلی کورد بـە هەنگاوێکی شیـاو بە خەڵکی ئێرانی سـەلماند کە دەکرێ بە یەکگرتوویی و نیشـاندانی ئیـرادەی نەتەوەیـی، ملهوڕەکان بە چۆکدا بێنی. هەڵوێسـتی خەڵکی کوردسـتان کـە بەرچاوترینی لە شـار و ناوچەکانی سـنە، مهاباد، ورمێ، بۆکان، کامیاران، نەغەدە، شـنۆ، سـەقز، دیواندەرە، دێگولان، جوانڕۆ، پاوە، نەوسـوود، سەردەشت، مەریوان، ماکۆ و.. دەرکەوت، پەیامێک بوو بۆ بنەماڵەکانی ئەو شەهیدانە کە: «کوردستان ئێوە بە تەنیا ناهێڵێتەوە».

لایەنێکی دیکەی ئەو ڕووداوانە کە هەم ڕێژیم و هەم کوردەکانیش چاوەڕوانیـان نەدەکرد کە بێ گومان زیاتر ڕێژیمی سەرسـوڕماو کـرد، شـکاندنی ڕۆژووی بێدەنگیی چەندین دەیـەی ئێرانییەکان لە ئاست لە سـێدارەدانی چالاکانی سیاسیی کورد بوو، بێدەنگییەک کە ناڕاستەوخۆ ڕێژیم وەک بەڵگە و جەوازی ڕەزامەندی بۆ کردەوەکانی خۆی لە کوردسـتان، بە ئەژماری دێنا. بـەڵام ئەو جارە بە بەراورد لەگەڵ ڕابردوو شیاوی تێڕامان و ڕێزلێنانە، بە جۆرێک کە دژکردەوەی

بەجێی هەموو گرووپ و لایەنەکانی ئێرانی وەک چالاکانی بوارەکانی مافی مرۆڤ، رووناکبیری، مەدەنی، سیاسی، فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی، کرێکاری، کۆماریخوازی، سەڵتەنەتخواز، پان ئێرانیست، کۆمۆنیست، خوێنـدکاری و.. بـە دواوە بوو. دۆخێک کە تەنانەت کەسـانی وەک مووسـەوی و کەڕووبـی و زەهرا رەهنەوەردیشـی ناچار کرد هەر نەبێ بە پێچوپەنا سەرکۆنەی ئەم کارە بکەن. ئێرانییەکان لە زۆربەی ولاتانی جیهاندا شانبەشان یان تەنانەت لە پێشەوەی هاونیشتمانانی کوردسـتان بەردرگای باڵویزخانە و کونسوولگەرییەکانی رێژیمیان کە لە راسـتیدا ناوەندی سـیخوڕەکانی رێژیمن، لە ولاتانی فەرانسە، ئاڵمـان، بلژیک، ئامریکا، سـوئێد، کانادا، دانمـارک، بریتانیا، هۆلەند، ئۆتریـش و.. گـرت و بێزاری و رق و توورەیـی خۆیان لە کۆماری ئیسلامی نیشان دا.

رێکخـراوە ئێرانییەکانی وەک: ئەنجومەنـی بەرگری لە زیندانییانی سیاسـی ئازەربایجـان لە ئێـران، رێکخراوی مافـی مرۆڤی ئێران، سـەندیکای کرێکارانـی شـیرکەتی واحیـدی تـاران و دەوروبەری، «ئـەدواری تەحکیمی وەحـدەت»، کانوونی چالاکانـی مافی مرۆڤ لـە ئێـران، شـوورای هاوئاهەنگیـی بزووتنـەوەی کۆماریخوازانی دێموکرات و لائیک لە ئێران، شوورای کاتیی سۆسیالیستە چەپەکانی ئێران، کۆمەڵـەی چالاکانی مافی مرۆڤ لە ئێران، کومیتەی بەرگری لـە بزووتنـەوەی دێموکراتیکـی خەڵکی ئێـران، کۆمەڵی ئیسـلامی ئێرانییـەکان، یەکێتیـی کۆماریخوازانی ئێران، بزووتنـەوەی فیدراڵ دێموکراتـی ئازەربایجـان، ناوەنـدی نووسـەرانی ئێـران، ناوەندی نووسـەرانی ئێران لە تاراوگە، کەمپەینـی نێونەتەوەیی مافی مرۆڤ لـە ئێران، کۆمەڵگای بەرگری لە مافی مـرۆڤ لە ئێران، ئەنجومەنی توێژەرانـی ئێران، ئەنجوومەنی پاشـایەتیی ئێران، شـوورای کاتیی گشـتیی سـکۆلارە سـەوزەکان، رێکخـراوی مافـی مرۆڤـی ئێران،

یەکگرتوویی بۆ دێموکراسی و مافی مرۆڤ، حیزبی دێموکراتیکی خەڵکی ئێران، بەرەی نەتەوەیی ئێران ـ ئورووپا، ڕێکخراوی یەکیەتی فیدائیانی خەڵکی ئێران، ڕێکخراوی فیدائیانی خەڵکی ئێران (زۆرینە)، شووورای هاوئاهەنگیی بزووتنەوەی کۆماریخوازە دێموکراتەکانی ئێران، چەپی دێموکراتی ئازەربایجان، کۆنگرەی نەتەوەکانی ئێرانی فیدراڵ، شووورای چالاکانی نەتەوەیی ـ ئایینی، بنەماڵەی لە سێدارەدراوەکانی ساڵانی رابردوو، کۆمەڵێک لە چالاکانی ناوداری سیاسیو مافی مرۆڤ و .. ئەو جینایەتەی ڕێژیمیان ریسوا کرد و لە سەر بێ تاوانیی چوار کوردی لە سێدارەدراو جەختیان کردەوە.

یەکێکی دیکە لە بابەتە شایانی سەرنجەکان، ڕێپێوانی نارەزایەتی دەربڕینی بەربڵاوی ئەفغانییەکان لە شاری جەلال ئاباد و لە بەردەم کۆنسولگەریی ئێران بوو کە بە هەڵگرتنی وێنەی شەهیدانی کورد و پلاکاردگەلێک کە نیشاندەری پشتیوانی لە گەلی کورد بوو، کۆنسولگەریی کۆماری ئیسلامییان دایە بەر بەرد و وێنەی خامنەیی و ئەحمەدینژادیان سووتاند.

لە ئاستی نێونەتەوەییشدا، ئەو ستەمەی کە لە کورد کرا و هەروەها مانگرتنە بێهاوتاکەی کوردستان دەنگدانەوەیەکی بەربڵاوی هەبوو. یەکێتیی ئورووپا و ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی، لە سێدارەدانەکانیان بە توندی ئیدانە کرد. دەیان کەسایەتیی زانستگایی لە ئەمریکا و ئورووپا لە سێدارەدانی چالاکانی کوردیان مەحکووم کرد.

لە نێوخۆی وڵاتدا بەهۆی نارەزایەتی و مانگرتنی زیندانییان، ڕێژیم ناچار بوو بەندی ٣٥٠ی زیندانی ئێوین هەڵوەشێنێتەوە. هەروەها لە زیندانەکانی ورمێ، سنەو گەوهەردەشتی کەرەج نارەزایەتییەکی بەربڵاو هاتە ئاراوە. هاوتەریب لەگەڵ ئەوە، کانوونی زیندانییانی سیاسیی ئێران لە تاراوگە، کۆمیتەی خوێندکاریی بەرگری لە

زیندانییانی سیاسی، کۆمیتەی خوێندکاریی بەرگری لە زیندانییانی سیاسی و مەدەنیی کورد و.. ئەو جینایەتەی ڕێژیمیان مەحکووم کرد.

بانگەوازی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران
بۆ مانگرتنی سەرتاسەریی ۲۳ی بانەمەڕ
هاونیشتمانانی تێکۆشەر!
خەڵکی ئازادیخوازی کوردستان!

ڕێژیمی دژی گەلیی کۆماری ئیسلامیی ئێران لە کوشتاری ئازادیخوازان بەردەوامە و ئاخرین قوربانییانی ئەم کوشتارە تا ئێستا پێنج لاوی ئازادیخواز بوون کە لە بەرەبەیانی ڕۆژی یەکشەممە ۱۹ی بانەمەڕ لە زیندانی «ئێوین»ی تاران لە سێدارە دران. فەرزاد کەمانگەر، شیرین عەلەمهوولی، فەرهاد وەکیلی و عەلی حەیدەریان ئەو چوار لاوە کوردە تێکۆشەرە بوون کە تاوانەکانیان تەنیا کوردبوون و سووربوونیان لە سەر داوای مافە ڕەواکانی گەلە بێبەشەکەیان بوو. ئەوان چوار کەس لە هەزاران تێکۆشەری نیشتمانەکەمان بوون کە دڵیان پڕ لە ئەوینی ڕزگاریی گەلەکەیان لە دەست دێوەزمەی جەهل و نەزانی بوو و ئێستاش ژمارەیەکی دیکە لە هاونیشتمانانی ئازادیخوازی ئێمە لە زیندانە پڕشوورەییەکانی ڕێژیم و لە ژێر ئەشکەنجەی بەکرێگیراواندا چاوەڕوانن کەنگێ دڵی پڕ لە ئاواتیان بە گوللەی ئازادیکوژان لە لێدان بکەوێ.

بێگومان هەتا ئەو کاتەی خەڵک تەنیا بە داخ و کەسەرەوە شاهیدی کوژرانی ڕۆڵە ئازا و بەجەرگەکانی خۆیان بن و دژایەتیی خۆیان بە کردەوە دەرحەق بەم هەموو زوڵم و زۆرداریيە نیشان نەدەن، لە داهاتووشدا ڕۆژانە شاهیدی ئەم ڕووداوە تاڵانە دەبین، چوونکە ڕێژیم بەزەیی بە هیچ مافخوازێکی ئێرانی و بە تایبەت مافخوازی کورددا نایە.

بۆیــە داوا دەکەین ڕۆژی پێنجشــەممە، ٢٣ی بانەمەڕ بەرامبەر بە ١٣ی مانگــی مەی، بۆ نیشــاندانی ناڕەزایەتیــو دژایەتی لە بەرامبەر ئێعدامی ئەو لاوە ئازادیخوازانە و وەستاندنی ئێعدامی ئازادیخوازانی دیکەی کورد، بە یەککگرتوویی دەست بدەنە مانگرتنێکی گشتی و لەو ڕۆژەدا قوتابــی و خوێندکاران و مامۆســتایان نەچنــەوە قوتابخانە، کارمەنــدان نەچنەوە ســەر کارەکانیــان، بازاڕییــەکان دوکانو بازاڕ دابخەن و کرێکاران لە ســەر کار ئامادە نەبن، پێویســتە لەو ڕۆژەدا خەڵک لە ماڵ نەچنە دەر و شەقام و کۆڵانەکانی شار و شارۆچکەکان چۆڵ بن. بەم چەشــنە بە ڕێژیم و بنەماڵەی ئەو کۆمەڵە شەهیدانەی دواییمان ڕابگەیەنین کە شەهیدەکان و ڕۆڵە بەجەرگە ئازادیخوازەکانی ناو زیندانەکان، ڕۆڵەی خۆشەویســتی هەموو نەتەوەی کوردن و لە لایەکی دیکەشــەوە بەم بێدەنگییە نفــرەت و بێزاریی خۆیان بە دژی کۆماری ئیسلامی نیشان بدەن.

بەو هیوایە کە هاونیشتمانانی تێکۆشەر بەو مانگرتنە کە خەباتێکی مەدەنی و سەردەمیانەیە، ڕۆژی پێنجشەممە بکەنە ڕۆژێکی مێژوویی دیکــەی پڕ لە شــانازیی خۆیان لە ڕۆژانــی بەربەرەکانی دژی زوڵم و ســەرەڕۆیی ڕێژیمــی کۆمــاری ئیســلامی و بەم چەشــنە دەنگی ناڕەزایەتیی خۆیان بە گوێی دەسەڵاتدارانی ڕێژیم، گەلانی بندەستی ئێران و هەموو دنیا بگەیەنن.

سەرکەوێ خەباتی ئازادیخوازانەی هەموو خەڵکی ئێران

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

دەفتەری سیاسی

٢١ی بانەمەڕی ١٣٨٩ی هەتاوی بەرانبەر بە ٢٠١٠/٥/١١ زایینی

سپاسنامەی کۆمیسیۆنی تەشکیلاتی حیزب لە خەڵکی کوردستان
به بۆنەی سەرکەوتنی مانگرتنی ٢٣ی بانەمەڕ
کۆمەڵانی خۆڕاگری خەڵکی کوردستان!
بنەماڵەی سەربەرزی شەهیدانی ڕێگای ئازادی!
ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران!

جارێکیتر ورەی پۆڵایین و هێزی لەشکان نەهاتووی ئیرادە و باوەڕبەخۆبوونی شۆڕشگێڕانەی ئێوە وەک قەقنەس لە خۆڵەمێشی کارەساتێکی خوێناوی سەری هەڵدایەوە و لە ڕۆژانێکدا کە دێوەزمەی سەرکوت و سێدارە قاقای سەرکەوتنی بە سەر تەرمی پیرۆزی پۆلێک لە تێکۆشەرانی ڕێگای بەختەوەریی گەلەکەماندا لا دەدا، تیرێژی خودئاگایی و شارستانیەتی ئێوە لەگەڵ شنەبای دڵڕفێنی هاوپشتی و یەکگرتوویی، هەوری چڵکنی دیکتاتۆری و خەفەقانی شوومی سێبەرە ڕەشەکانی لە سەر وڵاتەکەمان ڕاماڵی و لووتکەکانی زاگرۆسی کردە بڵیندگۆی حەماسەیەک کە ٤ ڕۆڵەی تێکۆشەری گەل بە ئازایەتییەکیکەم وێنە، شابەیت و مەتلەعەکەیان بە خوێنی ئاڵیان لە سەر لاپەڕەکانی مێژوو نووسی و تاک بە تاکی ئێوە، پیر و لاو، ژن و پیاو، کچ و کوڕ، قوتابی و مامۆستا، بازاڕی و کرێکار و هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگای کوردستان بوون بە پیت و وشە و دێڕ و ڕستە بۆ سەرخستن و تۆمارکردنی ئەو حەماسەیە.

کاتێک کە جەللادەکانی ئێڤین، چوار بەوری بریندار‌ی زنجیریان لە بەرەبەیانێکی غەریبی بانەمەڕدا بەرەو قوربانگای پەتی نگریسی سێدارەکانیان دەبرد، پێیان وابوو کە بەو تاوانە سامناکە، هەناسە لە گەرووی دالاهۆدا دەخنکێنن و زنجیر لە ملی ئاویەر و شیرینسوار و بێستوون و شاهۆ دەکەن و ئاگری بۆ هەمیشە بە چۆکدا دێنن و شوورەی پۆلایینی دێموکراسی دەڕووخێنن. بەڵام وەک مێژووی خەباتی خوێناویی گەلەکەمان سەلماندوویە، لەوەتی ئێمە هەین و

کوردستان کوردستانە، ڕێبازی سەرفیرازی و ڕزگاری، ڕووبارێکی خرۆشانە کە بۆتە سەرچاوەی ڕووناکی و ژیان و لەمپەرەکان نەک هەرگیز نەیانتوانیوە رایوەستێنن، بەڵکوو هەر لەمپەر و کۆسپێک بۆتە هۆی پەنگخواردنی قین و پتەوبوونی ئیرادەمان بۆ تێکشکاندنی قەڵای تاریکی و بەخوڕتر و بەلرفەتر لە جاران ڕێگای سەرکەوتن بۆ گەیشتن بە ئامانجمان بڕیوە.

ئەندامان و لایەنگرانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران!

بۆ هەموو کەس ئاشکرایە کە بەڕێوەچوونی شکۆداری مانگرتنی سەرانسەریی ٢٣ی بانەمەڕ دەسکەوتێکی نەتەوەیی بوو کە ڕۆڵی سەرەکیی ئێوە لە ڕێکخستنی ئەو مانگرتنەدا و کار و خەبات و چالاکییەکانتان لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی تراکت و دروشمی شۆڕشگێڕانە و بانگەوازی حیزبەوە و هاندانی خەڵکی کوردستان بۆ خۆڕاگری لە بەرامبەر وەیشوومەی دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامیدا، ڕۆژێکی زێڕین و لەبیرنەکراوی بۆ هەتاهەتایە لە مێژووی خەباتی ڕزگاریخوازانەی گەلانی ئێراندا دژ بەو ڕێژیمە کۆنەپەرستە تۆمار کرد و پەپوولەی ڕۆحی پیرۆزی شەهیدانی کردە میوانی گوڵزاری خۆشەویستیتان و دڵی خەمباری دایکانی ئازیەتباری لە ئەمەگناسی و پێزانینتان بەرامبەر بە بارەگای پیرۆزی شەهیدان دڵنیا کردەوە.

کۆمیسیۆنی تەشکیلاتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێت هەوڵ و هیممەتی دلێرانەی ئێوە لە پێناوی سەربەرزیی حیزب و گەلەکەتان و ڕۆڵی حاشاهەڵنەگرتان لە بەڕێوەچوونی سەرکەوتووانە و بەربڵاوی مانگرتنی سەرانسەریی ڕۆژی ٢٣ی بانەمەڕدا، سەرەڕای هەموو هەڕەشە و گوشارەکانی کۆماری ئیسلامی و ناحەزانی گەلەکەمان، ڕێز لێ بگرێت و سوپاسی بێپایانی خۆی ئاراستەی هەموو لایەکتان بکات و دەستی ماندوویینەناستان بە گەرمی بگوشێت. بێگومان ئەم سەرکەوتنە

بەرهەمی کار و تێکۆشـــانی شۆڕشگێڕانەی ئێوەیە و لە داهاتووشدا ڕێنوێنێک بۆ بەرینترکردنەوەی خەبات لە پێناوی ئازادی، دێموکراسی و سەرکەوتوویی هەرچی زیاترمان لە بەڕێوەبردنی ئەرکە حیزبی و نەتەوەییەکانماندا دەبێت.

کۆمیسیۆنی تەشکیلاتی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران
یەکشەممە، ٢٦ی بانەمەڕی

## ■ ٦٩: بەرگری لە نیشتمان لە شەڕ دژی داعشدا (١٣٩٣)

لە مانگی جۆزەردانی ١٣٩٣دا ڕێکخراوی تیرۆریستیی داعش موسڵی داگیر کرد و پاش خۆقایمکردنی لەو شـــارە و دەستبەســـەرداگرتنی چەکوچۆڵێکـــی زۆر لـــە ســـوپای بـــێ ورە و رووخـــاوی عێـــراق بە سەرکردایەتیی نووری مالیکی تەماعی داگیرکردنی کوردستانیشیان کرد و دوای ماوەیەک هێرشیان لە مووسڵەوە بەرەو هەولێر دەست پـــێ کـــرد و تـــا داگیرکردنی مەخموور پێشـــڕەوییان کرد و شـــاری هەولێریان خستە مەترســـییەوە و ترسیان خستە دڵی خەڵکەوە. لەم کاتـــەدا حیزبی دێمۆکرات بە دەرکردنی بەیاننامەیەک ئامادەیی خۆی بۆ بەشـــداریکردن لە بەرگری لە خاک و نیشـــتمان نیشـــان دا کە بە خۆشییەوە لە لایەن هەرێمی کوردستانەوە داوا لە حیزبی دێمۆکرات کرا کە پێشـــمەرگەکانی بۆ بەرگریکردن بنێرێت بۆ بەرەکانی شـــەڕ. ســـەعات ٧ی شەو دەفتەری سیاسی بۆ تاوتوێکردنی ئەم بڕیارە کۆ بـــووەوە و وێڕای پێشـــوازی کردن لەو داواکارییە هەر ئەو شـــەوە چەند یەکەیەکی پێشـــمەرگەی ئامادە کرد و لە کاتژمێرەکانی بەیانیدا بەرەو بەرەکانی شـــەڕ بـــە هەماهەنگی لەگەڵ لایەنـــی داواکار ناردە بەرەکانی شـــەڕەوە کە بە خۆشـــییەوە چوونی ئـــەو هێزە ورەیەکی باشی بە پێشمەرگەکانی هەرێمی کوردستان بەخشی. بە گەیشتنیان بۆ شوێنی مەبەست دوو گوندیان لە چەکدارانی داعش پاک کردەوە

و دەسکەوتەکانی ئەو شەڕە کە چەند قەبزە تفەنگ و ماشینێک بوو، تەحویلی بەرپرسانی ئەو میحوەرە دران.

بەڵام بەو پەڕی سەرسووڕمانەوە پاش ٤٨ کاتژمێر دوای مانەوەی هێزەکەی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران لایەنی پێوەندیدار وێڕای سپاس و پێزانین داوایان لە ئێمە کرد کە هێزەکانمان بگەڕێنینەوە و ئێمەش پرسیارمان لێ کردن بۆ؟ وەڵامیان ئەوە بوو کە باشتر وایە بگەڕێنەوە. هەر بۆیە ئەو هێزانە هەر چەند پێیان ناخۆش بوو، گەڕانەوە بۆ مەقەڕەکانی حیزب. پاش ماوەیەک دەرکەوت کە قاسم سلێمانی فەرماندەی سوپای قودس گوشاری خستووەتە سەر هەرێم و ئەوانیش لەو حاڵەتە ناسکەدا نەیانویستووە کێشەی ئێرانیش تووشی خۆیان بکەن. بۆیە داوایان لە ئێمە کردبوو کە هێزەکانمان بکشێنینەوە. بەو حاڵەشەوە حیزبی دیموکرات بە بەرپرسانی هەرێمی ڕاگەیاندبوو هەرکات و لە هەر شوێنێکدا پێویست بە بەشداری و هاوکاریی ئێمە بکات، بە پێی توانا ئامادەی هاوکاری دەبین.

## ■ ٧٠: گەڕانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ شاخ و هەڵسوکەوتی Pkk

Pkk لە ڕۆژی پێکهاتنیەوە دەستی دایە پڕوپاگەندە لە دژی حیزبە ڕەسەنەکانی کوردستان و یەکیانی بە پاشماوەی عەشیرەت و ئەوەی دیکەی بە نوێنەری بورژوازی و .. بە ئەندام و لایەنگرانی دەناساند.

لە ڕۆژانی نیشتەجێ بوونیان لە سووریەدا دروشمی سەرەکییان بوو بە «باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات، یەک وڵات و یەک خەبات». بە بۆچوونی pkk کوردستان ڕۆژئاوای نەبوو و ئەوەش دەگەڕایەوە بۆ سەر ئەو ساتوسەودایە کە ئەم حیزبە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی سووریە هەیبوو و ڕادەی بەستراوەیی و ملڕاکێشانی بۆ دەسەڵاتی حافیز ئەسەد پیشان دەدا و پاش کۆچی دوایی حافیز ئەسەد و لە

سەروبەندی بومبارانی شیمیایی خەڵکی سوریە و کاولکردنی گوند و شارەکان بە سەر دانیشتوانیاندا لە ژێر بومبارانی تۆپ و خومپارەی ئەرتەشی ئەم ڕێژیمە و لە هەلومەرجێکدا کە ڕێژیمی بەشار ئەسەد بەرەو رووخان دەچوو، لقەکانی pkk لە سووریە بنکە و بارەگاکانی خۆیان لە نزیکترین بنکەکانی سوپای بەشار ئەسەد دانا و ئەو ناوچانەی کە لەم هەلومەرجەدا کەوتبوونە دەست خەڵکی کوردی ئەم ناوچەیە تا نووسینی ئەم دێڕانە تەنانەت یەک کارمەندیشیان لە لایەن ڕێژیمی بەشار ئەسەدەوە دیاری دەکرێ، ئەوە لە کاتێکدایە کە P.Y.D لقی pkk پێشگیری دەکا لە ڕۆیشتنەوەی حیزبەکانی دیکەی کوردستانی ڕۆژئاوا بۆ وڵاتی خۆیان.

لە کوردستانی باشووریش لە یەکەم هەڵبژاردنی پارلەمانییەوە تا ئێستا دژایەتی لەگەڵ ئەم دەسەڵاتە کوردییەیان بە ئەرکی خۆیان زانیوە و سەرەتا پارلەمان و حکوومەتی هەڵبژێردراوی هەرێمی کوردستان کە لە هەڵبژاردنێکی ئازاد و بە دەنگی خەڵک هەڵبژێرابوون بە داردەستی ئەمریکا و ئینگلیس ناو بردن و کەمترین بایەخیان بۆ ئەم دەسکەوتە گرینگەی خەڵکی کوردستان دانەنا. تەنانەت ٢ جاریش شەڕیان لە دژیان هەڵایساند و ژمارەیەک لە لاوانی کورد کە بۆ رزگاریی نیشتمان هاتبوونە ریزی pkkوە کەوتنە هێرش بۆ سەر گرینگترین دەسکەوتی خەڵکی کوردستان و ژمارەیەک لاوی کورد لە هەر دوو لا شەهید بوون کە بەرپرسایەتییەکەی دەکەوێتە ئەستۆی بەرپرسانی pkk.

لە کوردستانی باکووریش ئەوەندە بەسە بڵێین تا ئێستاشی لەگەڵ بێ، بوونی هیچ حیزبێک قبووڵ ناکا و لە ڕۆژانی خەباتی لە باکووری کوردستان هەرکام لەو حیزبانەی وە بەر دەست کەوتبان، هێرشی دەکردەنە سەر و قەلاچۆی دەکردن.

لە کوردستانی ڕۆژهەڵات و هەموو بەشەکانی دیکەدا pkk دەستی

دایە ڕێکخستن و دامەزراندنی حیزبی دەستکرد و کۆنفرانسەکانی لە ژێر لوتفی کۆماری ئیسلامیدا بەڕێوە بردن و ئەوەش دەگەڕایەوە بۆ ئەو پێوەندییانەی کە ئەم حیزبە لەگەڵ کۆماری ئیسلامی دایمەزراندبوو.

pkk بە پێی بڕیاری کۆنگرەی دووهەمی لە ساڵی ١٩٨٤ی زایینی پێوەندییەکانی لەگەڵ ڕێژیمی کۆماری ئیسلامیی ئێران بەهێز کرد و لە کۆنگرەی سێهەمدا ئەو پێوەندییەی وەکوو ستراتیژی خۆی ناساند. لەو پێوەندییەدا ئۆجالان لە کتێبی «٧ ڕۆژ لەگەڵ ئاپۆ»دا کە بە عەرەبی چاپ کراوە، سەبارەت بەو ئامانجە ستراتیژیکە دەڵێ:

«ئەو کوردانەی کە لە مانای نیشتمانپەروەری و سیاسەت ناگەن «کەڕ و بێ میشک و کوێرن»، ئەگەر بۆ دوژمن لە سەر ئامانجە ستراتیژییەکان تەنازولت کرد، ئەوە شێت و خائینی.. ئەو چوار دەوڵەتە کە کوردستانیان داگیر کردووە، هەموویان دوژمنمان نین، بۆیە نابی بە چاوێک سەیری هەموویان بکەین».

هەر لە بەر تیشکی ئەم ستراتیژییەدا ئۆجالان لە پەیامێکدا کە بۆ کۆڕێکی تایبەت لە ٢ی ڕێبەندانی ١٩٩٦ لەباری ٥٠هەمین ساڵی دامەزراندنی کۆماری کوردستان پێک هاتبوو، بە تەلەفۆن بەشداریی کرد و ڕایگەیاند: «بە تەجرەبەی ئێمە کۆماری ئیسلامیی ئێران وەک ڕێژیمی شای ئێران نیە و مرۆڤ باش هەست بە جیاوازی دەکات، حیزبی دێموکرات ماوەیەکی درێژ دژی شای ئێران شەڕی کرد، شەهیدی دا، گەلێک لە ئەندامانی زیندانی کران، ئەوانە شەهیدی دێموکراسی، تەنانەت شەهیدی ولاتپارێزی ئێرانن».

لە درێژەی ئەم پەیامەدا وتی:

«میللەتی کورد میللەتێکی ئێرانییە، لە زمان و کولتووردا برای یەکدی بوون. ئیمە نامانەوێ کورد بە دژی کۆماری ئیسلامی ڕاوەستێ. هەر لەو کاتەشدا لە کۆماری ئیسلامیمان دەوێ نەک تەنیا

بۆ کوردی رۆژهەلات، بەڵکوو بۆ هەموو کوردان سیاسەت دارێژێ، ئێمە هەردوو موحتاجی یەکترین».

لە درێژەی ئەم سیاسەتە ئیستراتژییەدا کاتێک لە ٣ی رەشەمەی ٧٧ خەڵکی شاری سنە بە ئیعتراز بە گیرانی ئۆجالان کەوتنە رێپێوان و لە رەوتی رێپێوانەکەدا دروشمی دژی رێژیمیان بەرز کردەوە، pkk ئەو خەڵکەی بە داردەستی سەهیوونیزم و ئیمپریالیزم ناو برد، ئەم بەیاننامەی pkk لە رۆژی ١٣٧٧/١٢/٦ی هەتاوی بڵاو کرایەوە کە لەم پێوەندییەدا لە بەیاننامەی هاوبەشی حیزبی دێموکرات و کۆمەڵەدا ئەم وتانەی pkk مەحکووم کران.

دوایین شاکاری pkk کە هەر پێوەندیی بە ستراتژیی و سیاسەتی pkk لەگەڵ کۆماری ئیسلامی هەیە لەم دواییانەدا بوو کە:

رۆژی ١٣٩٤/٣/٣ی هەتاوی تیمێک لە پێشمەرگەکانی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران کە بۆ پێوەندیگرتن بە خەڵکی رۆژهەلاتی کوردستانەوە چووبوونەوە کوێستانەکانی کێلەشین، بەو بیانووەوە کە ئەم ناوچەیە لە ژێر دەسەلاتی ئەواندایە (هەرێمی میدیا) بۆ کەس نیە لەو ناوچەیەدا هاتوچۆ بکات، گەمارۆی پێشمەرگەکانی حیزبیان دا کە پێشمەرگەکان دەسبەجێ بەرپرسەکانیان لە دۆخەکە کە بۆیان پێش هاتووە ئاگادار کردەوە، دەفتەری سیاسیی حیزب لە رێگای پێوەندییەکان، دۆستانی هەر دوو لا و تەنانەت دۆستانی pkkوە هەوڵی دا کە کێشەکە چارەسەر بکرێ، بەڵام قسەیان هەر ئەوە بوو. دەفتەری سیاسی لە نامەیەکدا کە ناوەرۆکەکەی لە خوارەوە هاتووە، داوای کرد بە دانوستان کێشەکە چارەسەر بکرێ و لە کۆتاییدا pkk سەرلە بەیانیی رۆژی ٣ی جۆزەردانی ١٣٩٤ هێرشی کردە سەر ئەو تیمە پێشمەرگەیەی حیزب و پێشمەرگەیەکی حیزب بە ناوی «قادر کەریمی» شەهید و ٣ پێشمەرگەی دیکەش بریندار بوون. ئەمە تاوانێکی گەورە بوو کە لە لایەن هەموو حیزبەکانی کوردستان

و بەتایبەتی حیزبەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵاتەوە مەحکووم کرا.
pkk لـە تـەواوی ئـەو ماوەیـەدا کـە هەوڵـەکان لە ئـارادا بوون، ڕایاندەگەیاند ئەوان لە ژێر گوشـاری کۆماری ئیسلامیدان و ناتوانن ڕێگا بدەن کەس بەو سـنوورەدا هاتوچۆ بکات و بەم چەشـنە pkkی ڕزگاریدەری وڵات و نەتەوە بوو بە سنوورپارێزی وڵاتی داگیرکەر. بەڵام پاش چەندین دانیشـتن و بە نێوبژیوانیی هەرێمی کوردسـتان لە دەسـتپێکی وتووێژەکاندا و پاش چەند دانیشتنێکی دووقۆڵی، ئەو گرژی و ئاڵۆزییە کە بە هۆی سیاسەتی هەڵەی پەکەکەوە پێک هاتبوو، کۆتایی پێ هات و پێوەندییەکانی نێوان دوو لایەن بەرەو ئاساییبوون ڕۆیشـت و تا نووسـینی ئەم دێڕانە بەشـێک لە هێزی پێشمەرگەی حیزبی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران لە شاخەکانی سنوورییەکانی نێوان ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان جێگیر کراوە.
دەقـی نامەکـەی دەفتەری سیاسـیی حیزب کە لە سـەرەتای ئەو گـرژی و ئاڵۆزییانەدا بۆ سـەرکردایەتیی پەکەکە نووسـرابوو، بەم چەشنە بوو:

بـۆ بەڕێـز/ کۆنسـەی سـەرۆکایەتیی کۆمـا جڤاکێـن کوردستان

لەگەڵ سڵاو!

ئـاگادار کرایـن کـە داواتـان کـردووە هاوڕێیانـی ئێمە لە شوێنەکانی مانەوەی ئیستایان دابەزن.

ئـەو داوایە ئەگـەر بە مەبەسـتی کشـانەوە و گەڕانەوەی هاوڕێیانمان و پێشگرتن بە خەبات لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتە، ئاشـکرایە کە حیزبـی دێموکراتی کوردسـتانی ئێران ناتوانێ ئەو جۆرە گوشـارانە قبوولاً بکا. بەڵام ئەگەر لە چوارچێوەی پێوەندیـی دۆسـتانەماندا تێبینییەکتـان هەبـێ دەکـرێ بـە دانیشتن و لێک تێگەیشتن ڕێگایەک بۆ چارەسەری مەسەلەکە

بدۆزینەوە.

ئێمــە هەر لە رۆژی یەکەمی ئــەم وەزعەوە لە چەند کانالّی راســتەوخۆ و ناڕاســتەوخۆوە داوای دیدار و چاوپێکەوتن و چارەسەری مەسەلەکەمان کردووە کە بە داخەوە یا وەلاّمێک نەبــووە یا ئەگــەر بە دەگمەن وەلاّمێکیش بووبێ « نا» بووە، ئەویــش بــە ئۆلتیماتــۆم و هەڕەشــەوە کــە ئــەوە دوورە لە پێوەندیی سیاسی نێوانمان.

ئێمــە دلّنیاتان دەکەین کە لە لایەن ئێمــەوە هیچ هۆیەک بۆ گــرژی و ئالّــۆزی لە نێوانمانــدا نیە و هیواداریشــین ئێوەش هــەروا بیر بکەنەوە و هەنگاو بەرەو کردەوەیەک نەنێن کە لە بەرژەوەندیی هیچ لایەکمان و بزووتنەوەی کورد بە گشــتیدا نەبــێ و ئێمەش ناچار نەبین لەو پێوەندییەدا راســتییەکان بۆ بیروڕای گشتی روون بکەینەوە.

حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

دەفتەری سیاسی

٢٠١٥/٥/٢٢ی زایینی

١٣٩٤/٣/١ی هەتاوی

# سەرچاوەکان


١. رۆژنامە ی «کوردســتان» ئۆرگانی کومیتەی ناوەندیی حیزبی دێموکراتی کوردستانی ئێران

٢. راپۆرتی کۆنگرەکان

٣. تلاش در راه تفاهم، ناصر، چاپی یەکەم ١٣٦٠، چاپەمەنی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.

٤. نووسین و وتارەکانی دوکتور قاسملوو

٥. ئورووپاییەک لە وڵاتانی کوردان، نووســینی نەسرین قاسملوو، چاپی یەکەم ٢٠١٤، چاپخانەی سەردەم.

٦. اســناد میکونــوس، پرویز دســتمالچی، چاپی یەکەم، شــهریور ١٣٧٦، برلین.

٧. ئەزموونی خەبات، هەیاس کاردۆ، چاپی یەکەم ٢٠١١، چاپخانەی

ڕۆژهەڵات، هەولێر.
٨. چل ساڵ خەبات، دوکتور عەبدولڕەحمان قاسملوو، چاپی دووەم، ١٣٧٦/١٩٨٨
٩. ٢٢ روز حماسه و ایپار در سنندج، پاسدار مجید نداف، چاپی یەکەم ١٣٨٩، چاپ انتشارات دانشگاهی جامع امام حسین.
١٠. جنگ خونین در سنندج، چریکە فیداییەکانی گەلی ئێران، چاپی یەکەم ١٣٦١، بڵاوکراوەی چریکە فیداییەکانی گەلی ئێران.
١١. کۆکراوەکانی بیهزاد خۆشحاڵی
١٢. نامیلکەی «جنگ در کردستان»
١٣. چشم انداز ایران (ویژه کردستان)، نشریه سیاسی راهبری، پاییز ١٣٨٤